ناوی کتێب: حەکایەت و هەدایەت
ناوەڕۆک: فیلمنامەی حەکایەتی کۆنی کوردی
نووسینی: عەباسی کەمەندی
گردوکۆ و پێشەکی: بەرهەم عەلی
تایپ و هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری
نەخشەسازی: ئاراس ئەکرەم
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٩
لەچاپدانی:چاپخانەی کارۆ- سلێمانی
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (٤٩٦)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێ دراوە.

## بەڕێز کاك بەرهەم عەلی خۆشەویست

ڕێز و سڵاوم بۆ خۆت و بنەماڵەی بەڕێزت وە هیوادارم لە سەلامەت و سەعادەتدا بژین.

برای بەڕێزم ٤٢ حەکایەتی کۆنی کوردیم کە هەر لەمێژەوە کۆ کردووەتەوە، وە هەر بە کوردی نووسیومە، بۆت دەنێرم. قاڵبی نووسینەکەی من فیلمنامەیە، جا ئەگەر پێت خۆش بوو خۆت قاڵبی دیکەی بۆ بەدی بێنە و جارێکی تر پیا بێرەوە.

گەنجینەیەکی بەقیمەتە کە تاکو ئێستا ناشێ لەنێو خەڵکدا مابێ.

**بەهیوای دیدار، عەباسی کەمەندی**

## سەرنج

- بابەتەکانی نێو ئەم کتێبە، بە دەستنووسێکی تایبەتی هونەرمەند و رۆشنبیری مەزن (عەباسی کەمەندی) پێشکەش بە رۆژنامەوان (بەرهەم عەلی) کراوە و ئازادی کردووە لەوەی چۆن و بە چ شێوەیەک چاپیان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوای کۆچی دوایی، رەزامەندیی ماڵباتی کەمەندی بۆ چاپکردنی وەرگیراوە.
- هیچ کەس و دەزگا و خانەیەکی چاپەمەنی، بۆی نییە بێ ئاگاداریی ماڵباتی کەمەندی و رۆژنامەوان بەرهەم عەلی، ئەم کتێبە چاپ بکاتەوە یان بە ئۆنلاین بڵاوی بکاتەوە.
- بەکارهێنانی ئەم سیناریۆیانە، بۆ فیلم و دراما، بێ ئاگاداریی ئەو دوو لایەنەی ناویان هێنراوە، مافیان پێ دەدات پەنا بۆ سکاڵای یاسایی بەرن.

# پێشەکی

لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا کە بەش بەحاڵی خۆم وەک گەوهەرێکی زۆر بەهاداری کەلەپوور و کولتوور و مێژوو و زمانی وڵاتی کوردەواری دەیبینم، هەرچییەک بنووسم ناگاتە ئەوەی ئەگەر رۆشنبیر و هونەرمەندی مەزن عەباسی کەمەندی خۆی لە ژیاندا بوایە و پێشەکییەکی بۆ ئەم کارە ناوازەیەی بنووسییایە، بەڵام لەبەرئەوەی خودی رەوانشاد کەمەندی بەر لە کۆچی دوایی بە نامەیەکی دەستنووس ئەم ئەرکە قورس و گەورەیەی خستە سەر شانم، ناچارم شتێ بنووسم، ئەمما دەبێ بەر لە کتێبەکە جورئەت بە خۆم بدەم و کەمێک باسی نووسەری ئەم کتێبە بکەم کە عەباسی کەمەندییە.

بریا وا نەبوایە، خۆزگە کەمەندیی مەزن خۆی لە ژیاندا بوایە و ئەم کتێبەی بە چاپکراوی ببینیایە، بەڵام کورد گوتەنی "لە ئاست مردندا هەموان بێ دەسەڵاتین"، ئەگەرچی وشەی (مەرگ) یان (مردن) حەیفە بۆ مرۆڤێکی مەزن و توانا نائاسایی وەک عەباسی کەمەندی بەکار بهێنرێ، چونکە تا لە ژیاندا بوو هێندە شاکاری هونەری و ئەدەبیی بۆ خولقاندین، کە زۆر ئاستەمە مەرگ بتوانێ لە زەین و یادوەر و تەنانەت ژیانی ئایندەشماندا بیانسڕێتەوە.

من نازانم بۆ یەکەمین جار چ رۆژنامەوانێک یاخۆ چ میدیایەک ناسناوی (مامۆستای حەوت هونەر)ی دایە پاڵ عەباسی کەمەندی،

بەڵام من پاش ئەوەی کەمەندییم لە نزیکەوە ناسی و بە زۆر لە کارەکانی ئاشنا بووم، ئەو راستییەم بۆ دەرکەوت کە بوێژی ئەو ناسناوە نەک هەر زێدەڕۆیی نەکردووە، بەڵکوو هێشتا کەمی گوتووە و ئەو بوارانەی کەمەندی کارایانە کاری تێدا کردوون لە حەوت زیاترن.

کەمەندی کادیرێکی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنیی تا بڵێی بەئەزموون بوو، جگە لە کاری رۆژانەی رۆژنامەوانی، سەدان چیرۆکی رادیۆیی نووسیون و زۆربەی جاران هەر خۆی وەک بێژەریش پێشکەشی کردوون.

کەمەندی شاعیرێکی بەتوانایە و ئەگەر مرۆڤ دیوانی (هەوارگەی هاوار) بخوێنێتەوە کە ماوەیەک بەر لە مەرگی چاپ کرا، یان لەو تێکستە شیعرییانە ورد بێتەوە کە بە درێژایی ساڵانی ژیانی بۆ گۆرانییەکانی خۆی و چەندین گۆرانیبێژی دیکەی نووسیون، ئەودەم لە جوانی و باڵایی شیعرەکانی کەمەندی تێ دەگات، ئەمەیان شیعری کوردی، بەڵام ئەو دیوانێکی گەورەی شیعری بە زمانی فارسییش هەیە.

کەمەندی لە ئاستێکی زۆر بەرزدا، کاری دۆبلاژیشی بۆ تەلەڤزیۆنەکانی ئێران کردووە و لە یەک کاردا بە چەندین شێواز و نەبرە، دەنگی خۆی گۆڕیوە.

جیا لەمانە، عەباسی کەمەندی هەر بە دەستی خۆی بووکەڵە و قەرەقۆزی دروست کردوون و وەک چیرۆکی منداڵان هەر بە دەنگی خۆی چەندین ئەڵقەی بۆ تەلەڤزیۆنەکان تۆمار کردووە، کە هەندێ لەو بووکەڵانە بەرجەستەکردنی کەسایەتی و پاڵەوانەکانی مێژووی وڵاتی کوردەوارییین و ئەگەر کەمەندی نەبوایە، ئێستا هەر کەس ناویشی نەدەهێنان.

کەمەندی چەند کتێبێکی مێژووییشی هەیە کە هەندێکیان چاپ نەکراون، لەبارەی مێژووی سنە و گەڕەکەکانی ئەو شارە گرنگەی رۆژهەڵاتی کوردستان و هەروەها چەندین کەسایەتیی ونی مێژووی کوردستان و چەند لایەنێکی تر.

کەمەندی کتێبی هەیە لەبارەی مێژووی ئایینی زەردەشتی و تا لە ژیاندا بوو چاپ نەکرابوو، جا نازانم ئێستاکێ چاپ کراوە یان نا.

عەباسی کەمەندی هەژدە ساڵی تەواو بۆ بەشی (فەرهەنگی میللی)ی تەلەڤزیۆنی تاران کاری کرد، بەڵام چ کارێک؟ گەڕانێکی دەروێشانەی بەردەوام لە گوندەکانی کوردستانی رۆژهەڵات بۆ کۆکردنەوەی شیعر و بەستە و نەریت و سەربردە و حیکایەتە کۆن و جەژن و بۆنە و سەرهاتە کەلەپووری و فۆلکلۆرییەکان، خۆی لە دیمانەیەکدا بە منی گوت: "ئەگەر کۆ بکرێنەوە نزیکەی شەش هەزار لاپەڕەی (موسەوەدر)م ئامادە کردووە".

لە لایەکی ترەوە، عەباسی کەمەندی زستانان بەتەواوی خۆی بۆ هونەری نیگارکێشی تەرخان دەکرد، دەیان تابلۆی جوان و رەنگینی کوردەوارییانەی دروست کردووە و چەند جارێکیش پێشانگەی بۆ کردوونەتەوە.

وەرزی بەهاران ئیدی کەمەندی کاری لە دروستکردنی گۆرانییەکانیدا دەکرد، دەزانم زۆربەتان سەرسامن بەو گۆرانییانەی کە زۆرینەیان هەم ئاواز و هەم شیعر و هەم چرینیان لەلایەن خۆیەوە بوون، بۆیە زۆر لەسەر ئەم بوارەیان ناڕۆم.

کەمەندی سەرباری هەموو ئەم کارانە، سیناریۆی درامای بۆ کۆمەڵێ چیرۆک و حیکایەتی وڵاتی کوردەواری نووسیوە کە خۆی پێیان دەڵێ

(فیلمنامــە)، هەندێکیــان کراونەتــە کاری ســینەمایی و هەندێکیشــان بــۆ تەلەڤزیـۆن ئەنجـام دراون و کۆمەڵێکیشـیان لـە رادیـۆ بەنـاوی (حەکایـەت و هەدایـەت) پێشکەشـی کـردوون، برێکیشـیان هــەر لـە قاڵبـی نووسـیندا ماونەتــەوە.

خـۆ ئێسـتا زانیتـان بۆچـی ناسـناوی (مامۆسـتای حـەوت هونەر) هێشـتا کەمـە بـۆ عەباسـی کەمەندی!

## ئەم کتێبە

ناوەڕۆکـی ئــەم کتێبــە بریتییــە لــە ٣٦ دانــە ســیناریۆ یــان فیلمنامــەی حیکایەتــی کۆنــی وڵاتــی کــوردەواری و عەباســی کەمەنــدی لــە زۆربــەی ناوچـە جیاجیاکانـی کوردسـتانی رۆژهـەڵات بـە درێژایـی سـاڵانێکی زۆری تەمەنــی کـۆی کردوونەتــەوە و لــە قاڵبــی ســیناریۆدا هەندێکیــان درێــژ و هەندێکیــان کــورت، دایڕشــتوونەتەوە و دەرهێنــەری زیــرەک و بەتوانــا دەتوانــێ زۆر بەئاســانی شــاکاری دراماییــان لــێ دروســت بــکات.

بۆچـی و چـۆن ئـەم فیلمنامانـەی عەباسـی کەمەنـدی گەیشـتنە دەسـتی مـن و بۆچـی ئێسـتا لـەم کتێبـەدا بـە چاپـم گەیانـد و کـێ ئـەم مافـەی بـە مـن دا؟

پرسیارگەلێکن دەبێ وەڵامەکانیان لەم پێشەکییەدا بنووسم...

نزیکـەی دوو سـاڵ بـەر لـە کۆچـی دوایـی، پـاش ئـەوەی دیمانەیەکـی رۆژنامەوانیـی دوور و درێـژم بـۆ هەفتەنامـەی (بـاس) لەگـەڵ مامۆسـتا کەمەنـدی ئەنجـام دا، داوام لـێ کـرد لـەوە بـەدواوە گۆشـەیەکی هەفتانـە لـە هەفتەنامـەی (بـاس) بنووسـێت کـە مـن سەرنووسـەری بـووم، ئـەودەم

بەڵێنـی دا و پـاش ماوەیـەک لەڕێـی هـاوکارم عەزیـز مورادی کـە پەیامنێری هەفتەنامەکـە بـوو لـە دیـوی ڕۆژهـەڵات، بەڵێنەکـەی بەجـێ هێنـا، سـێ تابلـۆی دەسـتکردی خـۆی لەگـەڵ دوو دیوانـی شـیعریی خـۆی یەکێکیـان بـە زمانـی کـوردی و ئـەوی دی بـە زمانـی فارسـی بەدیـاری بـۆ نـاردم کـە ئـەودەم هێشـتا چـاپ نەکرابـوون، هـاوکات لەنێـو لیڤێکسـێکدا ئـەم ٣٦ فیلمنامەیـەی بـە دەستنووسـی خـۆی بـۆ نـاردم و هـەر بـە نامەیەکـی تایبـەت کـە لـە بەرگـی پشـتەوەی ئەم کتێبـەدا بـڵاوم کردووەتـووە، ئازادی کـردووم لـەوەی چـۆن و بـە چ شـێوەیەک بـەلای منـەوە بـاش بێـت بـۆی بـڵاو بکەمـەوە.

ئـەو لـە نامـە تایبەتەکەیـدا نووسـیویاتی ٤٢ حیکایەتـە، بـەڵام لـە ڕاستیدا ئـەوەی بـۆ منـی ناردبـوو تەنیـا ٣٦ حیکایـەت بـوون، بۆیـە هـەر ئـەوکات لەڕێـی تەلەفۆنـەوە پەیوەندییـم پێـوە کـرد و گوتـم مامۆسـتا تەنیا ٣٦ حیکایەتـت بـۆ مـن نـاردووە، عوزرخوایـی هێنایـەوە و گوتـی دیـارە مـن هەڵـە بـووم لـە ژماردنیانـدا.

بـە هەرحـاڵ پـاش ماوەیـەک هـاوکارم فەرهـاد ئەکبەری کە شـارەزاییەکی باشـی لـەو شـێوە نووسـین و زوانـەدا هەیـە، زۆر بـە ئەمانەتـەوە دانـە دانـە تایپـی کـردن و هەفتانـە یـان دوو هەفتـە جارێـک لـە هەفتەنامـەی (بـاس) هەندێکیانـم بـڵاو کردنـەوە، لـێ مەخابـن کۆچـی دوایـی عەباسـی کەمەنـدی تووشـی شـۆکی کـردم و ئیـدی لـەوە بـەدوا درەنـگ درەنـگ حیکایەتەکانیـم بـڵاو دەکـردەوە تـا هەمیشـە نـاوی کەمەنـدی لـە (بـاس)دا هەبێـت.

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتتان ئـەو ٣٦ فیلمنامەیـەی حیکایەتـە کۆنەکانـی وڵاتـی کوردەوارییـن، کـە مـن بـە شـانازییەکی زۆرەوە، لەبـری عەباسـی کەمەنـدی و بـە ڕەزامەندیـی ماڵباتەکـەی پێشکەشـی خوێنەرانـی ئازیـز و

هەوادارانـی هونـەر و ئەدەبـی کەمەندیـی دەکـەم.

دڵنیـام ڕۆحـی کەمەنـدی و دڵـی ماڵباتەکـەی و هەوادارانـی بـەم کارە زۆر شـاد دەبن، خوێنـەر چیژێکـی زۆر تایبـەت لـە خوێندنەوەیـان وەردەگـرێ، پسـپۆڕانی بـواری فۆلکلـۆر و کەلەپـووری کـوردەواری سـوودێکی زۆری لـێ دەبینـن. نووسـەران و ڕۆژنامەوانانیـش بـێ گومـان سەرسـام دەبـن بـەو شـێوەزمانە زۆر تایبـەت کەمەنـدی.

بەرهەم عەلی

# نێوەرۆك

# من دزم یان تۆ؟

**پرسۆناژ:**

**- دزی یەکەم**
**- دزی دووەم**
**- ساحێومال**

شەوە، دوو دز خۆیان ئەخەنە تاریکیی پشت دیوار ماڵەکۆنێ.

دزی یەکەم: حەتمەن بۆت روونە خاوەن ئاوا وێرانەماڵێ، شتێکی بۆ دزین هەیە؟!

دزی دووەم: ئەرێ کاکە، ئەو کابرا خۆی داوە لە نەداری، ئەڵێن زۆر دارایە!

دزی یەکەم: خوا بکا وا بێ! بەڵام من چاوم ئاو ناخواتەوە، ساحێبی ئاوا ماڵێ، ساحێبی شت بێ!

دزی دووەم: تۆ ئێستا بڕۆ ماڵەکەوە جا ئەبینی وایە یان وا نییە.

دزی یەکەم: تۆ نایەی؟!

دزی دووەم: نا پێویست ناکا مەگەر ئەوەی شتێکی قورست دەسکەوێ! من لێرا حەراسەتی تۆ ئەکەم، جا ئەگەر بارێکی قورست لێ کەوت، پێم بڵێ من دێمە یاریتەوە.

دزی یەکەم: باشە.

دز لە دیوار ئەچێتە بان، خۆی ئەخاتە نێو حەوشەوە، ئەچێ بەرەو دەرگای حەوش بیکاتەوە، ئەبینێ دەرگا کراوەیە.

ئەختێ ئەچێتە فکرەوە و ئەچێ بەرەو نێوماڵ. کابرای ساحێوماڵ لێفە کۆنەیەکی داوە بە خۆیا و لۆیەکی خستووەتە ژێری و دەستی لەباتی سەرین ناوەتە ژێر سەر.

دزەکـە دێتـە ماڵـەوە و لەنێـو تاریکیـدا بـە شـوێن شـتدا ئەگـەڕێ، هیچـی دەسـت ناکـەوێ.

کابرای خاوەن ماڵ لێفەکە لەسەر خۆی لا ئەبا.

ساحێوماڵ: ببـوورە باوکـی باوکـم، ئـەوەی تـۆ لـە تاریکەشـەودا بـۆی ئەگەڕێـی، مـن خـۆم بـە ڕۆژی ڕۆشـن شـوێنی گـەڕاوم، نییـە!

دزەکـە هێواشـی ئەچێتـە دەرەوە و کابـرا لێفەکـە بەسـەر خۆیـا ئەکێشـێتەوە.

## (دەرەوە)

دزی دووەم: ها چیت کرد؟

دزی یەکەم: لە گیرفانی من و تۆ چۆڵترە کاکە! چی بکەم؟

دزی یەکـەم: کـورە کاکـە وا نییـە! بـاش تاقەکانـی نەگـەڕاوی، بـاش دەوروبـەری کابـرات تماشـا نەکـردووە!

دزی یەکـەم: ئەگەرچـی تاریکـە و چـاو چـاو نابینـێ، بـەڵام بۆنـی چۆڵایـی هەمـوو جێگایەکـی گرتـووە، بـاوەڕ بـە مـن ناکـەی، دەرگاکـە کراوەیـە، خـۆت بـڕۆ بزانـە چیـت دەسـت ئەکـەوێ!

دزی دووەم: باشە خۆم ئەڕۆم و ئەبینی وا نییە!

دزی یەکەم: فەرموو بڕۆ.

دزی دووەم: شەمەد (جامان)ەکەت بە وە من.

دزی یەکە م: ئەمە شەمەد.

دزی یەکـەم شـەمەدەکەی لـە دەور کەمـەر ئەکاتـەوە و ئەیـدا بـە دزی دووەم، ئەویـش شـەمەد ئەداتـە بـن باڵـی و لـە دەرگاوە ئەچێتـە ماڵـەوە،

هەر ئەچێتە نێو ماڵ شەمەدەکەی چوار گۆش لەنێو ماڵەکا دادەخا کە شتی تێ بنێ.

خۆی دەست ئەکێشێ بەنێو تاقەکانا و تاق بە تاق ئەگەڕێ. کابرای ساحێوماڵ هێواشی دەست ئەبا و شەمەدە راخراوەکە ئەکێشێ بۆ ناو جێگەکەی خۆی و لەژێر لێفەکەدا ئەیشارێتەوە.

کابرای دز هەر چی ئەگەڕێ هیچی دەست ناکەوێ، بەناچار دەست ئەکوتێ بۆ شەمەدەی خۆی، ئەبینێ شەمەدەکەی نەماوە! دەست ئەکوتێ بۆ ناو جێگەی کابرای ساحێوماڵ، ساحێوماڵ ئەیکا بە قیرە و هاوار.

ساحێوماڵ: های دز! های دز! ئەی هاوار حەڵکی بەفریام بگەن غارەت کرام! دار و نەدارم دز بردی! های دز! های دز!

کابرای دز سەری لێ ئەشێوێ، بەناچار دەردەچێتە دەرەوە. ساحێوماڵ هەر هاواری "های دز! های دز!" ئەکا.

دزەکە بەتووڕەیی ئەگەڕێتەوە بەرەو کابرا و ئەڵێ:

دزی یەکەم: کورە لە بەین من و تۆدا نەعلەت لە باوک درۆزن! من دزم یان تۆ؟!

ئەمە ئەڵێ و بۆی دەردەچێ.

# ئەوەڵ حەرەکەت
# جاکو بەرەکەت

**پرسۆناژ:**

**- جابر، بیست ساڵە**

**- باوکی جابر**

**- خاڵۆی جابر، مامناوەندی**

**- باوکی پیر**

**- کچی جەوان**

**- کابرای مسگەر**

**- کابرای نەمەدماڵ (لبادکەر، لەبۆچی)**

**- چەند راگوزەر**

## (ڕۆژ.. نێومالێکی فەقیرانە)

جابـر نووسـتوە و سـەرینێکی ناوەتـە ژێـر سـەر و سـەرینێکی ناوەتـە بـان گوێـی.

دایکی بە سەرلەقان دێتە بان سەری.

دایـک: ڕۆڵـە جابـر دوانیوەڕۆیـە، تـۆ خـۆت وتـت بەیانـی زوو هەڵئەسـتی! ڕۆڵـە مەحـز ڕەزای خـودا ئەمـە ژیـان نییـە تـۆ ئەیکـەی!

جابـر: (تـووڕە) تـۆ بـۆ دەسـت لەسـەر مـن هەڵناگری دایـە؟! ئاخـۆ چیـت لـە گیانـی مـن ئـەوێ؟!

دایـک: چیـم ئـەوێ ڕۆڵـە؟ ئەڵێـم خەوتـن بەسـە، دوانیوەڕۆیـە، هەسـتە!

جابر: هەستم چی بکەم؟ خەوتنی من چ زیانێکی لە تۆ داوە؟!

دایک: ڕۆڵە بەوەلا وتوویانە شەو و خەو، ڕۆژ بۆ خەوتن نییە!

جابـر: دە باشـە ئـەوە مـن هەسـتام چـی بکـەم؟ دوای ئەمـە چ شـەو بـێ! چ ڕۆژ، بـۆ مـن بێکارییـە، هەسـتم چـی بکـەم؟!

دایـک: بـە خەوتـن چـی دەکـەی کـوڕم؟! وەڵا بیـلا، تـەڵا، بـای بەیانـی لـە گۆنـات نـەدا، غیرەتـی پیاوەتـی پەیـدا ناکـەی! بـۆ حاڵـی نابـی؟ خـودا ئەڵـێ لـە تـۆ حەرەکـەت، لـە مـن بەرەکـەت! خـەو بەرەکەتـی تێـدا نییـە!

جابـر بەتوورەیـی هەڵئەسـتێ و دەسـت ئـەکا بـە هەڵپەڕکـێ لەنێـو ماڵەکا.

جابـر: هـا دایـە گیـان چـاک تەماشـام کـە، حەرەکەتەکـەم بـێ عەیـب بـێ، چاکـە؟ چاکـە؟ (ئەوەسـتێ) ئەمەیـش حەرەکـەت جـا ئێسـتا نۆبەتـی تۆیـە بەرەکەتەکەیـم پـێ نیشـان دەی! کوانـێ بەرەکەتەکـەی؟ هـا کـوێ؟ لـە کوێیـە ئـەو بەرەکەتـەی خـودا فەرموویەتـی؟!

دایک: بخـەوە رۆڵـە، بخـەوە، گەرەکم نییـە! بخـەوە لـە خـوام تەڵەبـە، خـەوی ئاخـرت بێـت و هەتاهەتایـە هـەر لـە خـەودا بـی! بخـەوە!

جابر دیسانەوە ئەخەوێ

دایـک: بـە دنیـا هاتنـت هەڵـە بـوو، رۆڵـە خۆزگـە لەجیاتـی تـۆ، ئـەو شـەوە مارێکـم بـە دنیـا باوردایـێ و بیدایـێ پێمـەوە، بـەو شـەرتە تـۆم نەبوایـا! ئـای چـی لێـم کـرد! ئـای چەنـد جـار هەڕەشـەی ژنـی کـوڕزای لێـم کـرد! ئـای چەنـێ پـارەم نایـە مشـت حەسـاوگیر و دوعانـووس دەواودەرمـان فـرۆش و یەخـەی شـەخس و پیـر و ئیمـام و ئیمـام زادەم گـرت کـە دوای سـێ کـچ خـوا کوڕێکـم پـێ بـدا وجـاخ باوکـت گڵپـەی تـێ کـەوێ! بـەڵام بـوو بـە دووکـەڵ و چـووە چـاو منـی رۆژڕەش و سـیاچارە! کـچ شـووی کـرد و چـووە سـەر ژیانـی خـۆی، بـەڵام تـۆ وەکـوو گۆشـتی گردەمـل، هـەر بـە مـل خۆمـەوە مـای! نـە بـە دەرد شـووکردن ئەخـۆی بودەمـە شـوو، نـە بـۆ خـۆم کار و فرمانێکـم لەدەسـت دێ! خـۆی مـرد و تـۆی بـۆ مـن بەجـێ هێشـت! «نـە بـۆ سـەیر خاسـی نـە بـۆ زەمـاوەن، ئـەی بـۆ چـە خاسـی باوەحیـز خـاوەن»؟!

لەم کاتەدا تەقە لە دەرگا ئەدرێ.

دایک: (دێتە بەردەرگا) بەڵێ کێیە ئەوە؟

برا: منم خوشکە، میوانت ناوێ؟ (دایک دەرگا ئەکاتەوە) بەخێر بێی برا، فەرموو فەرموو وەرە ژوورێ.

برا روخسارێکی رووحانیی هەیە و کتێبێ ها بە دەستیەوە، دێتە ماڵەوە.

برا: چۆنی خوشکە، باشی شوکر؟ منداڵەکانت خۆشن؟

دایک: خۆش بی برا گیان، هەموویان خۆشن شوکر.

برا: (بەدەم رێوە) جابر چی دەکا؟ کاروکاسبییەکی بۆ خۆی پەیدا کردووە یان نە؟

دایک: (دێنە ماڵەوە) بەڵێ وەڵا، چ کاروکاسبییەک خۆشتر لە خەوە؟! ئەوەتە وەکوو ژنی زەیسان لەوێ پانەوە بووە و جوابی کەس ناداتەوە!

برا: (دێتە ماڵەوە) ئەک باوکمرۆ تا ئێستا خەوتووە؟!

جابر دەنگی خاڵۆی ئەبیسێ و هەڵئەستێ.

جابر: سڵاو خاڵە گیان بەخێر بێی.

برا: خەیر بێتە رێت کاکە گیان.

دایک: باش بوو تۆ هاتی، ئەگینا هەتا تاریکان لە خەودا بوو!

برا: نە خوشکە، زۆر حەیفە عومری جەوانی بە خەو بڕوا و تەواو بێ، فرسەتی ژیان کەمە، بەڵام فرسەتی خەو هەزاران ساڵە.

جابر لەسەر چاوانە ئاو هەڵئەگوزێ و گوێی لە قسەکانی ئەوانە.

دایک: پێی ئەڵێم، خودا وتوویە لە تۆ حەرەکەت لە من بەرەکەت، هەستاوە بۆم هەڵئەپەڕێ و دوایی ئەڵێ ئەمە حەرەکەت ئەی کوا

بەرەکـەت؟ بەتەمـاس خـوا لـە کونـەوژە و بـۆی بخاتـە خـوارێ؟!

بـرا: عەڵبەتـە باشـی پرسـیوە خوشـکە! ئـەوە حەرەکـەت، دەی باشـە بەرەکەتەکـەی لـە کوێیـە؟! جابـر شـلپێ ئـاو بـە دەموچاویـەوە ئـەدا و حـەز لـە قسـەکانی خاڵـۆی ئـەکا.

بە دەم دەموچاو پاککردنەوەوە دێتە ژوور.

جابـر: رۆژێ سـەد جـار بـە مـن ئەڵـێ لـە تـۆ حەرەکـەت لـە مـن بەرەکـەت! هەسـتاوم بـەدڵ خـۆی حەرەکەتـم کـردووە، ئەڵێـم ئەمـە حەرەکـەت دەی تـۆش بـۆ جـارێ بەرەکەتەکەیـم پـێ نیشـان دە، باکـو بزانـم بـە حەقیقـەت وایـە!

خاڵـۆ: حەقـی خۆتـە رۆڵـە، بەڵـێ وەڵا ئەگـەر خـوا وای وتـووە، بەرەکەتەکەیشـی نیشـان بـدات.

دایک: باوەڕ ئەکەی تۆش چوویتە سەر دین ئەو، برا گیان؟!

خاڵـۆ: قسـەی هـەق جوابی نییە خوشـکم، بەڵام جێگـەی حەرەکەتەکەی بـە جێگـە نەبـووە! مـن بەیانـی زوو دێمـە شـوێنی لـە خـەوی خـەوەر ئەکەمـەو، لەگـەڵ خـۆم ئەیبەمـە دەرێ، هـەر ئـەو حەرەکەتـەی واکـو بـۆ تـۆی کـردووە بـۆ منیـش بیـکا، مـن بەرەکەتەکـەی پـێ نیشـان ئـەدەم، باشـە جابـر گیـان؟

جابـر: نۆکەرییـت ئەکـەم خاڵـە گیـان، ئێـوە بـۆ یـەک جـار ئـەم بەرەکەتـی دوای حەرەکەتـە کـە خـودا فەرموویەتـی بـە مـن نیشـان بـدەن، ئەگـەر دوای بـەر لـە خۆرکەوتـن مـن لـە مـاڵ نەچوومـە دەرێ، دایکـم هەقـی ئـەوەی ببـێ ناوەکـوڵ برژێنـێ بـە سـەرما.

خاڵۆ: تەواو، من بەیانی دێمە شوێنت!

جابر: باشه.

خالۆ: دەی خوشکە کچەکان چی دەکەن، دێنە سەردانت یان نە؟

دایک: کچ هانە سەر ماڵ و منداڵی خۆیان، جار بەجارێ سەردانی ئێمەش ئەکەن، بەڵام نە کوڕ و نە کچ ئەو جۆرەی کە دایک و باوک بۆ ئەوان ئەسووتێن، بۆ دایک و باوک ناسووتێن.

خالۆ: وایە قانوونی سروشت بۆ هەمووان هەر ئەمەیە!

## (شەو هەر ئەو ماڵە، دەرەوە)

شەوە، چرای نێو ماڵەکە خامۆش ئەبێ.

بەیانی وردەوردە ڕۆژ ئەبێتەوە، تەقە لە دەرگاوە هەڵئەستێ و دەنگی خالۆ بەرز ئەبێتەوە و چەند جار جابر بانگ ئەکا.

دەنگی خالۆ: جابر... جابر، جابر هەستە برا.

جابر لە ماڵ دێتە دەرێ!

خالۆ: بەیانی باش کاکە!

جابر: بەیانی باش خاڵە گیان!

خالۆ: بڕۆین.

جابر دەرگاکە پێوە دەدا و لەگەڵ خالۆی ئەکەوێتە ڕێ.

دەنگی چۆلەکە و کۆتر و مەلات لە هەموو لایەکەوە دێت.

جابر دوو سێ نەفەسی ڕاحەت ئەکێشێ.

خالۆ: چۆنە؟

جابر: زۆر خۆشە!

خاڵـۆ: بـای دەم بەیانـی بـای ڕۆح ئەفزایـە! یانـی ڕۆحـی مـردوو زینـدوو ئـەکا و دڵتەنگـی و غـەم و پـەژارە لەبەیـن ئەبـا.

جابر: وایە، بەڵام خەوەکەش خۆشە بەخودا خاڵە گیان!

خاڵـۆ: وایـە، بـەڵام گـوێ بگـرە بـۆ ئـەو هەمـوو مەلاتـە، خـۆ هیـچ کام کاروکاسبییان نییـە و ئەگـەر تـا نیـوەڕۆش بخـەون، کـەس عەیبیـان نـاکا و ئەتوانـن بخـەون! بـەڵام ئـەو کارە ناکـەن. ئەبینـی و ئەبیسـی! ئەوانیـش لەزەتـی خـەو ئەناسـن، بـەڵام ئەزانـن شـەو بـۆ خـەوە و ڕۆژ بـۆ ڕۆزی بەدەسـتهێنان، بـە وەختـی خـۆی ئەخـەون بـە وەختـی خـۆی هەڵدەسـتن!

تـۆ ئێسـتاش ئەگـەر سـەر کەیتـە نـاو گـەوڕ و تەویلـەوە، هیـچ ئاژەڵـێ بـە چـاوی بەسـراو نابینـی، چـون ئەزانـێ ڕۆژەوە بـووە و ئـەو ئەبـێ بێدار بێ. لەنێـو تـەواو مەخلووقاتـی خوداوەنـدا، بـە تەنیـا ئینسـانە کـە خـۆی سـەری لـە خـۆی شـێواندووە و شـەو و ڕۆژی لـە خـۆی ون کـردووە!

ئەچنە سەر ڕاگوزارێ. خەڵک لە هاتوچۆدان.

خاڵـۆ: ئێـرە باشـە، جـا ڕاوێسـتە هـەر لێـرەدا، ئـەو حەرەکەتـەی دوێنـی بـۆ دایکتـت کـرد، بـۆ منیشـی بکـە، بـەڵام تـا بەرەکەتەکەیـت نـەدی دەسـتهەڵگیر مەبـە، بـاش؟

جابر: ئاخر چۆن ئەبێ، خەڵک ناڵێن شێت بووە؟!

خاڵـۆ: خەڵـک هـەر فکـر و خەیاڵـێ کـە هەیانـە بـۆ خۆیانـە و تـۆ مەچـووە فکـر ئەوانـەوە، قـەراری مـن و تـۆ ئـەوە بـوو، تـۆ حەرەکـەت بکـەی و منیـش بەرەکەتـی خـودات پـێ نیشـان دەم، وا نییـە؟

جابـر: بەڵــێ وەڵا، بــەڵام لــەڕووم هەڵنايــێ خاڵــە گيـان ئيزنـم بـدە سـەروچاوم بــە كەواكــەی خــۆم داپۆشــم، بــا كــەس نەمناســێ!

خاڵۆ: بۆ؟! دزی ئەكەی با كەس نەوناسێ؟

جابر: قەيدی نييە خاڵـە گيـان! جـا ئەگـەر بەرەكەتـم دی هـەر جـۆر بڵێـی، وای لـێ ئەكـەم.

خاڵۆ: باشە وا بكە.

جابـر بـۆق مـل كەواكـەی ئەخاتـە سـەر دەموچـاوی و دەسـت ئـەكا بـە هەڵپەڕيـن! خەڵكەكـە وا لـە هاتوچـۆدان بـۆ تماشـای جابـر ئەوێسـتن و وردە وردە لـە حەيـرەت دەردێـن و پـێ ئەكەنـن.

پياوێكـی پيـر لەگـەڵ كچێكـی گەنـج ئەوێسـتن، كچەكـە زۆر عاجـزە، جابـر حەرەكاتێكـی پێكەنينـدار بـە خۆيـەوە پيشـان ئـەدا.

كابرايـەک مامناوەنـدی بـێ ئـەوەی بكەنـێ، ئەوێسـتێ و تماشـای جابـر ئــەكا، وردە وردە كچەكــە دەســت بــە پێكەنيــن ئــەكا و باوكەكــەی زۆر خۆشـحاڵ ئەبــێ!

كابرايەكــی ديكــە دێــت، ئەويــش بــێ پێكەنيــن ئەوێســتێ و تماشــای حەرەكاتــی جابــر ئــەكا.

جابر: چی بكەم خاڵە، تەواوی نەكەم؟

حاڵۆ: نە جارێ، بەردەوام بە!

كچەكــە ئەوەنــدە ئەكەنــێ مانــدوو ئەبــێ و بــاوەش بــە باوكيــا ئــەكا. باوكـی كچەكـە كيسـەيەكی پـڕ لـە سـكە لـە پـەڕ شـاڵەكەی دەردێنــێ و ئەيـدا بـە دەسـت جابـرەوە.

جابر: (بەدەم هەڵپەڕكێيەوە) ئەمە چييە؟

کابـرا: ئـەوە ئەنجامـی ئـەم حەرەکەتـەی تۆیـە رۆڵـە، مـن نازانـم چیـت و کێیـت، بـەڵام ئەزانـم لاو و جەوانـی، یـەک ساڵە ئـەم کچـەم تووشـی پـەژارە و غەمـی مەرگـی دایکـی بـووە و پێکەنینـی لەبیـر چووبـوو! ئەمـڕۆ بوویتـە باعیـس بەربوونـی پێکەنینـی ئـەو کچـەم، لـە خـوام تەڵەبـە ئەجـری قیامەتیشـی بـۆت بنووسـێ.

پیـاو لەگـەڵ کچەکـەی ئـەڕۆن، هەڵپەڕیـن ئەبڕێتـەوە، هەمـوو ئـەڕۆن، بـەڵام ئـەو دوو پیـاوە ئەوێسـتن، جابـر کەواکـەی ئەکاتـەوە بـەری، هـەر دوو کابـرا دێنـە بـەرەو.

پیاوی یەکەم: ئەرێ کاکە گیان تۆ کار و پیشەت چییە؟

جابر: بێ کارم.

پیـاوی یەکـەم: مـن نەمەدمـاڵ (لبادچـی)م، تـۆ لـە حەرەکەتکـردن دێـر مانـدوو ئەبـی و ئەگـەر پێـت خۆشـە کار بکـەی، دوکانـی مـن لەنێـو مەیدانـی نەمەدماڵانـە، بڵـێ، حاجـی رەمەزانـی نەمەدمـاڵ، هەمـوو ئەمناسـن.

جابر: باشە، ئەگەمە خزمەتت.

پیـاوی دووەم: منیـش دوکانـی مسـگەریم هەیـە و بـە پیـاوی زیـرەک و پـڕ حەرەکـەت وەکـوو تـۆ، نیـازم هەیـە، پێـت خـۆش بـوو، بـێ بـۆ نێـو بـازاڕ مسـگەرەکان و بڵـێ: تەقیـی مسـگەرم ئـەوێ.

جابر: سەرچاو.

هەردوو پیاو ئەچن.

خاڵـۆ: بـاش بـاش بـاش! جـا ئێسـتا پێـم بڵـێ، لـەم حەرەکەتـا بەرەکـەت خـودات بینـی یـان نـە؟!

جابـر: بەڵـێ وەڵا خاڵـە گیـان، نـە یـەک جـار، بەڵکـوو سـێ جـار

بینیم! ئەمڕۆ شوێنی یەکێ لەو کارانە ئەگرم و لە بەیانییەوە ئەچم بە شوێنی ئیش و کاری خۆما، خوایە لە تۆ مەمنوونم!

لەگەڵ خاڵۆ دەست لە مل یەک ئەچنەو بەرەو ماڵ.

# تەقەی دەهۆڵ
# لە دوورەوە خۆشە

**پرسۆناژ:**

**- عاشق**

**- رەشی، رەفیقی عاشق**

**- ژنیَ زۆر جوان**

**- شووی ژنی زۆر جوان**

**- پڕ بە حەوشیَ ژن و پیاو بۆ زەماوەند**

**- دەهۆڵ و زوڕناچی**

لــه دوورەوە دەنگــی دەهــۆڵ و زوڕنــا دێ. کامێــرا لەنێــو کۆڵانــەوە ئەکەوێتــە رێ. ماڵێــک زەماوەنــدە، کامێــرا ئەچــێ بــەرەو ماڵەکــە. چەنــد ژن لەنێــو حەوشــە خەریکــی هەڵپەڕکێــن. دەور تــا دەور پیــاو دانیشــتوون تەماشــا ئەکــەن. ژنــێ زۆر جــوان ســەرچۆپیی گرتــووە و تــەواوی پیــاوەکان تماشــای ئــەو ئەکــەن. دانەیــە لــە پیــاوەکان زۆر عاشــقانە و عەبــداڵ تەماشــای ئــەکا، بــێ ئــەوەی بزانــێ شــووی ژنەکــە (مێردەکــەی)، بــەلای دەســتییەوە دانیشــتووە! دەهــۆڵ بــە ســۆز ئەیکوتــێ. ژن بەجوانــی هەڵدەپــەڕێ. پیــاوی عاشــق بــێ ئیــرادە بــۆی ئەڕوانــێ. شــووی ژنەکــە جارجــار لایــەک بــۆ کابــرای عاشــق ئەکاتــەوە.

عاشـق: دەی دەی باوکمـە سـاقەت! ئەهـا! (روو لـە پیـاوە رەفیقەکـەی شـان چەپـی) ئێـژم رەشـی؟

رەشی: خوەت رەشی، ها؟

عاشق: ئەرێ تۆ نازانی ئەم ژنە کێیە؟

رەشی: نەوەڵا، بۆچی؟

عاشـق: کـورە هیـچ! ئەمـەوێ، دەسـتی بنێمـە سـەر دڵـم و پێـی بڵێـم، ئـەم ژنـەت باوکمـی هێنـاوە بەرچـاوم و ماڵوێرانمـی کـردووە!

شووی ژنەکە دەست بە پێکەنین ئەکا.

رەشی بە شووی ژنەکە ئەڵێ؟

عاشق: ئەرێ، ئەی ماڵکاول! ئەی بە کێ ئەڵێم؟!

رەشی: ئەویش خەنجەرێ ئەکا بە زکتا و ئەوکا بە شەهیدی رێگای عیشق!

عاشق: کورە بەتوون، بە تەبەس! کورە گیانێ بۆ ئەو دەرنەچێ، بۆ فرکدان باشە!

ئەکەونە تەماشاکردن.

رەشی: خوەت رەشی، ها؟

عاشق: بەوەڵا، هەرکەس یەک ژەم خۆراکی مەتبەخی ئەو ژنە بخوا، هەتاهەتایە مەرگی بۆ نابێ! تۆ و خوا وا نییە؟ وا نییە رەشی؟

رەشی: بەخوا چی بڵێم؟ نازانم گاهەس وا بێ، گیانی خوەت ئەوەندە مەدوێ، بهێڵا با تەماشا بکەین!

شووی ژنەکە گوێی لە تەواو قسەکانیانە.

عاشق: ئەڵێم رەشی؟

رەشی: (توورە) ها ها؟ چی ئەڵێی؟

عاشق: ئەڵێم، ئەمڕۆ ئەم زەماوەندە دوایی دێ؟

رەشی: ئەرێ، ئەرێ!

عاشق: نابێ لە زاوا بپاڕێینەوە هەر ئەمڕۆ ژنێکی تریش بهێنێ با سێ رۆژی دیکەش درێژەی پێ بدرێ؟

رەشی: کورە دەی ئیدی کەم گەوج بە!

شووی ژنە (مێردەکەی) بەپێکەنینەوە سەرێ ئەلەقێنێ و هەڵئەستێ و ئەچێ.ژن خەریک هەڵپەڕینە و کابرای عاشق هەر بە سەروکاپۆڵ خوەیا ئەکوتێ.

## (فەید ئەوت و فەید ئین)

خەڵکەکـە خەریـک خوداحافیـزی لـە خـاوەن ماڵـن، کابـرای عاشـق دانیشـتووە و هـەر خەریـک تماشـای ژنەکەیـە، ژنەکـە خەریـک خوداحافیـزی لـە خـاوەن زەماوەندەکەیـە، شـووی ژنەکـە ئەچـێ بـە لای شـان کابـراوە دادەنیشـێ.

شوو: ببوورە کاکە گیان، ئەبێ پێم بڵێی نێوی موبارەکت چییە؟

عاشق: نێوم؟! بۆ چیتە بزانی؟

شـوو: راسـتەکەی مـن ئەمـڕۆ نیـوەڕۆ زۆر مانـدوو بـووم و نەختـێ لـەو ژێرزەمینـەدا خەوتـم. خەونێکـم دی، سـەیدێکی سـەرتاپا سـەوز هاتـە خەونـم و پێمـی وت تەماشـای شـانی راسـتی خـۆت بکـە و هەرکەسـت بینـی بەلای شـانتەوە، ئەمشـەو بیبـە بـۆ ماڵـی خـۆت کـە لـە دەپوختـی ژنەکـەت شـیوێ بـکات. لام کـردەوە، تـۆم لـە شـانی خۆمـەوە دی و ئێسـتا بـە تەمەنـاوە لێـت تەقـازام هەیـە بێـی بـۆ مـاڵ ئێمـە و لـەوێ شـیوێ پێکـەوە بکەیـن. (بـە قامـک نیشـان ئـەدا) ئـەوەش لـەوێ ئـەو کـراس سـوورە ژنـی منـە.

عاشق: م م من نێوم ئیس ئیس ئیسماعیلە.

بەقوربانـی ئـەو سـەیدە سـەرتاپا سـەوزە بـم، رەشـی؟ رەشـی گوێـت لێیە؟!

رەشی: نەزرت قەبووڵ ئیسماعیل!

شوو: دەی چی ئەڵێی برا؟ دێیت لەگەڵمان؟

عاشق: کورە چۆن نایەم؟ نۆکەرییت ئەکەم و هەر بەسەر دێم.

شوو: بەخێر بێی.

عاشق: ئەڵێم قەیدی نییە رەشیش لەگەڵ خۆم بێنم؟

شوو: کێ؟

عاشق: ئەم رەفیقەم نێوی رەشییە.

شوو: نە قەی چی ئەکا بەخێر بێت، دە باشە بەقوربان تا ئێمە خوداحافیزی ئەکەین، ئێوەش حازر بن، بڕۆین.

عاشق: ئەی بەسەرچاو.

شوو بەرەو ژنەکەی ئەڕوا.

عاشق: چاوت لێیە رەشی؟! دیت چۆن ئاواتم خواست و مرادم حاسڵ بوو؟! ئەی بە نۆکەرت بم سەیی سەرتا سەوزا ئەی لە دەورت گەڕێم خوایە! بیستبووم خوا دڵی لە لای عاشقانە، باوەڕم نەدەکرد! بیستبووم دڕک چووبوو بە پای شیرینا، خوێن لە پای مەجنوون هاتبووە دەرێ، بڕوام نەبوو!

رەشی: ئێستاش چاکە هەر بڕوات نەبێ، چون شیرن و مەجنوون قەد یەکتریان نەدیوە و کاریان بەیەکەوە نەبووە!

عاشق: چۆن؟

رەشی: چون شیرین لەگەڵ فەرهاد بوو، نە لەگەڵ مەجنوون.

عاشق: ئەی مەجنوون لەگەڵ کێ بوو؟

رەشی: ئەوەی بیستوومە لەگەڵ لەیلێ نە لەگەڵ شیرین!

عاشق: ئەی بابا فەرقی چییە، شایەد ئەو رۆژە حەزی کردبێ لەگەڵ شیرین بێ!

رەشی: کورە فەرهاد چاوی نەکەنایا، خوسرەو چاوی ئەکەند،

ئەویش نەیکەندایا، شیر و کوڕی خوسرەو ئەیکەند! خۆ لەگەڵ دانە و دوان نەبوو ماڵکاول: گایەلێ پیاو بە شۆنیەوە بوو!

عاشق: کێ رەشی؟ مەجنوون؟

رەشی: کورە لاچۆ! یەک ساعەتە قسەی بۆ ئەکەم، نەیزانیوە مەجنوون ژن بووە یان پیاو! گێل و گەوج.

## (ماڵی شووی ژنەکە)

دەرگا ئەکرێتەوە.

شوو: فەرموون، فەرموونە ماڵەو.

عاشق و رەشی دێنە ماڵەو. پای عاشق لە چتێ هەڵئەکەوێ بەدەمەوە ئەڕمێ، رەشییش ئەکەوێتە ملیا.

شوو: ئاخ ئاخ ئاخ.

عاشق سەر بەرز ئەکاتەو ئەبینێ پڕ ناو ماڵە لە جلوبەرگی ژنانە و هەموو شتێ تێکەڵاوی یەک بووە.

عاشق: باوکم ڕۆ! ئەمە چییە؟!

شوو: تۆ خوا ببوورن (روو لە ژن) ئەمە بۆ ناو ماڵەکەت وایە؟ بۆ جەمت نەکردووەتەو؟

ژن: چی؟! باوەڕ ئەکەی، ئەمشەو باش قسە ناکەی!

شوو: نە عەزیزم، قسەی خراپم نەکردووە، ئەڵێم، جلوبەرگەکەت لەنێو دەست و پێدا خراپ نەبێ.

ژن: خراپ ئەبێ بەتوون و تەبەس، ئەوەی زۆر بێ جلوبەرگە. لەوە بەدوا هەمیشەو دایم خۆت حەوش و ماڵت کۆ کردووەتەوە، ئەبێ لە

خۆت بپرسی بۆ وایە، نە من!

شوو: وایە. قەیدی نییە، فەرموون فەرموون.

هەردوو هەڵئەستن بەو بە ئیحتیاتەوە، ئەچنە ماڵەوە.

(نێوماڵ)

عاشق و رەشی و شوو دانیشتوون. رەشی تەماشای دەوروبەری خۆی ئەکا. هیچ شتێ بەسەر جێی خۆیەوە نییە. هەست ئەکا شتێکی تەڕ ها نێو شواڵەکەیا. هەر خۆی ئەجوولێنێتەوە.

شوو: ببوورە کاکە رەشی شتێ بووە؟

رەشی: نەخێر. بەڵام، بەڵام چۆن بڵێم.

شوو: بڵێ کاکە بڵێ؟

رەشی: بەخوا هەست ئەکەم... هەست ئەکەم، شتێ تەڕ و باریک کەوتووەتە نێو شواڵەکەم!

شوو: شتی تەڕ و باریک؟!

رەشی: بەڵێ وەڵا!

شوو: دەی بزانە چییە کاکە گیان، خۆ هەرسێکمان مێردین و عەیب نابێ بزانە چییە!

رەشی: دەی تۆ خوا ببوورن.

رەشی لە پشتەوە دەست ئەکێشێ بۆ نێو شواڵەکەی و حەسابی بۆی ئەگەڕێ.

رەشی: ئەها، ئەوەتە گرتم!

عاشق: مشکە؟!

رەشی: نە.

عاشق: جانەوەرە؟

رەشی: نە.

عاشق: ئەی چیت گرت؟!

رەشی: ئەوەتا خەریکم دەری دێنم!

رەشی یەک دانە ماتیکی سوور لەنێو شواڵەکی دەردێنێ.

شوو: ئەوە هی ژنەکەی منە! لەنێو شواڵ تۆا چی دەکا؟!

رەشی: چووزانم پێم وایە لەو کاتا کەوتین، پەڕیوەتە نێو شواڵەکەی من!

شوو: باسی مەکە. بیدە بە من بزانم. بزانێ بێ ئابڕوومان ئەکا! زۆر حەزی لەم ماتیکە بوو!

رەشی: باوکم ڕۆ، ئێستا خوا ئەیزانێ لە پشتەوە چی لێم کردبێ!

عاشق: ئێستا وەک دوای عەنتەری لێ هاتووە.

رەشی: بەرلەوە بچیتەوە بۆ ماڵ، خۆت تەمیس کەی باشترە! (هەست ئەکا بۆنێکی خراپ دێ) ئەڵێم بۆنی نێو شواڵەکەی تۆیە؟

رەشی: شەرم ناکەی؟!

عاشق: ئەی بۆنی چییە؟

رەشی: لە من ئەپرسی! من چووزانم.

عاشق: ئەڵێم نەوەک لە ترسا خۆتت پیس کردبێ!

رەشی: قسەی قۆڕ بەسە. (روو لە شوو) ببوورە بۆنێکی خراپ هەست پێ ناکەی؟

شوو: بۆنی خراپ؟ (چەند جار بۆن ئەکێشێ) نە، بۆنی چییە؟

رەشی: نازانم، پێم وایە موبال (ئاودەست) لەنێو کۆلاندا تەقیبێ، هیچ نییە.

شوو: لووتی من لەم جۆرە بۆنانە پڕەوە بووە و هەستی پێ ناکەم.

رەشی: بەڵێ وایە، دیارە!

شوو: (بە دەنگ بەرز) ئەرێ ئەم تەعامە چی لێ هات ژنەکە؟

دەنگی ژن: (بەتووڕەیی) ئەبینی تەنیا دوو دەستم هەیە! خەریکە ئەکوڵێ، دگان بگرە خۆتا!

شوو: (بە پێکەنین) ماندووە، نەختێ تووڕەیە!

عاشق: قەی چی ئەکا.

دەنگی ژن: هەستە سفرەکە داخە، بێ بیبە، باشتر لەمە ناکوڵێ

شوو: ئامادە بوو.

بەخۆشحاڵییەوە هەڵئەستێ و سفرە دادەخا و نانی تێدا بڵاو ئەکاتەوە، ئەچێ قابلەمە (مەنجەڵ) دێنێتە سەر سفرە. هەر سەر قابلەمە لا ئەبا، رەشی و عاشق لووتی خۆیان ئەگرن.

رەشی: ئەحا... ئا بۆنی ئەمە بوو! ئەمە چییە؟

شوو: مەگەر نابینی، مریشکاوە!

رەشی: بەڵێ وایە (تەماشا ئەکا) پێم وایە کەیوانووت هەر بە جیقڵدانەکەیەوە ناویەتییە کوڵ!

شوو: تۆ خوا بەڕاستتە؟

رەشی: ئەوەتە کەوتووەتە سەر ئاوەکەی.

شوو: (بە دەنگی بەرز) ژنەکە؟

ژن: ها، چی؟

شوو: ئەمە خۆ مریشکەکەت بە جیقڵدانەوە ناوەتە کوڵ؟!

ژن: خەستە و ماندوو هاتوومەتەوە، لەبیرم نەماوە جیقڵدانەکەی لابەم، قەی چی ئەکا، بە کەوچک پاڕوویکی لێ خە و لای بە، خۆ نامری!

رەشی: بەڵێ وایە! (روو لە عاشق) کاکە من ئەڕۆمەوە، تۆ دانیشە بخۆ با نەمری!

عاشق: کورە وەڵا لەبرسا بمرم، دەمی پێوە نادەم!

رەشی: دەی هەستە با بڕۆین.

شوو: بۆ کوێ، غەزا (خواردن) بۆ ئێوە ساز کراوە!

عاشق: نۆشی گیانی خۆتان. (هەڵدەستێ)

رەشی: ئەم ژنەی تۆ لە دەرەوە باوکی خەڵک ئەهێنێتە بەرچاویان، لە ماڵەوە باوکی خۆتی هێناوەتە بەرچاوت! وا نییە؟!

شوو: وایە! ئەوەندە لەم تەعامانەی داوەتە دەرخواردی من، پێم وایە بەقەد نوح عومر بکەم، ئەم رەفیقمانەش زانیبووی هەر کەس تەعام دەست ئەم ژنەم بخوا، مەرگی بۆ نابێ، وتم با ژەمێ بخوا و عومری درێژی بێ، ئینشائەڵا!

عاشق: راکە رەشی، راکە بۆن کوشتمی کاکە، ئەوەتە وتوویانە، تەقەی دەهۆڵ لە دوورەو خۆشە!

رەشی: (بەدەم پێکەنینەوە) حەیفی نان نییە بەزەحمەت دەری

بێنــی، بیـدەی بـە ئـاوا ژنـێ بیخـوا؟!

هەردوو بەتوندی دەردەچن... شوو ئەکەوێتە نێو فکر و خەیاڵەوە.

دوو نەفـەر خەریـک ئاودێریـی زەوی و زەراعەتـن، کابرایەکیـش لـە خـوار ئەوانـەوە، بـەلای چـوار سـەر ئاژەڵـەوە دانیشـتووە و ئاژەڵەکانـی خەریـک لـەوەڕن.

ئاویـاری یەکـەم: ئـەم کابـرا زۆر خـۆ زل بینـە و تـا ئێسـتا کەسـی وا خـۆ زل بینـم نەدیـوە!

ئاویاری دووەم: کێ؟ ڕەحمان؟

ئاویـاری یەکـەم: ئـەرێ ڕەحمـان، نانـی وشـک ئەخـوا و قورقێنـەی کەبـاب لـێ ئـەدا!

ئاویاری دووەم: چۆن؟

ئاویـاری یەکـەم: پێـت خۆشـە بزانـی چـۆن؟ حـەز دەکـەی بزانـی پیـاوی خـۆ زل بیـن بـە کـێ دەڵێـن؟

ئاویاری دووەم: بەڵێ وەڵا، بۆ حەز ناکەم؟

ئاویـاری یەکـەم: دە باشـە کاکـە، ئـەوەی ڕەحمـان بەدیاریـەوە خەریـک شـوانییە، بژمێـرە بزانـە، چەنـد سـەر حەیوانـە؟

ئاویـاری دووەم: یـەک، دوو، سـێ سـەر بـزن و یـەک سـەر کـەر و یـەک سـەر گیسـک و سـێ سـەر مـەڕ!

ئاویاری یەکەم: پێکەوە ئەبێ بە چەند سەر؟

ئاویاری دوو: دیارە! ئەبێ بە هەشت سەر!

ئاویاری یەکەم: دە باشە، کوێریش دەزانێ ڕەحمان هەشت سەر ئاژەڵی هەیە! جا ئێستا بڕۆ لێی بپرسە چەند سەر ئاژەڵت هەیە؟ ئەوکات بۆت روونەوە ئەبێ پیاوی خۆ زل بین یانی کێ!

ئاویاری دووەم: تاوێ تر لێی ئەپرسم.

حەیوانەکان خەریک لەوەڕن. ڕەحمان چێوێکی بە دەستەوەیە و بە چەقۆ خەریک تاشینی چێوەکەیە. هەردوو پیاو وردە وردە دێن بۆ لای ڕەحمان.

ئاویاری یەکەم: ماندوو نەبی ڕەحمان!

ڕەحمان: خۆتان ماندوو نەبن.

ئاویاری دووەم: خەریک چیت ڕەحمانە؟

رەحمان: خەریک شوکرانەبژێریی دەرگای خواوەند تەعالا، خەریک چی بم.

بەلایەوە دادەنیشن.

ئاویاری دووەم: راستی ڕەحمان تۆ چەند سەر ئاژەڵت هەیە؟

ڕەحمان: چەند سەر؟ بەخوا نەمژاردووە، نازانم.

ئاویاری دووەم: دەی بۆ نایانژمێری؟

ڕەحمان: قسەکەت جوانە، ئینشائەڵا پاییزی ئەمساڵ بە یارمەتیی خوای یەکتا، دەستم لە ئیش و کار خاڵی بێ، لەگەڵ رانەکەی ماڵ قولیخان ئەیانژمێرم!

چاوی ئاویاری دووەم لە حەیرەتا زاقەو ئەبێ، ڕەحمان چاوی بە زیانکردن حەیوانەکانی ئەکەوێ و بەتوندی هەڵئەستێ و بە قاڵە قاڵ ئەچێ بۆ حەیوانەکانی.

ڕەحمـان: هـرپپپ، هـرپپپ، مەچـووە نـاو زەویـوزار خەڵکـی، خـاوەن تۆپیـو!

ئاویاری دووەم هەر بەو حاڵەتەوە لا ئەکاتەو بۆ ئاویاری یەک.

ئاویاری دووەم: بیستت چی وت؟

ئاویـاری یەکـەم: بەڵـێ بیسـتم، لەگـەڵ ڕانەکـەی مـاڵ قولیخانـا ئەیانژمێـرێ!

ئاویاری دووەم: ئەویش ئەگەر دەستی لە ئیش و کار خاڵی بێ!

ئاویـاری یەکـەم: ئەویـش بـە یارمەتیـی خـودای یەکتـا، چـون بـە تەنیـا خـۆی ناکـرێ!

ئاویـاری دوو: بەحەقیقـەت پیـاوی خـۆ زل بیـن بـە ڕەحمـان ئەڵێـن! ڕان مـاڵ قولیخـان، دە شـوان و زیاتـر لـە دە گەماڵـی هەوشـار و نیگابانی هەیـە و کاتـێ ئەکەوێتـە ڕێ بـۆ لـەوەڕ، بـە دوو سـاعەت لـە ئاوایـی دەردەچـێ! ئـەم کابـرا دنیـای چـۆن دیـوە؟!

ئاویـاری یەکـەم: ئینسـانی خـۆ زل بیـن، دنیـا بـەو شـێوە ئەبینـێ کـە خـۆی حـەزی لێیـە!

ئاویـاری دووەم: وایـە، حـەزی ئەوەیـە حەیوانەکانـی لەگـەڵ ڕانەکـەی مـاڵ قولیخانـا بژمێـرێ.

# ئاسکی سەرسمێڵ

پرسۆناژ:

- قاسم خان
- رەشید خان
- خانی دووەم
- نۆکەری قاسم خان
- خولە، نۆکەری رەشید خان
- جەماعەتێکی زۆر بۆ مێوانی
- دەهۆڵژەن و سورناچی

## (شەوی مێوانی)

زەماوەندی کوڕی خانە و هەموو ئەعیان و ئەشراف لەنێو ماڵ لەسەر سفرە دانیشتوون و خەریک پڵاوخواردنن.

چەند نۆکەر دەستەونەزەر لە بەردەرگای ماڵدا، ئامادەی (جێبەجێکردنی) دەستووراتی ئەربابی خۆیان، راوێستاون.

لەنێوخۆشدا جەماعەتێ خەریک شایی و هەڵپەڕکێن.

قاسم خان: هەر کەموکورتییەک هەیە بە گەورەیی خۆتان بمانبەخشن.

چەند خان: خوا پێی رەوا ببینێ قاسم خان، هەموو شتێ هەیە، ئێمە هیچ کەموکووڕییەکمان نییە، بۆ ژنەکان نازانین، خوا بەزیای کا قاسم خان، هەموو شتێ باشە.

خانی یەکەم: تۆ خۆت تێر کە رەشید خان، خەمی کەیوانووت نەبێ، ئەویش لە تۆ چاکتر ئەزانێ خۆی چۆن تێر کا! (پێکەنین)

خولە: (نۆکەر) من، من، من ب بڕۆم لە لە لە خاخاخاتوون پرسیار کەم، قووووریان؟

رەشید خان: چی پرسیار کەی؟

خولە: ئە ئە ئەوەی کە برسی و تینووی نەبێ؟

(پێکەنینی هەمووان)

ڕەشـید خـان: نـە خولـە، ئینشـائەڵا سـفرە و خوانـی قاسـم خـان پـڕ خەیروبەرەکەتـە و کـەس برسـی و تینـوو لەسـەری هەڵناسـێ!

خولە: ئیش ئیش ئیش، ئیشەڵا!

(پێکەنینی هەمووان)

ڕەشید خان: چی ئینشائەڵا خولە؟

خولە: ئە ئە ئە ئەوەی ف ف فەرمووتان قوربان.

ڕەشید خان: (دوای سەرلەقاندن) باشە ئیدی بێدەنگ بە!

قاسم خـان خەریـک خواردنـە و چەنـد دانـە برنـج ئاوێزانـی سـمێڵی ئەبێ و خـۆی بـێ خەبەرە.

نۆکەرەکـەی قاسـم خـان تماشـایەکی قاسـم خـان ئـەکا و لـە دوای تەعزیمێکـی سـفت و سـەخت.

نۆکـەر: ببـوورە گـەورەم، خەبەریـان هێنـا، هـەر ئێسـتا چـوار پێنـج ئاسـکی سـپی ڕەنـگ هاتوونەتــە نێـو بەشـی ژووری گوڵسـتانەوە، دەرنەکرێـن، گوڵــە جوانــەکان ئەژاکێنــن! (تەعزیــم)

قاســم خــان بــە زەردەخەنەیــێ، ســەری تەعزیــم بــۆ نۆکەرەکــەی دائەنەوێنــێ و دەســت ئەبــا مــل ســمێڵیا و دەنکــە برنجــەکان دادەخــا.

ڕەشـید خـان ئـاگاداری ماجەراکـە ئەبـێ و زۆر لـەو ڕەفتـارە حـەز دەکا و چەنـد جـار سـەری تەعزیـم بـۆ نۆکەرەکـەی قاسـم خـان دادەتەکێنـێ.

لە دەرەوە هەڵپەڕکێیە.

خانـەکان دانـە دانـە دەسـت لـە خـوارن هەڵدەگـرن و تـەک ئەدەنـە دواوە و خەریـک دەستشـۆردن ئەبن.

دەرەوە هەڵپەڕینە.

قاسم خان خەریکی قسەکردنە و خانەکان سەری بۆ دائەتەکێنن.

رەشید خان هەڵدەستێ و بەرەو لای نۆکەرەکەی خۆی ئەچێ.

نۆکەر: چی چی چی چیتان ئەوێ، گەورەم؟

رەشید خان: ئاوی دەست بەئاوم ئەوێ، ئازا کە.

نۆکەر: تێ تێ تێ تێ نەگەیشتم قوربان؟

رەشید خان: (سەر ئەباتە لای گوێی نۆکەرەکەی) بڕۆ ئافتاوەیەکم بۆ پڕ کە لە ئاو!

نۆکەر: لە چی؟

رەشید خان: هەی هەی بابا! جاران تور و لاڵ بووی، ئێستا شوکر بۆ خوا کەڕیش بووی! لە ئاو لە ئاو! نەچی دۆی تێ کەی!

نۆکەر: سە سە سە سەرچاو! لە ئاو؟

رەشید خان: کوڕە دەی ئەرێ! دە بڕۆ دەی!

خولە ئەکەوێتە رێ و رەشید خان سەرێکی بۆ ئەلەقێنێ و بە شوێنیا ئەڕوا.

خولە ئافتاوە پڕ ئاوەکە ئەنێتە ناو موبال و دێتە دەرێ.

رەشید: چاوت لە نۆکەرەکەی قاسم خان بوو خولە؟ چاوت لێ بوو چەند دانە برنج کەوتە ناو ریش و سمێڵی ئەو و نۆکەرەکەی چەندە رێکوپێک و جوان، برنجەکانی بە نێو ئاسک و ریش و سمێڵی قاسم خانی بە نێو گوڵ و گوڵزار دانا و مێشکی قاسم خانی خەبەرداری ئەو چەند دانە برنجە کرد؟! نۆکەر ئەبێ وابێ! نۆکەر ئەبێ قسەزان و جوان و ژیر بێ لەو جۆرە کاتانا و بەجوانی مێشکی ئەربابەکەی لە خێت و خەتا با خەبەر بکات! تێگەیشتی؟

خولە: بەڵێ قو قو قوربان.

ڕەشید خان ئەچێتە ناو موبالەکەوە و لە کاتی دەرگادانەوەدا ئەڵێ: ڕەشید خوا بکات وا بێ.

خولە پاڵ ئەدا بە دەرگای موبالەکەوە و دەست ئەنێتە سەر دەست.

کابرایەک ئافتاوە بەدەست دێت بەرەو موبالەکە و ئەیەوێ دەرگای موبالەکە بکاتەوە. ڕەشید خان لەودیوەوە دەرگاکە ئەگرێ.

ڕەشید خان: (بە کۆکە) ئەحۆ ئەحۆ ئەحۆ!

کابرا: ببوورە وامزانی کەسی تێدا نییە!

کابرا دەڕوا.

ڕەشید خان: (تووڕە) ئەوە لەوێ مردووی خولە؟!

خولە: بەڵێ گەورەم؟

ڕەشید خان: بەڵێ گەورەم و بەڵمە! ئەوە لەوێ مردووی هۆش دەرگاکەت نییە؟! مەهێڵە دەرگاکەم لێ بکەنەوە!

خولە: سەرچاو ئاغە گیان، تۆ خەریک کاری خۆت بە، من هۆشم هەیە!

ڕەشید: بەڵکوو وابێ!

دوای کاتێ یەکێکی دیکە دێت.

خولە بە دەست بەرسینگی کابرا ئەگرێ.

خولە: مەڕۆ.

کابرا: بۆ کەسێکی تێدایە؟

خولە: نەخێر.

کابرا: ئەی چۆن؟!

خولە: گەورەم رەشید خانی گڵ قەمەری تێدا ئیش دەکەن گاهەس پاتۆڵیان لە پێ نەبێ!

کابرا ئەدا بە ژێر کەنینا و هەر بەو حاڵە لەوێ دوور ئەکەوێتەوە.

دوای کاتێ، رەشید خان تووڕە و بەوئەخلاق دێتە دەرەوە. خولە تەعزیم دەکا و دەست بۆ ئافتاوەکە دادەکێشێ.

خولە: ماندوو نەبی گەورەم!

رەشید خان: لە چی ماندوو نەبم خولە گەوج، من بە تۆم وت هۆشی دەرکی موبالەکەت بێ، یان بۆ هەرکەس کە هات شەجەرەنامەی من بخوێنیتەوە؟! (لاسا) گەورەم رەشید خانی گوڵ قەمەری تێیدا ئیش دەکەن! ئەو لە تۆی پرسی کەسێکی تێدایە؟ بەڵێ کەسێکی تێدایە و تەواو!

خولە: بەڵێ گەورەم، بەڵام ئەو پرسی کێی تێدایە؟

رەشید خان: واشی وتبێ، مەبەستی هەر ئەوە بوو، نەک خوێندنەوەی شەجەرەنامەی بنەڕەتی من! تۆ کەی ئەبی بە بنیادەم؟!

خولە: باشە گەورەم، لەمەوبەدوا ئەزانم چی بڵێم و هۆشم هەیە.

رەشید خان: خودا بیکا وابێ!

چەند سەحنە هەڵپەڕکێ و لێدانی دەهۆڵ و زوڕنا پیشان ئەدرێ.

## (شەو، سەر سفره)

خانەکان لەسەر سفرەوە خەریک پلاو خواردنن.

نۆکەرەکان لە شان دەرگاکانەوە دەستەونەزەری ئەربابەکانیان

راوێســتاون.

رەشـید خـان ژێکەیەکـی زل ئەنێتـە دەمـی و چەنـد دانـە برنـج و نەختـێ خورشـت (شـۆربا) بـە سـمێڵیەوە دەلکـێ، خولـە چاوی پـێ ئەکـەوێ و چـاوی بـۆی زیـت ئەبێتـەوە!

هەموو بەبێدەنگی خەریکی نانخواردنن.

خولـە هـەوڵ ئەبـێ و چەنـد جـار دەسـت بۆ رەشـید خـان بـەرز ئەکاتەوە کـە بـە ئیشـارە پێـی حاڵـی بکات.

رەشید خان بەحەیرەتەوە تماشای خولە ئەکات.

رەشـید خـان: چیتـە خولـە؟! حـەز بـە هەڵپەڕکـێ ئەکـەی بـۆ ناچیتـە حەوشـەوە؟!

خولە: نە گەورەم بۆ هەڵپەڕین نییە!

رەشید خان: ئەی بۆ دەست و پێ رائەوەشێنی؟!

خولـە: نـە قوربـان، ئـەو ئـەو چـی پـێ ئەڵێـن؟ ئەهـا! ئـەو ئاسـکانەی واکـو لەسـەر موبـال فەرمووتـان، ئەوەتـە فیراندوویانـە بـە ریـش و سـمێڵی موبارەکتا!

هەمـوو ئـەدەن بەژێـر پێکەنینـدا و رەشـید خـان بەحەیرەتـەوە سـەری ئەلەقێنـێ دەسـت ئەگـرێ بـە سـەریەوە!

خولە سەری لێ ئەشێوێ نازانێ بگری یان بکەنێ!

# رازی قەڵای مەخووف
# (ترسناك)

**پرسۆناژ:**

**- رێبوار( مامناوەندی)**
**- پووشکەن (بەساڵاچوو)**
**- سارمٚ خان (مامناوەندی و سمێڵ چەخماخی)**
**- قاله (نۆکەری مەخووف و یەك چاو)**
**- پەنج ژن بۆ هاتووچۆ**

## سكانسی یەکەم:

رۆژ، دەمەو ئێوارە

دەشت و بیابان

رێبوارێکی تەنیا و ماندووگمرێوە و لە چەند پلان تێ دەپەڕێ.

هەتاو بەرەو نیشتن.

قەڵایەک لە دوورەوە دیاری دەدا.

رێبوار هەنک هەنک رائەوێستێ، بە دەست سێبەر بۆ چاوی دەکا و تماشای قەڵاکە دەکا.

رێبوار: ئۆخەی! نەمردم و چاوم بە ئاوەدانییەک کەوت! چاکە ئەمشەو روو لەو قەڵایە دەکەم و شەوم بە رۆژ ئەگەیێنم، تاکوو بەیانی شەو و جێگایەکی دیکە، خودا گەورەیە!

خوایە بە ئومێدی خۆت.

ئەکەوێتەوە رێ.

هەتاو لەپشت کێوەکاندا ئەنیشێ و تاریک ئەبێ و رێبوار ئەگاتە نزیک قەڵاکە.

کابرایەک خەریک کۆکردنەوەی چڵوچێوە... کە رێبوار ئەبینێ.

کابرا: ماندوو نەبی کاکە، ئۆغر؟

ڕێبوار: خۆت ماندوو نەبی برا، ڕێبوارێکی سەیاحم، ئەمشەو ڕێم کەوتووەتە ئەم قەڵایە و بەتەمای یارمەتیم، ئەمشەو بەڵکوو جێم بکەنەوە.

کابرا: (بەهێواشی) ڕێبواری؟!

ڕێبوار: بەڵێ وەڵا.

کابرا: وەرە وەرە ئێرە تا کەس نەتی دیوە! دەی!

ڕێبوار خێرا بەرەو کابرا ئەچێ.

ڕێبوار: ها کاکە! بۆچی؟ بۆچی نەمبینن؟

کابرا: تۆ ئەم قەڵایە ئەناسی؟

ڕێبوار: نەوەڵا! من یەکەم جارە بەم ڕێگەیەوە دێم و کەس ناناسم، بۆ؟

کابرا: دەی هەر ئەوەیە کە ئەمشەو ئیشی من تاکوو ئێستای خایاند کە ببم بە فریشتەی نەجاتی تۆ، هەر کەس هەیت و لە هەر کوێوە دێی، بۆ خودا خۆشەویستی، ئەگینا من ئێستا لێرە نەبووم و ئەتۆش ئەمشەو کارت تەواو بوو!

ڕێبوار: یانی چی؟ کاری چیم تەواو بوو؟ بۆ چاک حاڵیم ناکەی؟

کابرا: ئەمە پێی ئەڵێن قەڵای قورخان، ناشێ تاکوو ئێستا نێوت نەبیستبێ؟

ڕێبوار: (تێک ئەچێ) قەڵای قورخان؟!

کابرا: بەڵێ!

ڕێبوار: ئەو قەڵایە واکو ئەڵێن زۆر بەموحەبەت و میوانکوژن؟!

کابرا: بەڵێ ئەو قەڵایە واکو چوونی بۆ ناو هەیە، بەڵام دەرهاتنی

بە کەرام ئەلکاتبینە!

ڕێبوار: بەڵێ وەڵا، زۆرم لەبارەیەوە بیستووە! بەڵام بۆ وایە؟!

کابرا: جگە خودا و شەخسی سارم خان و چەند کەسێکی دەوروبەری خۆی نەبێ، کەس لەم رازە باخەبەر نییە و لە بەین دەیان میوانا زۆر بەدەگمەن یەکێ بەسەلامەت گیان بەدەر ئەبا و لەو دەروازەیە دەچێتە دەرێ!

ڕێبوار: کەوایە جاروبار میوانی لێ چووەتە دەرێ، وایە؟!

کابرا: بەڵێ، بەڵام زۆر کەم، گیانی خۆت هەڵگرە و برۆ، لەو چۆڵ و بیابانانەدا بخەوی لە تێپەڕکردنی شەوێکی پڕخەتەر و پڕمەترسی باشترە، تەنانەت ئەگەر ڕێی دەرهاتنت بۆ بکرێتەوە! برۆ برام برۆ.

ڕێبوار: نە من زۆرم لە رازی قەڵای قورخان بیستووە، حەتا بیستوومە قورخان خۆی میوانەکانی ئەخوارد! وایە؟

کابرا: من ئەمەم نەبیستووە، نایزانم، گاهەسیش وا بووبێ. بەڵام ساحێبێ ئێستای ئەم قەڵا سارم خان، کوڕەزازای قورخانە کە هەر بە رەسم و یاسای باووباپیرانی خۆی لەگەڵ میوان ئەجووڵێتەوە، بەمەحەبەت و بە ئینساف و ئینسانیەتێکی زۆرەوە، بەڵام....

ڕێبوار: من پێم خۆشە حەتا ئەگەر قەرار بێ بشمرم، ئەوەڵ سەر لەم رەمزورازە دەربێنم، جا بمرم.

کابرا: ئەگەر وایە و بایەخ بە گیان و ژیانی خۆت نادەی، فەرموو من بەرگریت ناکەم، بەڵام بزانە فریشتەیەکی دیکە لەو قەڵایەدا نییە کە مودافیعت بێ.

ڕێبوار: (دوای نەختێ فکرەو کردن) من سەیاحم و بۆ دیداری

عەجایبی رۆژگار سەفەر دەکەم، ئەمەش یەکێ لە عەجایبی رۆژگاری ئێمەیە و ئەبێ سەری لێ دەربێنم. هەرچی مەیلی خودای پێوە بێ، با بێ، من بەرەو ئەو دەروازەیە ئەڕۆم و ئەزانم بەیانی هەر لەو دەروازەیەوە دێمە دەرێ!

کابرا: خوات لەگەڵ.

مەشغووڵی کاری خۆی ئەبێ.

دەستی رێبوار کووبی دەروازەکە ئەکوتێ.

قاپچی: (لەوبەری دەروازەکەوە) ها بەڵێ، خۆت بناسێنە!

رێبوار: رێبوارێکی غەریب و شەوبەسەرهاتووم کە ئەگەر گەورەی ئەم عیمارەتە ئیزنم بدا، ئەمشەو میوانی بم و سەد ساڵ سەناوێ.

کابرای پووشکەن کەمەر راست ئەکاتەو تماشایەکی رێبوار ئەکا و سەری بۆ ئەلەقێنێ، دەروازەکە بە حاڵەتێکی ترسناکەوە ئەکرێتەوە.

دەنگی قاپچی: فەرموو وەرە ژوورێ.

رێبوار بە دڵێ رازی و دڵێ ناڕازی ئەچێتەماڵەوە.

خارکەن (پووشکەن) بارە پووشوپلەکەی ئەدا بە کۆڵا و لە رێگایەکی ترەوە ئەچێ بەرەو عیمارەت.

## (ناوماڵ شەو)

نووری چلچرا نێو تەلاری روونەوە کردووە.

سارم خان لە بەرەو دێتە ماڵەوە.

سارم: فەرموون، فەرموونە ژوورێ. یا رەبی بەخێر بێی، سەرچاوانم.

رێبوار: ڕەبی ماڵت ئاوابێ گەورەم.

سارم: بچوە ئەو ژوورەوە!

رێبوار: سەرچاو.

ئەچێتە ژوورێ.

سارم: هەر لەوێ دانیشە.

رێبوار: سەرچاو. (دادەنیشێ)

سارم: میوان خۆشەویستی خوایە، ئەمنیش موژاور و خزمەتگوزاری خۆشەویستی خوا، یاخوا بەخێر بێی.

میوان: ڕەبی ماڵ و مەنزڵ و کوشک و عیمارەتت هەتاهەتایە بەردەوام و پایەدار بێ!

سارم: جا پێم بڵێ بزانم چیت پێ خۆشە، بڵێ تاکوو بە ئاشەوانەکان بڵێم، بۆت ساز کەن؟

رێبوار: لەم کاتەدا هەزم لە هەموو شتێ هەیە و لە هیچ نییە گەورەم، ئەوەی لە مەتبەخی ئێوەوە دەربێ ئەینمە سەر سەرم.

سارم: دە باشە کاکە، ئەڵێم هەرچی هەیە و ئامادەیە بیهێنن.

رێبوار: ماڵت ئاوابێ.

سارم خان دوو سێ جار دەستی پێکدا دەدا.

دوو ژنی جوان بۆ داخستنی سفرە دێنە ماڵەوە، ڕێبوارەکە سەر دادەخا تا تەواوبوونی کاری ژنەکان، سەری بەرزەوە ناکا.

حەرەکاتی میوان لەژێر چاوەدێریی خاندایە، هەموو تەعامێ لەسەر سفرەکە دادەنێن.

ژنێ بە ئافتاوە و لەگەن (تاس و مەسینە)ەوە دێتە ژوورێ.

لەگەنەکە لەبەر دەست میوانەکەدا دادەنێ.

میوان بێ ئەوەی سەر لە ژنەکە بەرزەوە کات، دەستی بۆ ناو لەگەنەکە درێژ ئەکاتەوە و ژنەکە بە ئافتاوەکە ئاو ئەکا بە دەستیدا.

میوانەکە دەستەکانی دەشوا و بە دوو ئەنگوست دەستماڵی سەر دەست ژنەکە هەڵدەگرێ و دەستی وشک ئەکاتەوە و دیسان دەستماڵەکە دەخاتەوە سەر دەستی ژنەکە.

ژنەکە ئەچێ.

سارم: بسمیلا.

رێبوار زۆر بەدیقەت چاوەدێریی خۆی دەکا تاکوو لە کاتی خواردندا هەڵە نەکات. دوای خواردن تەک ئەداتە دواوە.

رێبوار: لە خوا ئەپارێمەوە لەشتان ساق، رۆحتان شاد و دوور لە پەژارە و بێوەری لە دەرد و مەینەت و سفرە و خوانتان پڕ لە خێروبەرەکەت بێ. رەبی ئەم کوشک و عیمارەتە بە دایم ئاوان و لە چاوی پیس و ئەفعالی بەو و بەخیل، لە ئەماندا بێ، ئامین یا رەبەلعالەمین.

سارم: نۆشی گیانت بێ.

دیسان ژنێکی دیکە بە ئافتاوە و لەگەنەوە دێتە ماڵەو.

رێبوار سەر دادەخا و وەک جاری پێشوو دەست و دەمی ئەشوا و بێ ئەوەی چاو لە ژنەکە بکا، دەستی بە دەسماڵ وشک ئەکاتەوە و دەسماڵەکە ئەخاتەوە سەر دەستی ژنەکە.

ژنەکە ئەچێتە دەرەو.

ڕێبوار سەر بەرز ئەکاتەوە.

سارم: دەی کاکی خۆم تاکوو جێگەی خەوت بۆ دادەخرێ، بۆم بڵێ خەڵکی کوێیت؟ کار و پیشەت چییە و لەم ڕێگاوە بۆ کوێ ئەچێ؟

ڕێبوار: ڕێبوارم، خەڵکی ناوچەی موکریانم، گەورەم، لە بنەماڵەیەکی وەرزێر و ئاژەڵدارم، بەڵام خۆم هەر لە منداڵییەوە خولیای جیهانبینی و سەیروسەفەر بووم، چەند ساڵێکە بێ ئەوەی خۆم دەربەندی ژن و منداڵ کردبێ، شار بە شار و دیار بە دیار سەفەر دەکەم و ئەوەی ئەیبینم بە مێشک و خاتری خۆمی ئەسپێرم، هەڵی دەگرم کە ئەگەر عومرێکم بۆ مایەوە، لە دەورانی پیریدا بینووسمەوە تاکو ببێ بە چرای ڕێگای داهاتووی ڕێبوارانی دیکەی ژیان.

سارم: وەکوو چی؟

دوو ژنی دیکە خەریکی جێگە داخستن ئەبن.

ڕێبوار: وەکوو چۆنیەتیی ڕێگا و فاسیلەی شار و دێهاتەکان لە یەکتر. وەکوو ڕەسم و یاسای بنەماڵە و تەوایفی جۆربەجۆری کورد. وەکوو ژیانی ئابووری و عیلمی و هونەریی ناوخۆی ئەقوام و ئەم جۆرە شتانە.

سارم خان: زۆر چاکە، بەڵام هۆی چییە؟ بۆچی چاکە؟

ڕێبوار: بۆ ئەوەی ئەگەر ڕێبوارێکی دیکە، ڕۆژ و ڕۆژگارێکی دیکە لەم ڕێگاوە هات با بە شارەزایی و زانایی کامیڵەوە بێ و لە هیچ بوارێکەوە سەبارەت بە خەڵکی ئەم ناوچە، تووشی هەڵە نەبێ.

سارم خان: جوانە، تێگەیشتم زۆر جوانە و سەیروسیاحەتێکی پڕ خەیروبەرەکەتە بۆ داهاتووی خەڵک، مەرحەبا!

ژنەکان دوای جێ داخستن بە بەردەم ڕێبواردا ئەچنە دەرێ. ڕێبوار سەر دادەخا و تاکوو تێ دەپەڕن سەر بەرزەو ناکا.

سارم خان: بەنیاز نیت بەر لە خەوتن بچیتە دەرەوە؟!

ڕێبوار: بەڵێ وەڵا، بەنیازم.

سارم خان: (بە دەنگی بەرز) ئەهای قالە!

قالە: (دێتە دەرکی ژوورەکە) بەڵێ گەورەم!

سارم خان: میوانەکەمان نیازی دەرەوەی هەیە، لەگەڵ خۆت بیبە پێویستییەکانی بۆ ڕێک خە!

قالە: سەرچاو.

ڕێبوار: (هەڵئەستێ) سپاست ئەکەم. (بە شوێن قالەدا دەچێتە دەرێ)

سارم خان ئەچێتە ناو فکرەوە تەماشایەکی شمشێر و قەڵغانە بە دیوارە ئاوێزانەکەیەوە دەکا و سەری ئەجوڵێنێ.

ڕێبوار دێتەماڵەوە.

سارم خان: ئەوە جێگاکەت داخراوە، تەماشا کە بزانە کەموکەسریی نییە؟ سەرینەکەت بەرز یا نزم نییە؟

ڕێبوار: ڕەبی ماڵت ئاوابێ گەورەم، هەموو شتێ تەواو باشە.

سارم خان: دەی باشە کاکە گیان خۆشم لەم دیوەکەی ترم، لەم دیوی سەرەڕێگەوە، ژنەکان ئەخەون، ئیشی دەرت بوو، خۆم بانگ کە.

ڕێبوار: سەرچاو.

سارم خان: ئەوە تونگی ئاویش لە ژوور سەرتە، شەو باش.

سارم خان ئەچێتە دەرێ، ڕێبوار ئەچێتە نێو جێگەکەی و ڕائەکشێ. قالە دێتە ماڵەو تماشایەک ڕێبوار ئەکا و لا ئەکاتەوە بەرەو شمشێر و قەڵغانەکە و دوای شەمی چلچراکان ئەکوژێنێتەوە و بەئارامی ئەچێتە دەرێ.

## (دەرەوەی عیمارەت) شەو

عیمارەت بە شێوەیەکی مەخووف لەسەر بەرزایی تەپۆڵکە دیارە لە دوورەوە دەنگی با و لوورەی گورگ و کەمتیار دێت.

کامێرا زووم ئەکاتە سەر دەروازەکە و ئەکرێتەوە و سارم خان لە هۆڵی ڕەوانەکردنی میواندا دەرئەکەوێ.

سارم: زۆر خۆش هاتی بەقوربان!

ڕێبوار: سپاسی گەورەییت ئەکەم گەورەم، بەقەد تەواوی ژینم ئیمشەو لەم عیمارەتە لەزەتی ژیانم بینی.

سارم خان: هەر کاتێ ڕێت کەوتەوە ئەم ڕێگا، ئێرە بە ماڵی برای خۆت بزانە.

ڕێبوار: (دێتە دەرەوە) زۆر مەمنوونی گەورەیی و عەزەمەتی ڕۆحی تۆم، بەڵام پرسیارێ لەسەر دڵم ماوە نازانم بیکەم یان نا؟

سارم خان: تۆ ئیمشەو هیچت لە من نەپرسی، هەقی ئەوەت هەیە پرسیار بکەی.

ریبوار: میوانکوژیی ئەم کوشک و عیمارەتە «معروف العامە» گەورەم. بۆ خۆشم لەو باوەڕەدا نەبووم کە ئیمشەو لەم عیمارەتەدا گیانی سالم دەربەرم، بەڵام هەروەها کە عەرزم کردی ئەمشەو

خۆشترین شەوی ژیانم بوو، ئێستا بێ هیچ زەرەر و زیانێ بەم هەموو موحەبەتەوە هاتوومەتە دەرێ، تۆ خودا پێم بڵێ، ئایا قسەی خەڵکی بەڕاستە؟ ئەگەر راستە من چۆن گیانم دەرکردووە و هۆی چییە لە گیانی من خۆش بووی؟

سارم خان: پرسیاری یەکەمت بەڵێ وایە، میوانی کەج رەفتار و کەج گوفتار لەم کوشک و عیمارەتە گیانی بەدەر نەبردووە، پرسیاری دیکەت، ئەگەر تۆ گیانت بە سەلامەت دەرکرد، لەبەر ئەوە بو رەسم و یاسای میوانبوونت بەجێ هاورد و زانیت میوانبوون ئەبێ چۆن بێ.

رێبوار: تۆ خوا پێم بڵێ، رەسم و یاسای میوانی چییە و ئەوان چیان کرد کە نابوود کران؟!

سارم خان: (نەختێ بیرکردنەوە) ئەگەرچی ئەم کارەساتە رازی ئەم قەلا بووە، بەلام چون تۆ بۆ داهاتوو ئەینووسیتەوە، بۆ ئەوەی خەڵک بزانن، قورخان ئینسانخۆر نەبووە و ئەوانەی لەم ماڵەدا لەبەین براون، هەقی خۆیان بووە. من ئەم رازەت بۆ فاش (ئاشکرا) دەکەم کە بۆ داهاتووان نەبێتە هۆی بیروباوەڕی نالەبار. بەڵێ برای بەڕێزم، کابرا ئەهاتە نێو ماڵەکەم، هەر بەو شێوە تۆ میوانداری کرای، لەویش میوانداری ئەکرا، ئەوەڵ رکی دەکرد کە ئیلا و بیلا نایەتە ژوورێ هەر لە بەر دەرکەکەدا دادەنیشت.

لێم ئەپرسی چی ئەخۆی، ئەیوت هیچ، کە سفرەکەیان رادەخست، هەر تەعامێ ئەهاتە سەر سفرەکە بە داد و قاڵ ئەیوت ئەمە ئیسرافە، بۆ چیمانە هەر نان و ماستێ بەس بوو! کاتێکیش ئەهاتە سەر سفرە بەقەد چوار نەفەری ئەخوارد و بە دەنگی بەرز ئەیکرد بە قورقێنە! لەوەبەدوا ئەگەر ژنێک بهاتایە ناو ماڵەکەوە، چاوی ئەبڕییە ناوچاوی

و کاتێ بڕۆیشتایە، لە پشتەوە چاوی لە سمت و کەفەڵی ئەبڕی و هەستم ئەکرد ئەگەر خۆم لەناوماڵەکەدا نەبوایەم، هێرشی ئەبردە سەر ژنەکان!

دوای ئەمانەش، پرسیاری ئەکرد، چەند ژنت هەیە و چەند سەر تاژەڵت هەیە؟ ئەوە ژنی کێیە؟ ئەمەی تر کچی کێیە؟ ئەوەندەی لێ ئەپرسیم، یاس و هەراسانمی ئەکرد. جێگایان بۆ دادەخست، بەزۆر ئەچووە سەر جێگاکە و پێی خۆش بوو کۆپان بکەمە کۆڵی و لەبەر دەرگاکە بیخەوێنم، بەڵام درۆی دەکرد، لێم ئەپرسی کاری دەرەوەت نییە؟ ئەیگوت نا، بەڵام نیوەشەو بۆگەنی ئەخستە ناو ماڵەکەوە، یان بۆ ئەوەی چاوی بە خەوتنی ژنان بکەوێ، دەیان جار هاتوچۆی دەرێی ئەکرد، خەوی لە چاوی منیش ئەبڕی، بەیانیش کە لەسەر جێگە چەپەڵەکەی هەڵئەستا، لەشی ئەوەی نەبوو کە خۆی جێگەکەی کۆ بکاتەوە کە چەپەڵکارییەکانی نەبینرێن! ناوی تەک بە تەکی ئەو ژنانەی بێ ئەوەی پێویست بێ ئەپرسی، منی لە میواندارى پەشیمانەوە ئەکرد! ئێستا لە تۆ ئەپرسم، دوێ شەو چەند ژن خزمەتی تۆیان کرد؟

ڕێبوار: پێم وایە دوو ژن.

سارم خان: باوەڕت پێ دەکەم چون قەد سەرت بەرزەو نەکرد، روومەتیان تماشا کەی. بەڵام چاکە بزانی پەنج ژن خزمەتی تۆیان کرد! بەڵام تۆ نەتزانی چنکو بۆ تماشای ژنان نەهاتبووی، بەڵام ئەوان هەر لە دوو ساعەتی ئەوەڵدا، ناوونیشان و تەمەن و هەموو شتێکی ژنەکانیان دەپرسی و دوای سێ ساعەت ئەبوو بە ئامۆزای هەقودای من و سەری لە هەموو شتێک دەرهێنابوو! بێ ئەوەی من تەنانەت ناوی

ئەوم پرسیبێ! من ئەمشەو هەستم بە حوزووری تۆ نەکرد، ئەوەی بۆت دانرا بێ قرم و قاڵ خواردت، نۆشی گیانت. هیچت نەپرسی و پرسیارەکانت بەبێ هاشە و هووشە، بەکورتی جواب دانەوە، بەر لە خەوتن چوویتە دەرێ و کاتی هاتنەوە تەمیس و موتەهەر خەوتی و بەیانی خۆت جێگەکەی خۆتت کۆ کردەوە، بە جێگەی، دوعای خەیر و بەرەکەت و ئاوەدانیت کرد، بە جێگەی ماڵاواییت کرد و لە ماڵ هاتیتە دەرێ، چنکو یاسای میوانییت زانی و یاسای میواننەوازیی منت بەجێ هاورد و ئێستاش ئەڕۆی! ئەوانیش هەروا رەوانە ئەکران، بەڵام بەرەو عەدەم! چونکو نە هەقی خۆیان ئەناسی، نە هەقی خاوەن ماڵ. کەوابوو ئەو شەخسانە هەقی مروڤایەتیش ناناسن، هەنگاو بە هەنگاوی ژیانیان بۆ هەمووان زیانبار ئەبوو، بۆیە مەشیایێ بمردایەن!

ڕێبوار: (نەختێ بیرکردنەوە) وایە، وایە گەورەم! بە هەقیقەت بە هەقی خۆیان گەیشتوون، رەبی ماڵت هەتاهەتایە ئاوابێ!

سارم خان: خواتان لەگەڵ، خەیرت لە رێ، خوداحافیز!

ڕێبوار: ئەکەوێتە رێ.

دەروازەکە دادەخرێ.

ڕێبوار لە کوشک و عیمارەت دوور ئەکەوێتەوە...

# حەمکۆڵ و
# قروانیی حەلاڵکراو*

**پرسۆناژ:**

**- حەمکۆڵ**

**- سۆفی**

حەمكۆڵ: یانی چی؟!

سۆفی: یانی دابەشکردنی گۆشتی قروانی ئەبێ بۆ جەژنی قروان و مانگی قوربان بێ، نە هەموو ڕۆژێ!

حەمکۆڵ: قروانی قروانییە سۆفی، بۆ خەیر و خەیرات کاتیان دانەناوە و لە هەموو کاتێکدا خەیرات ئەبێ.

سۆفی: بەڵێ وایە، بەڵام نە پەز و بزنی خەڵک!

حەمکۆڵ: پەز و بزن خەڵک بۆ، سۆفی؟!

سۆفی: تۆ لە حەوت ڕۆژی حەفتەدا، دوو جار ئەچیتە ئەودیوی سنوور و دوو سێ سەر ئاژەڵ لەگەڵ خۆت دێنی.

حەمکۆڵ: وایە.

سۆفی: هێنانی ئەم چەند سەر حەیوانە یان بە دزییە یان لەودیو تۆمی ئاژەڵت وەشاندووە و سەوز دەبن، حەمکۆڵ! قروانیکردنی ماڵی دزی بە خەیرات نابێ!

حەمکۆڵ: من خۆم لە هەموو ئەو شتانە بیرم کردووەتەوە سۆفی، ئەم گۆشتە حەتا ئەگەر دزییش بێت، بۆ تۆ حەرام نییە، هانێ بیگرە.

سۆفی: نا حەمکۆڵ گیان من نامەوێ، بیبە بۆ کەسێکی دیکە، دەستت خۆش بێ!

رانێ ئاژەڵ لە کەمەرەی کێوەکەوە دێتە بان..

حەمکۆڵ بەئەسپایی لەسەر تاشەبەردێ سەر دەردێنێ و تماشا ئەکا.

رانەکە بەدەم لەوەڕەوە دێتە بان...

حەمکۆڵ بە گۆشەی سەروێنەکەی دەم و لووتی خۆی دائەپۆشێ و ئەچێتە پشت بەردەکە.

پەزێ لە بەردەکە نزیکەو ئەبێ.

دەسی حەمکۆڵ بەتوندی ملی پەزەکە ئەگرێ و ئەیکێشێ بۆ پشت بەردەکە.

شوانەکە بێ خەیاڵ خەریکی شمشاڵ لێدانە.

بزنێ بەرەو بەردەکە ئەچێ.

دەستی حەمکۆڵ ئەویش ئەگرێ و ئەیباتە پشت بەردەکەوە.

## (نێو ئاوایی، شەو)

حەمکۆڵ دوو کاسە پڕ لە گۆشتی بە دەستەوەیە و بەنێو کۆڵانی ئاواییدا وەیلانە و ئەچێ.

ئەدا لە دەرکی ماڵێ.

ساحێوماڵ: کێیە ئەوە؟

حەمکۆڵ: منم سۆفی رەمەزان، بیکەوە!

سۆفی: (دەرگا ئەکاتەو) ها حەمکۆڵ!

حەمکۆڵ: گۆشتی قروانیم بۆ هێناوی!

سۆفی: گۆشتی قروانی چ وەختی حەمکۆڵ؟

حەمکۆڵ: تاکو ئێستا دەیان جار گۆشتم بە خەڵکی ئاوایی داوە، هەموو دوعای خەیریان بۆ کردووم، بەڵام تۆ بەتەنیا ئەوەڵ جار لێمت سەند (وەرت گرت)، ئیدی لێمت نەسەند بۆ؟

سۆفی: ئەو یەک جارەش نمەشیا بمسەندایێ و لێتم وەربگرتایێ، بەڵام نەمزانی.

حەمکۆڵ: چیت نەزانی؟

سۆفی: ئەوەی کە گۆشتی دزییە و ماڵی خەڵکە و حەرامە!

حەمکۆڵ: عەرزم کردی سۆفی، من فکری ئەو شتانەم کردووەتەوە و حەڵاڵم کردووە، تۆ لە حەرامبوونی باکت نەبێ!

سۆفی: ئەبێ بزانم چۆنت حەڵاڵ کردووە؟

حەمکۆڵ: بۆ نابێ!

سۆفی: دەی گوێم لێتە بۆمی بڵێ بزانم؟

حەمکۆڵ: من بۆ دابەشکردنی گۆشتی ئەم ئاژەڵانە پارە وەرناگرم و بە خەیرات ئەیدەم بە خەڵک و ئەوان دوعای خەیر و بەرەکەتم بۆ ئەکەن.

سۆفی: باش؟

حەمکۆڵ: ئەو گوناحەی من لەگەڵ ئەو سەوابا واکو ئەیکەم و دوعای خەیری خەڵکم بۆ کۆ ئەکاتەوە و بەرانبەر ئەبێ، ئیدی سوعال و جوابی ڕۆژی حەشری پێوە نامێنێ!

سۆفی: باش؟

حەمکۆڵ: دەی چی باش؟ ئەو حەرامە بەو دوعای خەیرانە وەحەڵاڵ

ئەبێ و پییە و ریخۆڵە و سی و جگەرەکەشی بۆ من ئەمێنێتەوە، لەخوا بەزیا بێ، خۆ دز نیم!

سۆفی بەحەیرەتەوە لا ئەکاتەوە بۆ لای دووربین (کامێرا)ەکە و تەماشای دووربینەکە ئەکات و لا ئەکاتەو بۆ لای حەمکۆڵ.

سۆفی: بەخوا باشت بۆ خۆت حەلاڵ کردووە، بەلام ئێمە حەزمان لە گۆشتی حەلاڵکراو نییە!

* لە (رشتەی مرواری)یەوە وەرگیراوە

خـان-ی ناخـۆش ئەحـواڵ، پاڵـی داوە بـە پاڵشـەو و بـەو بـێ حاڵییـەی پشیلەیەکی لـە بـاوەش کـردووە و دەسـت بـە پشـت پشـیلەکەدا دێنـێ.

خــان: پێـم وایــە ئــەم بەسـتەزمانەش گیــرۆدەی ناخۆشــییەکەی مــن بووبــێ، زۆر بــێ حاڵــە!

نەفـەری یەکـەم: بەخـوا قەسـەم گـەورەم ئـەم حەکیمـە وەکـوو ئەوانـی دیکـە نییـە، ئەڵێـن هـەر دەسـت بنێتـە سـەر نەبـز ئەزانـێ دەرد چییـە و دەرمانـی بـۆ ئەنوێنـێ!

خـان: بـاوەڕم پێیـان نەمـاوە و ئەزانـم هەموویـان درۆزن و کەڵەکبـاز و نەزانـکار و پڕمودەعـان!

نەفــەری دووەم: ئــەم حەکیمـە تـازە هاتووەتـە شـاری ئێمـە و ئــەوەی بیسـتوومانە دەردی زۆر کەسـانی دەرمـان کـردووە، گـەورەم، بـە فتـوای من دەرفەتـی هاتنـی پـێ بدەیـن خـراپ نییـە. گاهـەس ئـەم وەکـوو ئەوانـی تـر نەبـێ و چـارەی دەردەکەتـان بـکات، بـە فتـوای مـن لـێ مەبـوورن (ڕەتـی مەکەنەوە).

نەفەری یەکەم: منیش هەر ئەوە ئەڵێم.

خــان: ئەوەنــدە گژوگیــای جۆراوجۆریــان بەخــواردم داوە و نەتیجــەم لێیـان وەرنەگرتـووە و ڕۆژ بـەڕۆژ حاڵـم خراپتـر بـووە، بـڕوام پێیـان نەماوە و سـوێندم خـواردووە ئیـدی بـە قسـەیان نەکـەم و ڕێ بـە هاتنیـان نـەدەم،

بەڵام بە یەک شەرت حازرم ئەم دەرفەتە بەم حەکیمەش بدەم.

پیاوی یەکەم: چ شەرتێ گەورەم؟

خان: بەو شەرتەی ئەگەر نەیتوانی دەوای دەردم بکا، سەر لە مل جیا بکەنەو! عەڵبەت پشیلەکەشم هەر بەو دەردەی من گرفتارە و ئەوەڵ بێ ئەوەی بزانێ ئەبێ پشیلەکەم دەرمان بکات.

پیاوی دووەم: باشە گەورەم هەر وای لێ ئەکەین.

خان: باشە برۆن بیهێنن.

## (فەید ئاوت و فاید ئین)

حەکیم لەسەر کورسییەک دانیشتووە.

حەکیم: نەخۆشەکە ناهێرن؟!

پیاوی یەکەم: نەخەیر، ئەو ناهێڵێ کەس چاوی پێ بکەوێ، مەگەر دوای دەرمان.

حەکیم: دەی باشە کاکە، دوو سەر دەزوو بوەسن بە دەستیانەوە و دەزووەکە بهێنن بیدەن بە دەس منەوە و هەر بەو دەزووە، دەردەکەیم بۆ روون ئەبێت و دەرمانی بۆ ئەنوێنم.

ئەچن لە ژوورێکی دیکە بێ ئەوەی حەکیم بزانێ، سەر دەزووەکە ئەوەسن بە دەس پشیلەکەوە و ئەوسەرەکەی دێنن، ئەیدەن بە دەس حەکیمەوە.

حەکیم چەنجار دەزووەکە بەرز ئەکاتەو لەناو دەسیا ئەیوڵێ و بە حەیرەتەوە دای دەنێ، دووبارە بەرزی ئەکاتەو ئەچێتە ناو فکرەوە، رەنگ لە رووی ئەپەڕێ.

پیاوی یەکەم: چی بووە حەکیم؟ نازانی دەردی چییە؟

حەکیـم: وەڵا بڵێـم چـی گـەورەم، هـەم دەردەکـەم ناسـیوە و هـەم دەرمانـی، بـەڵام ....

پیاوی یەکەم: بەڵام چی؟

حەکیم: بەڵام زات ناکەم بڵێم دەرمانی چییە؟

پیاوی دووەم: بۆ زات ناکەی؟

حەکیم: چونکە ئەترسم تا وتوومە سەرم لە مل جیا بکەنەوە!

پیـاوی یەکـەم: نەزانـی دەرمانـی چییـە هـەر ئـەو بەڵایـەت بـۆ دیـاری کـراوە!

حەکیـم: دەی ئەمـە چـۆن کارێکـە، کـە چ دەرمانـی دەردەکـەی بکـەم ئەکوژرێـم و چ نەیکـەم ئەمکـوژن؟!

پیـاوی دووەم: دەرمانــی بکــەی باشــترین پێشکەشـیت پــێ ئــەدرێ، مــەرگ بـۆ؟!

حەکیـم: دەی ئاخـر دەوای دەردەکـەی شـتێکی بـاش نییـە، بـاوەڕم پـێ ناکرێ!

پیـاوی دووەم: تـۆ بڵـێ چییـە، تەنانـەت زەهـری ماریـش بنوێنـی، ئێمـە لێـت زیـز نابیـن و لەسـەر نەخۆشـەکەمان ئەزمـوون ئەکەیـن، بـۆی بـاش بـێ، ئەنعامـی باشـت ئەدەینـێ!

حەکیـم: (بـە تـرس و لـەرزەوە) دەی ئەگـەر هیـچ نەڵێـم چی؟ دیسـانەوە هـەر مەحکـووم بـە مەرگم؟

پیاوی یەکەم: بەڵێ وەڵا، بەڵام چاک ئەوەیە هەرچی هەس، بیڵێی.

حەکیـم: لەبیرتانـەو نەچـێ، بـە مـن قەوڵتـان داوە، دوای ئەزموونـی

دەرمانەکـەم، ئەگـەر ئەفاقـەی نەبـوو، ئەوجـا بمکوژن!

پیاوی یەکەم: لەسەر قەولّی خۆمان بەردەوامین!

حەکیـم: دە باشـە قوربـان ( بـە تـرس و لـەرزەوە) ئـەم نەخۆشـەی ئێوە خانـە، سـولّتانە، شـایە، ئەمیـرە، وەزیـرە، سـا هەرکـەس هەیـە و هـەر جۆر پلـە و مقامێکـی هەیـە، بـە خواردنـی گۆشـتی، بـە خواردنی گۆشـتی!

کابرای دووەم: بە خواردنی گۆشتی چی؟ بیلّێ ئیدی؟!

حەکیـم: بـەوەلا خەتـای مـن نییـە و دەرمانەکـەی ئەوەیـە گـەورەم، بـە خواردنـی گۆشـتی مشک چاکـەو ئەبـێ!

(لە ترسا چاو ئەچووقێنێ)

کاتـێ ئەبینـێ هیچیـان لێ نەکـرد، چاو ئەکاتەوە و ئەبینێ پشـیلەیەکیان بـە دەزووەکـەوە هێناوە و هەموو خۆشـحالّن.

پیـاوی یەکـەم: بـە حەقیقـەت حەکیمـی و خانـت حەسـابی خۆشـحالّ کـردووە و ماتلّـە بچیتـە خزمەتـی و دەرمـان بـۆ ئەویـش بنوێنـی! ئافەریـن، هـەزار مەرحەبـا!

حەکیم: نەفەسێکی راحەت ئەکێشێ و خۆشحالّ ئەبێ.

# دزی جوامێر

**پرسۆناژ:**

**- دەجاڵ**

**- حاکم**

**- دزی جەوان (فەرزەن)**

**- دزی پیر**

**- راوی**

**- قەراوڵ**

## (تەلاری دارولحکوومە)

دەجاڵ: لەم چەن ساڵەدا کە ئەم وڵاتە بێ حاکم بووە، پڕ بووە لە هەرجومەرج و دز و درۆزن، بە فتوای من لازمە لەشکرێکی باش لەگەڵ خۆت بەری.

حاکم: بەنیازی لەشکر نیم، تەک و تەنیا وەکوو بۆرەپیاوێ رێ ئەکەوم، کە هەم لە نزیکەوە لەگەڵ ژیانی خەڵکەکە ئاشنا بم و هەم بێ جەهەت هەزینەیەکی زۆر باری لەشکرکێشی نەکەم.

دەجاڵ: هەر جۆر خۆت بە چاکی ئەزانی وا بکە، بەڵام زۆر هۆشی خۆتت بێ، چون بزانن حاکمیت، لەوە ئەچێ قەد نەهێڵن بە دارولحکوومە بگەیی.

حاکم: ناهێڵم بزانن و هەر ئەمڕۆ رێ ئەکەوم.

## (بەر رۆخانە)

دوو دزی پیر و جەوان لەبەر رۆخانەکا دانیشتوون و باوک و فەرزەنن.

دزی جەوان: ئەڵێم بابە گیان؟

دزی پیر: گیانی بابە؟

دزی جەوان: ئێستا بۆ حاکم؟

دزی پیر: بۆ ئەوە بە ئەحەڕەش کە خۆی بە چالاکترین دزی قەبیلە زانیوە، سابت کەم کە تا سەد ساڵی دیکەش دز بێ، دڵ و جورئەتی منی نابێ و هەتاهەتایە بەهێزترین دزی قەبیلە منم.

دزی جەوان: (چاوی بە دوور ئەکەوێ) هات بابە هات!

دزی پیر: کوا؟ ها؟ چی هات؟!

دزی جەوان: حاکم هات! ئەوەتە لەسەر ئەو چاروا خەریکە دێت!

دزی پیر: نە رۆڵە نە! حاکم بەو شێوە تەنیا و لاواز ناکەوێتە رێ، حاکم لەگەڵ خەدەم و حەشەم بە کەبکەبە و دەبدەبەوە دێ و سەدان خەدەمەی لەگەڵە!

ئەوە پیاوێکە رێبوار و تەنیا.

دزی جەوان: (هەراسان) ئەی هاوار بابە ئاو بردی!

دزی پیر: ها چی؟ کێ؟

دزی جەوان: ئەو کابرا هاتە ناو ئاوەکە و لافاو پیادا و بە چارواکەیەو کەوتە نێو ئاوەکە!

باوک: ئەی دادوبێداد! با بڕۆین رۆڵە، خۆت خە ناو ئاوەکە بەڵکوو نەجاتی بەین! ها دەی!

هەردوو خۆیان ئەخەنە ناو ئاوەکە...

## (فەید ئین، فەید ئەوت)

باوک و فەرزەن، حاکم و چارواکەی خووسی ئاو لە رۆخانەکە ئەکێشنە دەرەوە و حاکم لەپاڵ دارێکا پاڵ ئەخەن. دەست بە زکیا ئەینن، ئاو لە دەمیەو ئەپەڕێ و حاڵی باش ئەبێ.

حاکم: زۆر مەمنوون، زۆر مەمنوون ئێوە گیانی منتان نەجات دا.

باب: قابلی نەبوو، ئاخر تۆ کە مەلە نازانی، چۆن خۆت لە ئاوێکی ئاوا ئەخەی کابرای کەر؟!

حاکم: ببوورە ئێوە کێن، لێرە چی دەکەن؟!

فەرزەن: ئێمە دزین، لێرە راوەستاوین تا حاکم بێت و باوکم رووتی بکاتەوە.

حاکم رەنگ بە ڕەنگ ئەبێ و بەحەیرەتەوە روو لە پیرە پیاو ئەکا.

حاکم: بۆ مەگەر حاکم ئەناسن؟

باب: نە، بەڵام رێکەوتنی حاکم بە کەبکەبە و دەبدەبە و خەدەم و حەشەمەوە لە چاو ون نابێ.

حاکم: وایە، بەڵام چۆن لە ئاوا کەسێ ئەتوانن دزی بکەن و رووتی کەنەوە؟

باب: یەک شتی چکۆلەشی لێ بدزم، بۆ سەلماندن بە ئەحەڕەش بەسە.

حاکم: ئەحەڕەش کێیە؟

باب: خۆی وا ئەزانێ چالاکترین دزی تایفەیە، بەڵام وا نییە و من چالاکترین دزی تایفەم!

حاکم: ئەها، تێ گەیشتم، سەرکەوتوو بی!

دزی جەوان سفرەی تەرکی چارواکە ئەکاتەوە و روو لە حاکم ئەکا.

فەرزەن: ئەمە سفرە نانە؟

حاکم: ئەرێ، تۆشەی رێگاکەمی تێدابوو.

دزی جەوان ئەیکاتەوە و دای دەنێ...

نانەکە بووەتە هەویر، بەڵام مریشکێکی سوورەوکراوی نیوەخوراوی تێدایە...

دزی جەوان دەمێکی بۆ ئەتەقێنێ...

حاکم: تەواو خووساوە، ناشێ بەکاری خواردن بێ!

باب: بۆ بەکار نایێ؟ فەرموو بخۆ!

حاکم: نە من تێرم بۆم ناخورێ.

باب: ئێمە بیخۆین؟

حاکم: ئەگەر قێزتان ئەبا، نۆشی گیانتان!

باب و فەرزەن وەک هەڵۆ هێرش ئەبەنە سەر سفرەکە و لە بەرچاوی حەیرانی حاکمەوە، مریشکەکە ئەخۆن.

دوای خواردنی هەردوو پێکەوە دوعای خەیری بۆ ئەکەن.

هەردوو: خودا لە نان و نمەکت بەزیاد کا.

حاکم: نۆشی گیانتان. (دەست بۆ بەین شاڵەکەی ئەبا) من پێم وایە بە گیانم مەدیونی ئێوەم و ئەبێ جوبرانی زەحمەتەکەتان بکەمەوە.

هەرچی ئەگەڕێ کیسە پارەکەی بۆ پەیدا نابێ..

باب: شتێکت گوم کردووە؟

حاکم: کیسە پارەکەم نەماوە، پێم وایە کەوتبێتە نێو ناوەکە! ببوورن، من ئەبێ بڕۆم، ئەڵێن: (کێو بە کێو ناگا، بەڵام ئینسان بە ئینسان ئەگا)، ئینشائەڵا بۆتان جوبران ئەکەمەوە.

هەڵئەسێ و سوار چارواکەی ئەبێ و ئەکەوێتە ڕێ...

حاکم: خوداحافیز.

هەردوو: خوات لەگەڵ!

حاکم دوورەو ئەکەوێ.

دزی جـەوان کیسـە پارەکـەی حاکـم لەنـاو سـینگی خـۆی دەردێنـێ و بەخۆشـحاڵییەوە نیشـانی باوکـی ئـەدا.

باوکـی بەخۆشـحاڵییەوە سـەرێکی بـۆ دادەتەکێنـێ و نـاگا چـاوی بـە سـفرە نانەکـە ئەکـەوێ و بەتوورەییـەوە لا لـە کوڕەکـەی ئەکاتـەوە...

باب: سفرەی نانەکەی ماڵ کاول! هادەی خۆتی پێ بگەینە! هادەی!

دزی جـەوان تێـک ئەچـێ و بـە شـوێن حاکمـا دەرئەچـێ و هـاواری لـێ ئـەکا...

دزی جـەوان: ئەهـای کاکـە راوێسـتە.. ئەهـای کاکـە راوێسـتە.. پارەکـەت.. راوێسـتە پارەکەتمـان دۆزییـەوە!

حاکم ئەبیسێ و بەر چارواکەی ئەگرێ...

دزی جـەوان، خەسـتە و مانـدوو خـۆی پـێ ئەگەیەنـێ و کیسـە پارەکـەی بۆ درێـژ ئەکاتـەوە...

حاکم: (بەحەیرەتەوە) لە کوێ بوو؟

دز: کەوتبووە سەر عەرزەکە.

حاکم: ئێوە مەگەر دز نین؟!

دز: دزیـن، بـەڵام نـان و نمەکـی کەسـێ بکەیـن، دزیـی لـێ ناکەیـن، فەرمـوو بیژمێـرە.

حاکم کیسەکەی لەدەست ئەسێنێ و بەحەیرەتەو ئەکەوێتە رێ...

حاکم: (لەژێر لچەو) دزی واش، بەوەڵا نەویبەرە! ئەمانە ئیدی کێن؟!

راوی: حاکم هەر لە ئەوەڵین رۆژی حاکمیەتەوە، کەوتە نێو دز و درۆزن و بە دەسبڕین و حەبس کوتە و خەلیلی، مەترسیی خستە نێو دزانەوە و دوای ساڵێک لەگەڵ خەدەم و حەشەم چوون بۆ راووشکار و شەو لەنێو خەیمە و خەرگس خەوتن.

بەیانی کە لە خەو هەستان، حاکم تەماشای کرد کە لیباس و شمشێر و حەمایلەکەی نەماوە!

زۆر تووڕە بوو، لە دوای عەزیەت و ئازارێکی زۆری قراوڵان و حارسانی چادرەکەی سەد سکەی تەڵا و چاروایەکی عەرەبیی جایزەی بۆ دەستبەسەرکردنی دزی لیباس و حەمایلەکەی دابین کرد و لەنێو خەڵکدا بەشەو کرا، دەم بە دەم وتیان، کار کاری ئەحەڕەشە و کەسێ غەیر ئەحەڕەش دڵ و جورئەتی کاری وای نییە.

ئەحەڕەش کە ئەم کارەی نەکردبوو، خۆی شاردەوە و حاکم ئیعلانی دا، هەرکەس جێگا و مەکانی ئەحەڕەش بە ئێمە نیشان بدا و دەستبەسەر بکرێ، ئەوە سەد سکە و چاروا عەرەبییەکەی پێ ئەدرێ.

خەبەر گەیشتە گوێی باوک و فەرزەندی دز و هەردوو پێکەوە چوون بۆ دارولحکوومە و دزی پیر وتی: من جێگاورێگای ئەحەڕەش ئەزانم و تەنیا بە حاکمی ئەڵێم. خەبەریان بە حاکم دا و حاکم وتی: باشە بیانهێنن.

کاتێ باوک و فەرزەند واریدی تەلاری حاکم بوون، حاکم هەردووکیانی ناسییەو، بەڵام ئەوان حاکمیان بە جلوبەرگی حکوومەتییەوە نەناسییەو.

حاکم: باشە بڵێ بزانم ئەحەڕەش لە کوێیە؟

باب: ئەڵێم بەقوربان، ئەڵێم، بەڵام دوای وەرگرتنی جایزەکەم.

حاکم: ئەگەر وتت و لەوێ نەبوو چی؟

باب: ئەگەر لەوێ نەبوو، سەرم لە ملم جیا بکەوە!

حاکم: (دوای نەختێ فکر) باشە (روو لە قەراوڵی تەلار) فەوری ئەو کیسە کە لەگەڵ چاروایێ ئامادە کراوە، بێنن.

قەراوڵ ئەچێتە دەرەو دوای کاتێ دێتەوە، کیسە پارەکە ئەدا بە دەس حاکمەو.

قەراوڵ: چارواکەش لە دەم دەرگایە.

حاکم پارەکە ئەدا بە دەست دزی پیرەوە...

دزی پیر ماچی کیسەکە ئەکاتەوە و بە کوڕەکەی ئەڵێ...

دزی پیر: ها رۆڵە، ئەمە سەرمایەیەکی زۆر باشە کە خۆت و دایک و خوشکت لە فەقر و فەلاکەت و بەدبەختی نەجات ئەدا، چارواکەش لەدەم دەرگایە، سوار بە و لێ دە و برۆ بە سلامەت!

حاکم: باشە بڵێ؟

باب: تا کوڕەکەم لە شار دەرنەچێ هیچ ناڵێم.

حاکم: بەر کوڕەکەی مەگرن باکو بۆ هەر کوێ ئەڕوا، بڕوا.

باب: دە برۆ رۆڵە!

کوڕ لە عەمارەت دەرئەچێ...

حاکم: ئەوە کوڕەکەشت رۆیشت، جا ئیسە بڵێ بزانم، ئەحەڕەش لە کوێیە؟

باب: ئەحەڕەشت بۆ چییە؟

حاکم: یانی چی؟

بـاب: یانــی دزی جلوبــەرگ و شمشــێر و حەمایلەکــەی تــۆ منــم، نــە ئەحــەڕەش!

حاکم: تۆ؟!

باب: بەڵێ من، من هاتمە نێو چادرەکەتەو دزیم.

حاکم: دەی ئەزانی من ئەمەوێ سەرت لە ملت جیا کەمەوە؟

بـاب: بەڵـێ قوربـان، عەسڵ ئـەو سـەد سکە و چارواکە بـوو کـە پێمـت دا، سـەری منیـش بۆ تـۆ!

حاکم: یانی چی؟

بـاب: تـەواو عومـرم دزیـم کـرد، بەڵکوو پارەیەکم دەسکەوێ و بیکەمـە سـەرمایەی ژیانـی ئـەو ژن و منداڵـەم و ئیـدی دزی نەکـەم، بـەڵام بـۆم ڕێ نەکـەوت، ئێسـتا کـە دەسـتی داوە، ئـەو سـەرمایە چاکـە بـۆ ئـەوان و سـەری منیـش بـۆ تـۆ، سـەرم بـۆ چییـە؟

حاکـم: (لەژێـر لچـەوە) ئەمانـە دزی نیـازن و وا چاکـە لەباتـی ئـەوەی بیانکـوژم، ژیانیـان دابیـن کـەم. (بـە دەنگی بـەرز) ئەگەر تـۆش مەرەخەس کـەم بچـی بـە شـوێن کوڕەکەتـا چـی؟

دز: تا ئاخری عومرم دوعای خێرت بۆ ئەکەم.

حاکم: چاروایەکیش بە ئەم بدەن، با بەشوێن کوڕەکەیا بڕوات.

قەراوڵ: (بەحەیرەتەو) سەرچاو گەورەم بەڵام!

حاکم: چاروایەکی پێ بدەن.

قەراوڵ: سەرچاو.(روو لە باب) با بڕۆین.

باب: خوا لە گەورەیی کەمت نەکا گەورەم!

به تەعزیم و تەکریمەوە بە شوێن قراوڵەکا ئەچێ...

دوای کاتێ قراوڵەکە دێتەوە بۆ لای حاکم.

قەراوڵ: ئەوەی فەرمووتان جێبەجێ کرا و کابرا بە سواری رۆیشت.

حاکم: باشە.

قەراوڵ: بێ ئەدەبی نەبێ گەورەم، ئەمانە دز بوون!

حاکم: بەڵێ وایە، بەڵام دزی نیاز، دزی سەداقەت و راستی، ئەوانە گیانی منیان لە مەرگ نەجات دا، لە سفرەکەم نانیان خوارد دزییان لێم نەکرد، بە بۆنەی دزیی ئەوانەوە کابرایەکی تر کەوتە مەترسیی مەرگەوە، بەڵام بە شناساندن (رادەستکردن)ی خۆیان، بەڵایان لە ئەو دوور خستەوە. ئەمانە کاری جەوانمەردانەیە و حەیفە بەو هەموو حوسنی ئەخلاقەوە کە هەسیان، فەدای برسییەتی و فەقریماڵی بن. وا نییە؟!

قەراوڵ تەماشای دەمی ئەکا.

# عیشقی
# قەناری (کەناری)

پرسۆناژ:

- فەرەج سەرتاش
- میوەفرۆش
- موشتەریی یەکەم
- موشتەریی دووەم

لەبەر دوکانی میوەفرۆشدا، قەنارییەک (کەنارییەک) لەنێو قەفەسدایە.

میوەفرۆش خەریک پاکەوەکردن میوەکانییە.

دوکان لادەس میوەفرۆشییەکە سەرتاشخانەیە و سەرتاشەکە خەریک کۆتاکردنەوەی سەری موشتەرییەکەیە.

میوەفرۆش: (بانگەوان) هەی باخت وەبەر بێ خاوەن باخ، بەه بەه بەه بەه! نەیبەیتەوە پەشیمانی!

سەرتاشەکە خەریک کار خوەیە.

موشتەری: کاک فەرەج قەنارییەکەی پێ نەدای؟

فەرەج: نە، زۆر نامەردە کاک وریا، زانیویە من عاشقی ئەو پەلەوەرەم، قیمەتێکی ناوە بانی کە لە تەوانی مندا نییە!

موشتەری: بۆ مەگەر ئەڵێ چەند؟

فەرەج: ئەڵێ، ئاخری سەد سکە!

موشتەری: تۆ چی، تۆ بە چەندی ئەکڕی؟

فەرەج: من وتوومە بیست سکە، دەی بەوەڵا هەر ئەوەم هەیە، ئەینا هەزار سکەم پێ ئەدا، نیمە!

موشتەری: ئیختیلاف هەشتا سکەیە، زۆرە زۆر!

فەرەج: بەڵێ وەڵا، بەڵام هەر ئەوەم هەیە.

میوەفرۆش: باخت ئاوا بێ باخەوان، وەرە تا تەواو نەبووە! دەی دەی دەی!

قەنارییەکە دەس بە خوێندن ئەکا و سای سەرتاش ئەبێ و دەس لە کارەکەی ئەکێشێ و بە حاڵەتێکی عاشقانەوە گوێ بۆ دەنگی قەنارییەکە شل ئەکا.

سەرتاش: بەه بەه، بەه بەه!

موشتەری: ئیشم زۆرە کاک فەرەج.

فەرەج: هست! هیچ مەڵێ، تەنیا گوێ شل کە! بەه بەه! بەه بەه!

موشتەری: دەزگیرانەکەم ماتڵی منە! ئەبێ بڕۆم بۆ کڕینی کەلوپەلی زەماوەندەکەم! گیانی خۆت دەستم لەسەر هەڵمەگرە!

فەرەج: بێدەنگ بە! نەختێ بێدەنگ بە!

موشتەری: (دوای کاتێ بێدەنگی) تۆ کە ئەوەندە عاشقی، بۆ پارەکەی بۆ فرەترەوە ناکەی و ئاوێزانی ناو دوکانەکەی خۆتی بکەی؟!

فەرەج: بۆ ئەوە خۆم شاهێد بووم لە منداڵێکی کڕی بە پێنج سکە! بیستم پێ داوە، ئەڵێ، ئیلاو بیلا، سەد سکە!

موشتەری: باشە ئینسانی عاشق حسابگەر نییە و ئەبێ تا فەداکردنی گیان، خەراج بێ! تۆ چە عاشقێکی کە باسی قیمەت ئەکەی؟

فەرەج: باشە کاکە باشە، تۆ بۆمی بکڕە بە سی سکە! نایدا هەر ئەڵێ سەد، منیش خودا خۆی ئاگادارە کە ئەوەندە پاشەنازم نییە!

موشتەری: باشە، خۆت پێی بڵێ سی سکە، شایەد پێتی بدا.

فەرەج: بۆی زۆر ئەکەم.

قەناری خەریک خوێندنە...

میوەفرۆش خەریک بانگەوازە.

فەرەج ئەچێتەو سەر موشتەری.

میوەفرۆش: نەیبەیتەوە پەشیمانی، جوانیی ماڵ و خۆشیی منداڵ، وەرە تا تەواو نەبووە. بەه بەه! بەه بەه!

قەنارییەکە خەریک خوێندنە...

فەرەج بە یەک کیسە سکەوە دێتە دەرێ...

میوەفرۆش خەریک بانگەوازە...

فەرەج کیسەکە ئەنێتە بەرچاو و نووک لووتی.

قەنارییەکە لەناو قەفەسەکەیدا هەڵئەفڕێ.

میوەفرۆش: ئەمە چییە؟

فەرەج: سکەیە بەقوربانت دەبم، سی سکەی تەواو!

میوەفرۆش: چەند جار پێت بڵێم؟ سەد سکە کەمتر نایدەم! تۆ بڵێی ۹۹ سکەش نایدەم، لەسەری مەچۆ!

فەرەج بەنائۆمێدی دەستی دێنێتە خوارێ...

قەنارییەکە خەریک هاتوچووی ناو قەفەسەکەیە...

فەرەج خەریک ریش تاشینی کابرایەکە...

میوەفرۆش، خەریک موشتەری رێ خستنە...

قەنارییەکە دەس بە خوێندن ئەکا...

فەرەج چاو ئەقووچێنێ و ئەچێتە ناو خەیاڵەوە...

موشتەرییەکە ئەترسێ و دەستی فەرەج بە تێخەکەوە ئەگرێ.

موشتەری: بەقوربانت دەبم کاک فەرەج من هەر تەنیا ئەم یەک

ملمە هەیە! چاو کەوە بۆمی نەبڕی!

فەرەج: بێدەنگ بە نایبڕم!

خوێندنی قەناریەکە تەواو ئەبێ...

فەرەج دەس بە کاری خوەی ئەکا...

موشتەری: بەوەڵا فەرهادی کۆکەن و قەیسی مەجنوون کە ئەلێن، بەقەد تۆ عاشق نەبوون!

فەرەج: (بەهەناسەوە) ئای چیت وت! داخۆ رۆژێ بهاتای من ئەو قەناریەم، ئا لەم نێو دوکانەدا، ئا لەو گۆشەوە بە دیوارا هەڵوەستای و ئا بەو شێوە دەنگی بۆم هەڵهاوردایە و بۆمی بخوێندایا!

قەناری خەریک خوێندنە...

میوەفرۆش خەریک پاکەوکردن میوەکانی و بانگەوازە...

فەرەج خەریک سەرتاشینە...

ئەم سەحنانە چەند جار بۆ نیشاندانی عبووری زەمان پیشان ئەدرێ و چەند جار فەرەج کیسە پارەکە ئەنێتە نووک لووتی میوەفرۆشەکە ئەویش بە سەرلەقاندن ئەڵێ: نە.

## (شەو، ماڵی فەرەج)

فەرەج نووستووە و خەون ئەبینێ قەناریەکەی کڕیوە و خەریکە بەخۆشاڵییەوە دای ئەوەسێ بە دیوار دوکاندا.

قەناریەکە خەریک خوێندن ئەبێ و فەرەج لە دوورەوە بەخۆشحاڵی گوێی شل کردووە.

لەناکاو پشیلە پەیدا ئەبێ و بەرەو قەناریەکە ئەمیاوێنێ!

فەرەج هەراسان ئەبێ و لە خەو رائەچڵەکێ!

هەڵئەستێ و لەناو جێگەکەیا مات و موتەحەیر دادەنیشێ.

فەرەج: (لەگەڵ خوەی) ئەی بتۆپی پشیلە!

## (رۆژێکی دیکە)

کابرای میوەفرۆش خەریکی ئیشی خوەیە.

فەرەج لەناو دوکانی خوەیە و پێنج سکەی دیکە بە کیسەکە ئیزافە ئەکا.

فەرەج: ئەمە یەک، ئەمە دوو، ئەمە سێ، ئەمە چوار، ئەمەش پەنج سکەی دیکە کە بێتە ٣٥ سکە، بەڵکوو خودا بیکا و بەمە بیدا!

میوەفرۆشەکە تەماشای نێو قەفەسەکە ئەکا...

میوەفرۆش: ئەی داد دانەت نەماوەخۆ! ئاویشت کەمە! ببوورە بیرم لێت بڕی!

قەفەسەکە دادەگرێ.

ئەچێ لەناو دوکاندا دانە ئەهێنێ و کاسە دانەکە ئەنێتە لای قەفەسەکەوە و دەرگای قەفەس ئەکاتەوە و مەشغووڵی ئەوە ئەبێ کە جێگە دانی نێو قەفەسەکە دەربێنێ.

خەریکی ئەو ئیشەیە کە لەناکاو دەستی فەرەج کیسە پارەکە ئەنێتە بەر لووتی ئەوەوە!

میوەفرۆش: ئەمە چییە؟

فەرەج: پارەیە بەقوربان ٣٥ سکە!

میوەفرۆش: نایدەم کاکە، نایدەم برام، نایدەم باوکم! من چەند سەد جار پێت بڵێم، ئاخری بە سەد سکە کاکە گیان؟ بۆ حاڵی نابی؟!

فەرەج: مەحز رەزای خوا قەیدی نییە، دڵم مەشکێنە و بیدە پێم.

هەواسی میوەفرۆش پەرت ئەبێ و سەر لە قەفەس ئەبڕێ و قەناری خوەی بە درگاکەوە نزیکەو ئەکا.

فەرەج کیسە پارەکە هەر بەرەو لووتی میوەفرۆش نزیک ئەکاتەوە!

قەناری لە قەفەس ئەپەڕێتە دەرێ و بە فڕان ئەچێتە سەر شاخەداری بەر دوکانەکە!

میوەفرۆش بەتوندی کیسە پارەکە لەدەست فەرەج ئەقاپێنێ.

میوەفرۆش: باشە بابە باشە، ئێستا ئیدی هی تۆە، پارەبی موبارەکت بێ!

فەرەج مات و حەیران تەماشای نووکی قامکی خوەی ئەکا کە تا تاوێ لەمەوبەر کیسە پارەکەی تێدابوو!

میوەفرۆش قەفەسەکە ئەنێتە بەردەس فەرەج و خوەی ئەچێتە نیو دوکانەوە.

فەرەج چاو بۆ دارەکە بەرزەوە ئەکا و بە حەسرەت تەماشای قەنارییەکە ئەکا.

# نەگبەتی وجوود

**پرسۆناژ:**

**- کابرای فەلاحی ناشیرین و نالەبار**

**- خانی مەغروور**

**- رێبواری سوار**

**- شەش کەس هاوڕێی خان**

کابرایەکی نالەبار و ناشیرین خەریک ئاویاریی دەشتە، تەماشا ئەکا.

چەند سوار کە بۆ راو دەچن، لەپشت سەرخانەوە بەرەو ئەو دێن!

خۆشحاڵ ئەبێ و ئەچێ لەسەر رێگەکەی خان و هاورێکانیەوە ئەوێستێ.

خان و هاورێکانی وردە وردە نزیک ئەبنەوە.

خان هەر لە دوورەوە کە چاوی بە روومەتی کابرا ئەکەوێ، پێکەنین لە دەمی وشک ئەبێ و برۆ ئەباتە نێو یەک.

کابرا: (بە تەعزیمەوە) رۆژ باش گەورەم، رووناکیت خستە نێو ئەم هەرد و بەردە قوربان! یارەبی بەخێر بی! خودا ئەیزانی بمزانیبا ئەمرۆ لەم رێگاوە تەشریف دێنی، بە تەنیا مەرێکم هەیە ئەمکرد بە قوربان و بەلێگەردانت!

خان: ئەرێ کابرا تۆ بۆ ئەوەندە ناشیرین و نالەباری؟! بۆ ئەوەندە روومەتت پیس و نالەبارە؟!

کابرا مات و حەیران تەماشای ئەکا و رۆحی تەحقیر ئەبێ.

خان: (روو لە هاورێکانی) ئەوە ئیدی بۆم لە نەگبەتی وجوودی ئەم کابرایە کە ئاوا هات و وەکوو دەعبا ناو رێگای لێمان گرت، ئیدی هیچمان دەس ناکەوێ و ئێوارە ئەبێ دەسخاڵی لەم رێگاوە بینەوە! ئاخر کێ بانگی تۆی کرد بێی و ناو رێگە لە ئێمە بگری

کابرای کەر؟! لاچۆ بزانم هادەی!

کابرا زۆر شەرمسار و خەجاڵەتبار ناو ڕێگەکە چۆڵ ئەکا.

خان بەتووڕەیی لە چارواکەی ئەخوڕێ و ئەدا بەلایا و ڕەت ئەبێ.

هاوڕێکان خان بە مۆڕبردنەوە ئەدەن بەلایا و ڕەت ئەبن و دوور ئەکەونەوە.

کابرا بێڵەکەی فڕێ ئەداتە گۆشەیەکەوە و هەر لەسەر جێگەکەیەوە دادەنیشێ و سەر ئەنێتە سەر ئەژنۆی و دەست ئەکا بە گریان.

ئاوی جۆبارەکە، خاکی خاکی ڕێگاکەی خۆی کە کابرا بۆ بەرگیری کردن هەڵی دابووەوە، ئەبا و ئاوەکە بەهەدەرا ئەڕوا.

کابرا: (سەر بەرز ئەکاتەوە و بەگریانەوە) خوایە تۆ خۆ خۆت ئاگادار بووی، من بە تەواو دڵ و دەروونەوە چوومە سەر ڕێگای ئەم خۆپەرستەی لە خودا بەدووره! چووم کە بەخێرهاتنی پێ بڵێم!

تۆ بۆ ئەوەندە منت شێواو و نالەبار خەلق کردووە کە تەنانەت مەحەبەتکردنیش بۆم حەرامە و ئاوا لەگەڵم موعامەڵە ئەکەن! خوایە ناشوکریت ناکەم، بە بەشت ڕازیم، بەڵام چی ئەبوو ئەگەر لەبەرچاو خەڵق نەختێ قابل قەبووڵتر خەلقمت بکردایا، ئەوەندە بە قیزوبێزەوە سەیریان نەکردبام.

دەست ئەکا بە گریان و دیسانەوە سەر ئەنێتە سەر ئەژنۆی.

ئاوەکە هەروا بە خەسار ئەڕوا.

کابرایەکی سوار لە دوورەوە پەیدا ئەبێ کە بەرەو ئەو دێ.

کابرا نزیکەوە ئەبێ و لە تەقەی سمی چارواکەی، کابرا نالەبار سەر بەرز ئەکاتەوە و لە ترسی ئەوەی کە ئەمیش قیزوبێزی لێ نەکا،

سەری ئەنێتەوە سەر ئەژنۆی.

کابرا هێواش هێواش نزیکەوە ئەبێ و لەبان سەر کابرای ناشیرینەوە ئەوێستێ.

سوار: ماندوو نەبی کاکە گیان.

کابرا: (سەر بەئەژنۆ) خۆت ماندوو نەبی!

سوار: ببوورە بەڕێز، ئەم ئاوە بۆ خواردنەوە ئەبێ؟

کابرا: (هەر بەو شێوە) بەڵێ ئەبێ.

سوار: ببوورە بەڕێز، من هەردوو پێم نوقسانن و زۆر بەسەختی سوار بووم. ئەگەر ئەکرێ ئەم مەشکە چکۆلەمە بۆ پڕ کە لە ئاو، ڕێگایەکی دوورم لەبەرایە، سەوابت ئەگا.

کابرا سەر بۆ سوارەکە بەرز ئەکاتەوە، سوارەکە زۆر بەمەحەبەتەوە تەماشای ئەکا و مەشکەکەی بۆ رادەگرێ.

کابرا: (تەماشایەکی ناوچاوی سوارەکە ئەکا) چاک تەماشام کە، ئەگەر قیزت لێم ناشێوێتەوە سەرچاو بۆتی پڕ ئەکەم.

سوار: قیزم لە چی بشێوێتەوە؟!

کابرا: چووزانم؟ لە روومەتم، لە دەست و دەموچاوم؟!

سوار: (تەماشای ئەکا) بەڵام من عەیبێ لە تۆدا نابینم کە باعێسی قیزەوکردن بێ، بەقوربان! بۆمی پڕ کە ئەتنێمە سەر چاوم و زۆر مەمنوونت ئەبم.

کابرا: تۆ خوا بەڕاستە؟ تۆ هیچ عەیبێ لە مندا نابینی؟!

سوار: نەوەڵا، عەیبت چییە؟!

کابرا: دە باشە، بیدە با بۆتی پڕ کەم.

سوار مەشکەکەی پێ ئەدا.

ئەویش ئەیداتە بەر ئاوەکە و پڕی ئەکا و ئەیداتەوە بە دەست سوارەکەوە.

سوار: ئەی یارەبی دەستت خۆش بێ برا! زۆر ئەترسام کەس نەبینم و ناچار بم هەتا ئەگەمە بەرەو، ئەم ڕێگایە بە تینوویی تەی کەم. زۆر مەمنوونی تۆم! (ماچی مەشکەکە ئەکاتەوە).

کابرا: ئەی چۆن بازێ کەس قیزم لێ ئەکەن و بە نەگبەتم ئەزانن؟!

سوار: وەڵا چی بڵێم؟ نازانم، ئەگەر ئاوا کەسانێ هەبن، حەتم چاوی بەسیرەتیان کوێرە، لە چاوی مندا، تۆ بێ عەیبی! خوداحافیزا!

کابرا: خودات لەگەڵ.

کابرا ئەکەوێتە ڕێگە و ئەچێ.

کابرای نالەبار ئەچێتە نێو فکرەوە و دیسان لەسەر ڕێگاکەی دادەنیشێ.

ئاوەکە هەروا بە بەردەمیا ئەڕوا و ئەویش تەماشای ئەکا.

خوەرەتاو بەرەو نیشتن ئەڕوا کە دەنگی کەنین و زەقینی لە دوورەوە بەر گوێ ئەگا و کابرا سەری بەرەو لای دەنگەکە بەرز ئەکاتەوە.

خان و هاوڕێکانی نەچیرێکی زۆریان کردووە و داویانە بە کۆڵ ئەسپەکاندا و بە شادی و پێکەنین خەریکن بچنەوە بۆ عەمارەت و ماڵی خۆیان.

کابرا هەڵدەستێ، دیسان ناوڕێ لە خان ئەگرێ.

کابرا: ماندوو نەبی گەورەم. (ڕوو لە هەموویان) ماندوو نەبن.

هەموو ئەوێستن و تەماشای یەک ئەکەن.

خان: زۆر مەمنوون.

کابرا: راوی باشتان کرد قوربان؟

خان: بەڵێ وەڵا، ئەی چۆن؟ تەماشا کە زیاتر لە ٤ بەران ٢ و ئاسک و ٢٠ دانە کەوی دەری.

کابرا: ئەنشائەڵا بە نۆ شی گیانتان بێ، زۆر دڵنیگەران بووم.

خان: دڵنیگەرانی چی؟

کابرا: دڵنیگەرانی ئەوەی نەگبەتی وجوودی من باعیس بووبێ، هیچ راو و نەچیرێ نەیتە سەر ڕێتان، خۆ وا نەبوو؟

خان: نەوەڵا.

کابرا: زۆر خۆشحاڵم کە وا نەبوو، چونکوو بەیانی فەرموودەی خۆتان بوو کە ئەمڕۆ نەگبەتیی وجوودی من ناهێڵێ ڕۆژێکی خۆشتان بێ و هیچ دەسکەوتێکتان نابێ!

خان: نە، ئەبینی! زۆر باش بوو، زۆر ڕۆژێکی خۆش بوو و زۆریش خۆشمان لێ گوزەشت!

کابرا: بەڵام بۆ من ڕۆژێکی زۆر سەخت و پیس بوو گەورەم! ڕۆژێکی تاڵ کە تەنانەت بۆم نەکرا و دەست و دڵی ئەوەم بۆ نەما زەویوزارەکەم ئاویاری کەم، سەرتاسەری ئەمڕۆ لەو گۆسەو بەشم گریان بوو!

خان تەماشای ناوچاوی ئەکا.

کابرا: جا ئێستا مەردومەردانە خۆت بڵێ، ئەمڕۆ دیداری ڕوومەتی من بۆ تۆ نەگەبەتبار بوو یا دیداری تۆ بۆ من؟!

هاوڕێکان تەماشای یەکتر ئەکەن.

خان ئەیەوێ شتێ بڵێ، بەڵام بۆی ناوترێ. سەری ئەخاتە خوار لەبەردەم کابرا ڕەت ئەبێ.

هاوڕێکانیشی هەر بەو شێوە سەرلەخوار و خەجاڵەتبار بە شوێن خانا ئەڕۆن.

# بێ دەسەڵات*

پرسۆناژ:

- پیرەپیاوی باوك.
- پیرەژنی دایك.
- کچی گەورە.
- شووی کچی گەورە.
- کچی چکۆلە.
- منداڵی بەربێشکە و کۆرپە.
- گرووپی چەند کەسیی وەوی بارانی (بووکە بارانێ).

پیرەپیاو لەژێر کورسیدا نووستووە.

ژنەکەی لە درگا دێتەماڵەوە.

تەماشایەک شووەکەی ئەکا.

کابرا بێ خەیاڵ نووستووە.

ژن: نزیک نیوەڕۆە پیاوەکە، ئەم هەموو خەوە بۆ چییە؟

پیاو: نەخەوم چی بکەم؟ پەنجا ساڵ هەستان و پەنجا ساڵ ڕەنج و زەحمەت بەس نییە؟!

خواوراسانیش بێتە سەر حەساب، ئیدی نۆبەی نووستنە!

ژن: نە وا نییە، نۆبەی نووستنی حەقیقی ها بەڕێوە و هەزاران ساڵ فرسەتی خەوت بۆ دابین کراوە، بەلام ئێستا زیندووی و ئێمە دوو کچمان لە ماڵاندان، کە یەک ساڵە لێیان بێ خەبەرین!

پیاو: ئەڵێی چی بکەم؟

ژن: هەستە کۆپان کەرەکەت کە و سوار بە و برۆ بۆ ماڵیان.

پیاو: ئەی بابا! جۆرێ فەرمایش ئەکەی، ئەڵێی ماڵی هەردووکیان دوو کۆڵان ژوورتر لە ماڵی خۆمانە!

ژن: نە هەردووکیان ئاواییەک پێمانەوە دوورن، بەلام لەم نزیکەو نەورۆزەدا چاوەڕێی باوک و باوانن، هەستە برۆ، یەک رۆژ ڕێگایە.

نەختێ سەر و سەوقاتم بۆیان داناوە، بۆیان بەرە و یەک شەوێ بەلایانەوە دانیشە و وەزع و حاڵیان بپرسە و خۆشی و ناخۆشییان بزانە باکوو پیاوەکانیان تانە و تەشەری بێ کەسییان لێ نەدەن! هەستە! تۆ باوکی ئەو کچانەی و ئەوانیش ئەولادی تۆن!

پیاو: (راستەوە ئەبێ) لای لاهە ئیلەڵاە!

## سکانسی دووەم:

رۆژ دەشت- بیابان.

پیاو بە سواری کەر رێبوارە و بەئارامی بەدەم رێوە هۆرە ئەکا.

پیاو: (بە هۆرە) جەوەڵ جەوەڵەکان وەجوانی دیمان... جەوەڵان باقی ئێمە پیر بیمان.

زۆرمان نەماوە جێماو لە خێڵین.. ئێمەش وەک یاران بەجێی بهێڵین.

لە ٣ پلان عبوور دەکا.

## سکانسی سێیەم:

شەو ماڵی کچی گەورە

پیرەپیاو لەگەڵ کچەکەی و زاواکەی لە ماڵ دانیشتوون.

زاوا: یارەبی بەخێر بێی، پا و پێڵاوت وەبان چاوانمان، بەڵام سەد خۆزگا دایە حەسیبەیشت لەگەڵ خۆتا باوردای!

پیاو: ماڵت رەببی ئاوا بێ کورم! ئەو ژانە پێی هەیە و تەوانی رێکەوتی نەماوە، منیش بەزۆر کەرەکەم هاتووم ئەگەر نەبوای نەمئەتوانی.

کچ: یارەبی بەخێر بێی بابە گیان، چاوم بە دیدارت روون بوو، زەحمەتت کێشا!

هەورەتریشقە لێ دەدا.

زاوا: (بەترسەوە) ئەی ماڵی وێرانم!

هەڵئەستێ و خێرا دەچێتە دەرێ.

کچ: منیش دێم لەگەڵت؟

زاوا: پێویست ناکا تۆ لە لای بابت دانیشە.

پیاو: چی بووە رۆڵە؟! بۆ وا نگەران بوون؟

کچ : دوعای خێرمان بۆ بکە باران نەبارێ بابە گیان! بێت و بباری، دەسرەنجی یەک ساڵمان ئەبێ بە هیچ و پووچ و لەبرسا ئەمرین!

پیاو: بۆ؟

کچ: تەواو سەرمایەی دەسرەنجی ئەمساڵمان سازکردنی ئەو هەموو دیزە و گۆزەسە کە لە حەساردا چوونەتە کۆڵ یەک. ئەگەر باران بباری هەمووی ئەکا بە قوڕ و ژیانمان تێک ئەدا، دوعای خێرمان بۆ بکە بابە گیان، دۆعای خێرمان بۆ بکە!

پیاو: ئیشەڵڵا خوا ئەوەی خێرە بیکا رۆڵە! ئیشەڵڵا، هەموو شتێ بە مەیلی ئێوە دێ!

هەورەتریشقە و دڵنگەرانیی کچ.

پیاو تەماشای کچەکەی ئەکا و سەر دادەخا.

## رۆژێکی دیکە

## سکانسی چوارەم:

ڕۆژ- ئاوایی

چەند کوڕ و کچ بە شوێن بووکەبارانێوەن.

پیاو بە سواری کەرەکەی بەنێو دێدا ئەڕوا و بۆ تەماشاکردن ئەو خەڵکە ڕائەوێستێ.

## سکانسی پێنجەم:

شەو ماڵی کچی چکۆلە

کچی دووەم، خەریکی جواندنی لانکی کوڕەکەیەتی.

دروشمی بووکەبارانێ:

بووکە بارانێ

ڕەبی بباریێ

بووکەبارانێ

ڕەبی بباریێ

پیاو: دەی ڕۆڵە پێم بڵێ بزانم، ژیان چۆن بەسەر ئەبەن و ئێستا مێردەکەت لە کوێیە؟

کچی دووەم: وەڵا بڵێم چی بابە گیان! ژیانمان زۆر سەخت بەڕێوە ئەچێ، ئیمساڵ سەرانسەر لەو کەمەرە سەختەزەویی دەیمان کێڵاوە و تۆوێکی قرزی زۆرمان وەشاندووە و بە هەزار شێوی دڵەڕاوکێ و مەترسییەوە، چاوەڕێی بارانین! بێت و لەم دوو سێ ڕۆژەدا نەبارێ،

تـەواو ئـەو تـۆ و بەرەکەتـی داومانـە بـە عەرزەکـە، ئەسـووتێن و ڕۆژمـان ئەبـێ بـە تاریکەشـەو.

مەحـز لەئیـلا دوعـای خێرمـان بـۆ بکە، بارانێکـی باش ببـارێ و بەرەکەت ببـا بـە ئەو هەمـوو ڕەنـج و زەحمەتەمان!

پیـاو ئەکەوێتـە بیـری قسـەی کچەکـەی تـری و سـەحنە فلاشـبەگ ئەکـرێ. کابـرا نازانـێ چـی بڵـێ و چـۆن دوعـای خێـرێ بـکات.

پیـاو: وەڵا چـی بڵێـم کچم! لە خوا ئەپاڕێـمەوە ئەوەی خاسـەیە بۆتانی بـکات، مـن چیـم لـە دەس دێ؟! نەتـوت مێردەکـەت لـە کوێیـە ڕۆڵە؟

کچـی دووەم: وەڵا چیـت لـێ بشـارمەوە بابـە گیـان، لـەم نزیکـەو نـەورۆزەدا هیچـمان بـۆ نەمـاوە، تەنانـەت ئـاردی کەنووەکەمـان بـەرەو تەواوبوونـە! دە پـازدە ڕۆژێکـە چووەتـە یارمەتیـی دارشـکاندنی ئاوایـی ژووروو، بەڵکـوو تـا شـەوی نـەورۆز کاری تـەواو بـێ و بێتـەوە!

پیـاو: خـوا لێـی ڕازی بـێ و قەلبـی سـاق بـێ ئیشـەڵا! ئـەوە منیـش نەختـێ کەلوپەلـی ناقابلـم لـە لایـەن دایکتـەوە بـۆ هێنـاوی ڕۆڵـە.

کچـی دووەم: دەسـتت خـۆش بـێ بابـە گیـان، دەسـتی دایکیشـم خـۆش بـێ، ڕازی بـە زەحمەتـی ئێـوە نەبـووم.

پیـاو: زەحمـەت نییـە ڕۆڵـە، پێشکەشـیی دایـک و بـاوک ڕەحمەتـە بـۆ هـەردوو لا. خـۆزگا بایـا و زیاتـر یارمەتیـی ئێـوەم بدایـا، بـەڵام دەسـی شـکاو، وەباڵـی گـەردن! چـی بکـەم بـە دەستەوسـانی و بـێ دەسـەڵاتی؟!

## ڕۆژێکی دیکە:

پیاو بە سواری کەرەکەی ڕێگەی گەڕانەوەی گرتووەتە بەر.

پیاو: (هۆرە) «هەی دا، هەی بێدا، دەردم تاوتاوە... ساتێکم لەرزە و ساتێکم یاوە.

هەی دا هەی بێدا، لەم دەورە دیلە... هەر دیلێ بە دەس دیلێ زەلیلە».

## شەوماڵی خۆی

ژن: یارەبی بەخێر بێیتەوە! حەسابی ماندوو بووی، ئەرێ؟

پیاو: کورە نەوەڵا، ماندووی چی؟ ئەگەریش نەختێ ماندوو بووبێتم بە بینینی منداڵەکانم لە لەشم دەرچوو، بەڵام...

ژن: بەڵام چی؟

پیاو: بەڵام نەمتوانی هیچ کارێکیان بۆ بکەم، تەنانەت دوعای خێرێکی پڕبەدڵ و حسابی!

ژن: چۆن، بۆ نەتتوانی؟!

پیاو: چی بڵێم ژنەکە؟ هەردوو موشکڵەیان لەگەڵ باران بوو! یەکێکیان داوای دوعای خێری بارینی بارانی لێم دەکرد، ئەوەکەی تر، دوعای نەهاتنی باران! ئەگەر بباریێ یەکیان خۆشبەخت ئەبێ و ئەوەکەی تر بەدبەخت، ئەگەریش نەباریێ هەروەها. منیش هەرچی فکرم لێ کردەوە بەو نەتیجە گەیشتم کە جگە لە خودای مەزن کە خۆی زامنی رزق و رۆزیی هەمووانە، ئەم گرەکوێرەی بە کەس ناکرێتەوە، تەنیا خوایە کە ئاگادارە و ئەزانێ ئەبێ چی بکات! دوعای منیش هەر ئەمە بوو کە: ئەوەی خاسە خوا بیکات بۆتان!

* حەکایەتی ناوچەی لەیلاخی سنە

# ڕێگای ئەمن

پرسۆناژ:

- سواری جەوانمەرد.
- دزی ناجەوانمەرد.
- یەك چاروا.

کابـرای دز لەپشـت بەردێکـەوە لەسـەر ڕێگایەکـی کوێسـتانی خـۆی شـاردووەتەوە و قاچکـی هەڵکـردووە و جـار بەجـار تەماشـای ئەوسـەری ڕێگاکـە ئـەکات.

دوای ماوەیەک کابرایەک بە سواری ئەسپێک دیاری ئەدا.

تـا چـاوی دز بـە سـوارەکە ئەکـەوێ بـە سـوژنێک ئەکوتـێ بەسـەر قاچـی خۆیـا و قەترەیـەک خوێـن لـە کونـای سـوژنەکەوە دێتـە دەرێ و سـوژنی دووەمیـش ئەکوتـێ بـە شـان زامـەکا و ئەبـێ بـە دوو کـون و بـە قامکێـک خوێنەکـە ئەساوێ بـە دەوروبـەری کونـەکا و خـۆی ئەکوتـێ بـە عـەرزا و دەسـماڵەکەی دەوری سـەری ئەپێچـێ بـە قۆڵیـا و لەسـەر عەرەزەکـە خۆی بـە نـک و ناڵـە و گریانـەوە ئەتلێنێتـەوە.

کابـرای سـوار لـەدوورەوە چـاوی پـێ ئەکـەوێ و وێزنگـێ ئەکوتـێ بەژێـر زگ چارواکەیـا و بـە غـار بـەرەو دزەکـە دێـت.

لە شانییەوە لە چارواکەی دائەبەزێ.

سوار: چیتە، چی قەوماوە کاکە؟

دز: مار، مار، مەحز رەزای خودا بمگەیەنە ئاواییەک.

سوار: کامە بزانم؟

دزەکـە دەسـماڵەکە بـە تلخواردنـەوە لا ئەبـا، سـوارەکە چـاوی بـە زامەکـەی ئەکـەوێ.

سوارە: بەڵێ وەڵا، جێی نێشی مارە! بتبەم بۆ کام ئاوایی حەکیمی تێدابێ؟

دز: هەوەڵین ئاوایی سەری رێگەکەت، حەکیمی باشی لێیە.

سوار: هەستە، هەستە تا دێر نەبووە، بتگەیەنم، هەستە!

دزەکە بە یارمەتیی سوارەکە سواری چارواکە ئەبێ و خۆی لار ئەکاتەو مل زینەکا.

کابرای سوار لەغاوی چارواکە رائەکێشێ و بە راکردن ئەکەوێتە بەر و چاروا بە شوێن خۆیا رائەکێشێ و لە چەند (پلان) بەو شێوە دەرئەچێ.

نزیک کانیی ئاواییەک ئەبنەوە.

دزەکە: مەحز رەزای خودا سووتام، نەختێ ئاوم پێ بگەیەنە. سووتام، برژام، دەروونم بوو بە کەباب.

سوار: مارگەزیدە نابێ ئاو بخواتەوە، راوەستە تا ئەتبەمە ئاواییەوە!

دز: بۆ خاتری خودا، قەیدی نییە، تەنیا نەختێ کە بیتکێنمە سەر لێوم، سووتام، تۆ بیت و خودا نەختێ تەنیا نەختێ ئا لەو ئاوە.

سوار: سوێندم مەدە کاکە، ئاو بۆت باش نییە!

دز: قەیدی نییە، بە توون ئەگەر بمرم، تۆ بی و خودا، لێم درێغ مەکە.

سوار: باشە کاکە باشە، بەڵام وتبێتم، نابێ ئاو بخۆیتەوە!

دز: قەیدی نییە، سوار هەنکە هەنک ئەوێستێ، لە تەرکی چارواکەی پیاڵەیەک دەردێنێ.

دز: (بە ئیشارەی قامک) سەرچاوەکەی ئەو ئاوە ئەوەتە لەو ژوورە،

بیووره تو خودا!

سوار: باشه بۆت دێنم، بەڵام کەم بخۆ!

دز: باشه.

سوار لەغاو چارواکە بەرئەدا و بە پیاڵەکەوە ئەچێ بەرەو کانیاوەکە و چەند قەدەمێ لە ئەسپەکەی دوور ئەکەوێتەوە.

کابرای دز خێرا وێزنگێ لەژێر زگ ئەسپەکە ئەکوتێ و بە هەیاهوو ئەیرفێنێ.

سوارەکە لا ئەکاتەو، چاوی بە دەرچوونی دزەکە ئەکەوێ. حەیرەتزەدە ئەبێ.

سوار: ئەی دزی ناجەوانمەردی بەدزات!

بە شوێن چارواکا دەرئەچێ.

سوار: (بەدەم ڕاکردنەوە) ڕاوێستە کاکە، ڕاوێستە، ئەو چاروا بۆ تۆ نادرزێ، ڕاوێستە!

دزەکە توندتر لە چارواکە ئەخوڕێ، دوور ئەکەوێتەوە.

کابرای سوار خۆی ئەگەیەنێتە سەر تەپۆڵکەیەکی بەرز و تەماشای دەرچووونی دزەکە ئەکا.

سوار: کە ڕاناوێستی ها، ئێستا پێت حاڵی دەکەم.

قامک ئەنێتە دەمی و ۳ جار بە شوێن چارواکا فیکە ئەکێشێ.

چاروکە ئەچێتە سەر پاشوو و بە حیلاندن کابرای دز هەڵدەگرێ و بەرەو ساحێبەکەی دێتەوە و دزەکە بە شەلە شەل دەردەچێ.

ساحێب چاروا سواری چارواکەی ئەبێ و بە غار ئەکەوێتە شوێن دزەکە. دوای ماوەیەک ئەگاتە بان دزەکە و چەند جار پێی ئەڵێ،

ڕاوەستە، کارم پێتەوە نییە، ڕاوێستە تەنیا دوو قسەت لەگەڵ ئەکەم، دزەکە جواب ناداتەوە و هەر دەردەچێ.

کابرای سوار لەسەر ئەسپەکەیەوە خۆی فڕک ئەدا بە مل دزەکا و ئەیکوتێ بە عەرزا و لەسەر سنگی دادەنیشێ.

دز: وێڵم کە، بەرم دە.

سوار: ئەگەر گوێ بە قسەکانم بەی، هەم بەرت ئەدەم، هەم وێڵت دەکەم، هەم چارواکەمت پێ ئەدەم، بەڵام ئەگەر گوێ بە قسەم نەدەی، خوێنت ئەڕژێنم و خۆم ئەبم بە ماری ژیانت، تێ گەیشتی!

دزە: باشە باش، قەوڵ ئەدەم گوێت لێ گرم و دەرنەچم، هەستە لەسەر سنگم، خەریکم ئەخنکێم!

سوار هەڵئەستێ.

دەستی ئەگرێ و ئەکێشێ بۆ لای چارواکەی.

سوار: کاری وات بۆ کرد؟

دز: هەرکەس لەم دنیایە بۆ خۆی ئیش و کارێکی هەیە، ئیش و کاری منیش ئەمەیە.

سوار: یانی دزیی ناجەوانمەردانەیە؟!

دز: هن! بۆ دزیی جەوانمەردانەشمان هەیە؟!

لە هەموو کارێکدا مەردی و نامەردی هەیە، ئەم کارەی تۆ زۆر نامەردی بوو.

دز: دزیی مەردانە ئەبێ چۆن بێ؟ بڵێ، بەڵکوو فێر بووم و لەمەوە بەدوا دزیی جەوانمەردنەم کرد!

سوار: دزیی جەوانمەردانە ئەوەیە کە لە دارا و دەوڵەمەند بدزی،

بـەڵام یارمەتیـدەری ئینسـانی فەقیـر و هـەژار بـێ!

دزیـی جەوانەمەردانـە ئەوەیـە کـە لـە دز بـدزی و خەرجیـی ئینسـانی دروسـتی بکـەی! دزیـی جەوانمەردانـە ئەوەیـە کـە دزیـی خـۆت نەنێیتـە مـل خەڵـک و ئەگـەر ئینسـانێکی بـێ گونـای پێـوە تلیـا، وەکـوو پیـاو بـە هـەر شـێوەیەک کـە ئەکـرێ، ددان بنێـی بـە کاری خۆتـا و ئـەو شەخسـە نەجـات دەی لـە گیروگرفـت، دزیـی جەوانمەردانـە ئەوەیـە کـە لـەو ئیشـەی تـۆ هەمـووان دوچـاری زەرەر و زیـان نەبـن!

هـا (لەغـاو چاروِاکـە ئـەدا بـە دەس دزەکـەوە) ئەمـە چاروِاکـەی مـن ئەیـدەم بـە تـۆ، بـەڵام بـە یـەک شـەرت.

دز: شەرتی چی؟

سـوار: بـەو شـەرتەی ئـەو کارەی لەگـەڵ مـن کـردت ئیـدی نەیکـەی و ئـەم بەسـەرهاتە لای کـەس بـاس نەکـەی.

دز: بۆ؟ ئەگەر باسی کەم چی دەبێ؟

سـوار: ئەگـەر باسـی بکـەی تـۆوی مـەردی و مەردانەگـی و کۆمـەک و یارمەتیـی خەڵکـی هـەژار و دامـاو کـە بـە حەقیقـەت نیازمەنـدی یارمەتـی بـن، لـەم جادەیـە ئەبـڕێ و ئەگـەر رۆژێـک یەکـێ بـە حەقیقـەت مـار پێوەی بـا، ئیـدی کـەس یارمەتیـی نـادا و وا ئەزانـن ئەویـش دزێکـی وەک تـۆوە!

دزەکە ئەڕوانێ بە ناو چاو سوارەکا و ئەچێتە نێو فکرەوە.

سوار: جا ئێستا بیبە و بڕۆ، بەڵام ئەو قەوڵەم پێ بدە.

دز: (دوای نەختـێ تەماشـا) قـەول ئـەدەم، قەوڵـی پیاوەتـی کـە ئیـدی تکـرارەوە نەبـێ.

سوار: دە باشە بیبە و بڕۆ، ئیدی چاروای تۆیە.

کابـرای دز لەغـاوی چارواکـە ئەگـرێ و بـە شـوێن خۆیـا ئەیکێشـێ و ئەکەوێتــە رێ.

سـوارەکە لەسـەر بـەردێ دادەنیشـێ و بـە شـێلانی دەسـت و پێـی خـۆی ئەختێ ماندوویـی دەردکا.

دزەکە لە پێچێ رەت ئەبێ و لە چاو ون ئەبێ.

کابـرای سـوار هەڵئەسـتێ و خـۆی ئەگەیەنێتـە سـەر جۆگـە ئـاوێ و چەنـد مشـت ئـاو ئـەدا بـە دەموچاویـەوە.

دوایی دێتەوە سەر ڕێگەکە و بە پێی پیادە ئەکەوێتە ڕێ.

ئەگاتـە سـەر پێچەکـە و ئەچـێ بەودیـوا، ئەبینـێ چارواکـەی لـە سـەر ڕێگاکـە بەسـتراوەتەوە و کابـرای دز دوورەوە کەوتـووە و ئەچـێ.

سـوار ئەڕوانـێ بـە شـوێنیا و وەک ڕەزامەندیـی زەردەیـەک دەکەوێتـە سـەر لێـوی و لەغـاو چارواکـەی دەگـرێ و بـە شـوێن خۆیـا ئەیکێشـێ و دوور ئەکەوێتــەوە.

# نۆکەری بایجان

پرسۆناژ:

- خان
- کازم خان
- ئاشەوان (چێشت لێنەر)ی زکزل و سمێڵ چەخماخی
- نۆکەر

خـان لەگـەڵ دۆسـتێكی خەریـک گفتوگۆیـە و لەنێـو باخـدا كەوتوونەتـە ڕێ.

ئاشـەوان باشـی بـە زكـی زلییـە و نانیشـان لـە كۆڵ، لـە مەتبـەخ دێتـە دەرێ، نانیشـانە پـەڕ لـە سـەوزیجاتەكەی لـە گۆشـەیەكەوە دادەنـێ.

ئەكەوێتە ڕێ بچێتە نێو مەتبەخ، خان بانگی دەكا.

خان: ماندوو نەبی ئاشەوان باشی!

ئاشەوان: سڵاو گەورەم، ڕۆژتان باش!

خـان: ڕۆژی تۆیـش بـاش! (ڕوو لـە دۆسـتەكەی) ئـەم ئاشـەوانەی ئێمـە لـە كاری خۆیـدا بـێ وێنەیـە، كازم خـان!

كازم خان: زۆر باشە، ئاشەوانی باش وەک ژنی باش وایە!

ئاشەوان نەختێ بەم قسەیە تێک دەچێ و سمێڵی شۆڕەوە ئەبێ!

خان: ئەمڕۆ چیمان هەیە بۆ نیوەڕۆ؟

ئاشەوان: ئەمڕۆ ئاش (شۆرباو)ی بایجانمان هەیە گەورەم.

خـان: بـەه بـەه! بـەه بـەه! ئاشـی بایجـان! مـن زۆرم حـەز لـە بایجانـە و قـەد تێـری لـێ ناخـۆم!

ئاشــەوان: بایجـان خۆراكێكـی زۆر خـۆش و پـڕ قوەتــە و بـۆ هەمـوو جێگایەكـی لــەش باشــە و خواردنــی زۆر ســووک و ئاســاییە گــەورەم،

بایجـان شـای تـەواو خۆراکەکانـە و باشـتر لـە بایجـان لـە عالەمـا نییـە.

خان: بەڵێ وایە، دە باشە کاکی خۆم برۆ بزانم چیمان بۆ دەکەی.

ئاشەوان سەر چاو.

تەعزیمێ ئەکا و ئەچێتە نێو مەتبەخەوە.

خان لەگەڵ دۆستەکەی بە گەپ لێدان ئەچێ.

خان: بەیانی بڕۆیی، ئینشەڵا بۆ کەی دێتەوە؟

کازم خـان: تەنیـا هاتوچۆکـەی لێـرەوە بـۆ تـاران چـل رۆژ ئەخایەنـێ، جـا چەنـد رۆژێـش لـەوێ بمێنمـەوە، ئـەوە ئیـدی خـودا ئەیزانـێ.

خان: وایە، خێریەت ئینشەڵا، پێم وایە ٢ مانگێ لە سەفەردای!

کازم: بەڵێ وایە ٢ مانگم پێ دەچێ.

دوورەوە ئەکەون.

چەند دیمەنێک لە باخ و باخات و لەوەڕگە نەشان ئەدرێ.

خان لە هەیوان دانیشتووە و تەماشای گوڵەکانی باخ دەکا.

نۆکەرێک بە ڕاکردن دێت بەرەو خان.

خان تەماشا ئەکا.

نۆکەر: (بە هەنسکە هەنسک) قوربان مزگێنی!

خان: خۆش خەبەر بی ها! چی قەوماوە؟

نۆکەر: قوربان کازم خان کازم خان، لە سەفەر هاتوونەتەو!

خان: (خۆشحاڵ) تۆ خوا بەڕاستە؟!

نۆکـەر: بەڵــێ قوربـان، ئەوەتـە لـە بـەر تەویلـە، خەریـک بارخسـتن و چاوەدێریـی تاقەتـی چارواکانییـە!

خان: دە باشە زوو برۆ بۆ یارمەتیدانی، ئەوە خۆشم هاتم.

نۆکەر: سەرچاو. (ئەچێ)

خان بە خۆشحاڵێ هەلدەستێ و ئەچێ بەرەو پیری کازم خان.

لە باخی حەوشەکەدا کازم خانیش بەرەو خان دێ و باوەش بە یەکدا ئەکەن.

خان: ئای! بەوەڵا ئەوەندە پڕ بەتاسە دڵنگەرانی هاتنەوەت بووم کە تەنیا خودا ئەیزانێ! یا ڕەبی بەخەیر بێیتەوە!

کازم: منیش پڕ بەدڵ کەیلی تاسەت بووم و ئەتوانم بڵێم، ئەم ۲ مانگەم بە دووسەد ساڵ لێ تەواو بوو!

خان: بڕۆین بڕۆین کە نیوەڕۆە و ئەزانم هەم زۆر ماندووی و هەم زۆر برسی، دوایی کە ماندوویت دەرچوو، جا قسەی سەفەرەکەتم بۆ دەکەی، بڕۆین.

هەردوو ئەکەونە ڕێ بەرەو ماڵ و ئاشەوان بە بۆن کارەکەیەو لە مەتبەخ دێتە دەر و چاوی بە خان ئەکەوێ.

ئاشەوان: سلام عەرز دەکەم قوربان.

خان: وەعەلەیکمەسەلام.

ئاشەوان: ڕەبی بەخەیر بێیتەوە کازم خان.

کازم: خۆش بی!

خان: ئەورۆ نیوەڕۆ چیمان هەیە ئاشەوان باشی؟!

ئاشەوان: وەڵا قوربان وەکوو هەمیشە شۆرباوی بایجان!

خان: شۆرباوی بایجان؟!

ئاشەوان: بەڵێ قوربان.

خان: تەححح! یەک جار غەڵەتێکم کرد (زمانم سووتا) و بە تۆم وت حەز لە بایجان ئەکەم... لەبیرتە کازم خان؟!

کازم: بەڵێ وەڵا! من لەگەڵت بووم!

خان: لەو ڕۆژەوە تاکوو ئێستا ئەوەندە بایجانی داوەتە دەرخواردم، وەختە ببمە بایجان! (ڕوو لە ئاشەوان) ئاخر بایجان چییە؟!

ئاشەوان: بەڵێ وەڵا قوربان، بایجان شتێکی باش نییە! بایجان هەر بایە و لەنێو زکدا تەم دەخواتەوە و ئەبێ بە ژان و پێچ، هیچ کەڵکێکی بۆ لەش نییە هەر وەسە شتێ هیچت نەخواردبێ!

خان: گوێت لێیە کازم خان؟! دێتەوە بیرت، ئەو ڕۆژە تا وتم، بایجان شتێکی باشە، چەند تاریف و تەمجیدی لە بایجان و قوەتی بایجان کرد؟!

کازم: بەڵێ وەڵا، تەنانەت دێتەوە بیرم وتی: بایجان، شای تەواو خۆراکەکانە!

خان: ئەوە چۆنە هەر شتێ من ئەڵێم باشە، تۆ یەک ساعەت تاریفی لێوە ئەکەی و هەر شتێ ئەڵێم باش نییە، لێوە بە خراپ ئەدوێی؟

ئاشەوان: بەڵێ وایە گەورەم.

خان: بۆ؟!

ئاشەوان: بۆ ئەوەی من نۆکەری تۆم قوربان، نە نۆکەری بایجان!

خان تەماشایەک کازم خان ئەکا و کازم خان بەزەردەخەنەوە ئەڵێ: ڕاس دەکا!

# عەدالەتی جوان

پرسۆناژ:

- سوڵتان
- خان
- رەعیەتی
- ساڵح
- دایە ڕێحان (پیرەژن)
- خەڵکی زۆر

سـولْتان لەسـەر كورسـى دانيشـتووە و خەڵكێكـى زۆر، دەورەيـان لــێ داوە.

خـان: يـا ڕەبـى بەخێـر بێى جەنابى سـولْتان، سـەروماڵى خـۆم و تەواوى ئـەم كەسـانە كـە هەمـوو ڕەعيەتـى منن ئەكـەم بە فـەداى قەدەمت!

سـولْتان: سـپاس، سـپاس (تەماشـاى كابرايـەک ئـەكا) پێـم وايـى ئـەو دوو شـەكە وا لـە بـەر پامـا قوربانـى كـرا، هـى تـۆ بـوون، وايـە؟

پياو: بەڵێ قوربان، ئەو دوو شەكە هى من بوون.

خان: ئەو دوو گايشە من فەداى سەرى ئێوەم كرد.

سولْتان: (روو لە پياو) چەند سەر ئاژەڵت هەيە؟

پيـاو: بەسـايەى سـەر جەنابتـەوە وەزعـم خـراپ نييـە، پەنجـا شەسـت سـەر ئاژەڵـم هەيـە.

سولْتان: شوكر شوكر (يەک كيسە پارەى بۆ فڕێ ئەدا)

پياو: (ئەيگرێتەوە) زۆر سپاسى گەورەييت ئەكەم!

خـان: دەسـتت خـۆش بـێ يـا ڕەبـى، ئـەو دوو گايشـە لەنـاو گاكانمـا تـەک بـوون، فـەداى قەدەمـت كـران.

سـولْتان: ژنێكـم بينـى كەڵەشـێرێكى لەبـەر پێمـا سـەربڕى، ئـەو ژنـە لێـرە نييـە؟

خـان: بەڵـێ بەڵـێ وایـە، دایـە ڕێحـان، دایـە رێحانـی پـێ ئەڵێـن، پیرەژنێکـی هـەژارە قوربـان!

سوڵتان: لێرە نییە؟

خان: (ڕوو لە خەڵک) دایە ڕێحان لێرە نییە؟

خەڵک: نە، دایە ڕێحان نەهاتووە، نییە لێرە.

خان: نییە قوربان نەهاتووە.

سوڵتان: یەکێ بنێرە شوێنی!

خان: (ڕوو لە جەماعەت) ئەهای ساڵح!

ساڵح: بەڵێ قوربان؟

خان: بە ڕێکردن بڕۆ و دایە ڕێحان پەیدا بکە و بیهێنە بۆ ئێرە!

ساڵح: سەرچاو (ئەچێ)

سـوڵتان: جـا ئێسـتا پێـم بڵـێ بزانـم، خـۆت چەنـد سـەر ئاژەڵـت هەیـە جەنابـی خـان؟

خان: خۆم قوربان؟ وردە ئاژەڵ یان ئاژەڵی دروشت (ڕەشەوڵاخ)؟

سوڵتان: هەردوو؟

خـان: وردە ئـاژەڵ نازانـم، بـەڵام ٤ شـوانیان هەیـە، ئەممـا ماڵاتـی دروشـت، دەوری ۸۰ سـەرێ گا و مانگامـان بـە سـایەی سـەر سـوڵتانەوە هەیـە.

سوڵتان: زۆر باشە (یەک کیسە زێڕی پێ ئەدا)

خان: خوا بەزیای کا گەورەم، دەستت خۆش بێ.

دایە ڕێحان لەگەڵ ساڵح دێتە ناو.

دایە: بۆ چەمیانە رۆڵە ساڵح؟ کێ کاری بە من هەیە؟

سوڵتان: من کارم پێتە دایە ڕێحان!

خان: سوڵتان ئەمری فەرموو بێیتە خزمەتی.

دایە: گیان باوکمە ساقەت، ئەمرت بە من چییە؟

سوڵتان: تەمەنت چەند ساڵە دایە ڕێحان؟

دایـە ڕێحـان: بەخـودا چـی بڵێـم سـوڵتان گیـان؟ نایزانـم، بـەڵام ئـەو ساڵەی وا خوالێخۆشـبوو سـوڵتان سـەعیدی گـەورە، یانـی بابـە گـەورەت لـە چاروا داکـەوت و قولـی شـکا، مـن کچـە ئـازەو بـووم. (هەمـوو ئەکەنن)

سـوڵتان: ئـەو کاتـە بابیشـم بـە دنیـا نەهاتبـوو! دە باشـە پێـم بڵـێ بزانـم چەنـد سـەر ئاژەڵـت هەیـە؟

دایـە: ئـاژەڵ؟ ئاژەڵـم نییـە قوربـان! دوێنـێ بـە تەنیا کەڵەشـێرێکم بـوو کـە ئەمـڕۆ ئیـدی نییـە.

سوڵتان: بۆ نییە؟

دایە: فەدای قەدەمی جەنابت کرا و گاوگەردوونت.

سـوڵتان هەڵئەسـتێ و بـە دەسـتی خـۆی دوو کیسـە زێـڕ ئەنێتـە نێـو دەسـت دایـە ڕێحـان.

دایە: ئەمە چییە؟

سوڵتان: پێشکەش بە تۆیە.

دایە: دەستت خۆش بێ، زۆر سپاسی گەورەییت ئەکەم.

چـاوی خـان زاقـەوە ئەبـێ و دیـارە لـەم بـەزڵ و بەخششـەی سـوڵتان نارەزایـە!

سوڵتان دێتەوە سەر جێیەکەی خۆی.

خان: ببوورە سوڵتان پرسیارێکم هەیە.

سوڵتان: بڵێ گوێم لە تۆیە؟

خان: خوا بیزانێ من بۆ وەرگرتنی سکە و ئەنعام گام لەبەر پێتانا سەرنەبڕیوە، بەڵام چۆن بۆ دوو گا، کیسەیەک زێڕ ئەنعام ئەدەن، بەڵام بۆ کەڵەبابێکی ناقابل دوو کیسە؟

سوڵتان: وایە، پرسیارەکەت بەجێیە، ئەوەی دوو شەکی بۆ سەربڕیم ٤٠ سەر ئاژەڵی هەیە.

تۆ کە دوو گات بۆ سەربڕیوم، حەسابی وردە ئاژەڵی خۆت نازانی و ٨٠ سەر گا و مانگات هەیە! هیممەتی هەردووی ویوە بە هیممەتی ئەو پیرەژنە ناگا کە بە تەنیا کەڵەبابێکی بوو و هاوردی گاوگەردوونی منی کرد! یانی تۆ جزوێ لە ماڵ و سەروەتی خۆت فەدای من کرد، بەڵام ئەو پیرەژنە هەموو ماڵ و سەروەتی فەدای من کرد! جا ئێستا خۆت بڵێ بزانم حەقی کامتان بەسەر منەوە زیاترە؟

خان: (دوای نەختێ فکر) وایە گەورەم، حەقی ئەو زیاترە!

# چاوانەی ناندار

**پرسۆناژ:**

**- قومەشکەن (بیرهەڵکەن)**

**- خان**

**- شاگردی قومەشکەن**

خان له سه‌ر چاوانه‌كه وێستاوه.

كابرای قومه‌شكه‌ن له چاوانه‌كه دێته ده‌رێ.

خان: ماندوو نه‌بی!

كرێكار: زۆر مه‌منوون قوربان، به گه‌ز بووه‌ته په‌نج گه‌ز و نیو قوربان!

خان: كه‌مه زۆر كه‌مه، ئه‌وه‌ی كه بیستوومه خاكی ئێره له حه‌وت گه‌زییه‌وه ئه‌گا به نم.

كرێكار: به‌خودا چی بلێم گه‌وره‌م، من چاوم ئاو ناخواته‌وه، ئه‌م خاكه قه‌د بگا به ئاو، به‌لام سه‌رچاو دیسان ئه‌یكه‌نم.

خان: ئه‌رێ دیسانه‌وه بیكه‌نه، ده‌ستت خۆش بێ.

كرێكار قولنگه‌كه‌ی له زه‌مین هه‌لده‌گرێ و به یارمه‌تیی شاگرده‌كه‌ی خۆی ئه‌چێته‌وه نێو چاڵه‌كه‌وه.

خان له‌وێ ده‌ڕوا.

كرێكاره‌كه سه‌تڵ سه‌تڵ خاك به‌سه‌ر خاكدا ده‌كا و چه‌ند دیمه‌ن له‌و خاك داكردنه بۆ نیشاندانی ده‌ربازبوونی كات (ریزاڵف) ده‌بێ.

خان له‌سه‌ر چاوانه‌كه راوه‌ستاوه.

كرێكاره‌كه دێته بان.

خان: ها کاکە گیان بڵێ، بزانم؟

کرێــکار: بەخــودا قوربــان لــە حــەوت گــەز تێپەڕیــوە، بــەڵام ڕەنگــی خاکەکــە ناگــۆڕێ، بــەڕای مــن ئــەم چاوانــە قــەد بــە ئــاو نــاگا!

خــان: دیســان بیکەنــە و بچــووە خوارتــر، گــەزێ دوو گــەز زیادوکــەم، عاقیبــەت بــە ئــاو ئــەگات، تــۆ کاری خــۆت بکــە!

کرێــکار: دەی بەســەرچاو قوربــان، مــن تــا هــەر کــوێ تــۆ بفەرمــووی، ئەیکەنــم، بــەڵام بــۆم ئاشــکرایە ئەبــێ بــە ڕەنجــی عەبــەس!

خان: ڕەنجی عەبەس بۆ من یان بۆ تۆ؟

کرێکار: فەرقی چییە قوربان؟

خــان: فەرقــی زۆرە، تــۆ زەحمەتــی خــۆت بکێشــە و ڕەنجــی خــۆت بــدە، جــا ئەگــەر بــە عەبــەس دەرچــوو، بــۆ مــن عەبــەس دەرچــووە، تــۆ کارت نەبــێ!

کرێکار: بەسەرچاو قوربان، هەرچی ئێوە بڵێن.

خــان: ئــەرێ کاکــی خــۆم تــۆ کاری خــۆت بکــە. (دەڕوا) کرێکارەکــە ئەچێتــەوە خــوارێ.

دیسان خاک بەسەر خاکدا خاڵی دەکا.

بە (دیزاڵڤ) دەربازبوونی کات نیشان ئەدرێ.

خان: دەستی ناوەتە پشتی و بەرەو چاوانەکە دێت.

سەر بۆ ناو چاوانەکە ئەکێشێ و بانگی کرێکارەکە ئەکا.

خان: ماندوو نەبی مامە کرێکار!

کرێکار دێتە بان.

کرێکار، ڕۆژ باش قوربان.

خان: ڕۆژ باش برا، چ خەبەر؟

کرێـکار: بەخـودا چـی بڵێـم قوربـان! هــەر تەنیـا ئەتوانـم بڵێـم لـە مەحالاتــە ئــەم چاوانــە بــگا بــە ئــاو.

خان: بیکەنێ مامە گیان بیکەنێ و لە کار خۆت بەردەوام بە.

کرێـکار: بەقوربانـت بـم ئـەم چاوانـە بـۆ جەنابـت نـاگا بـە ئـاو، ئەمـە بزانـە، ئەگـەر مـن قومەشـکەنم و خـاک ئەناسـم، ئـەم خاکـە ئـاوی نییـە و ئـەم چاوانـە بـۆ جەنابـت نـاگا بـە ئـاو!

خـان: باشــە قوربـان، بــەڵام تــۆ ئیشــی خــۆت بکــە و ئەمــەش بزانــە ئەگـەر بـۆ مـن نـاگا بـە ئـاو، خـۆ بـۆ تـۆ ئـەگا بـە نـان؟!

کرێکار نەختێ تەماشای دەمی خان ئەکا و ئەچێتە نێو فکرەوە!

خـان: ئـەڕێ کاکـی خـۆم! بـۆ مـن ئـاوی نەبـێ، بـۆ تـۆ نانـی هەیـە! بـڕۆ دیسـان لەسـەر کارەکـەت بـەردەوام بە.

کرێکار: سەچاو.

خان: چاو و دەست و لەشت خۆش بێ.

کرێکار ئەچێتە نێو چاوانەکەوە.

خان لەوێ دەچێ.

خـاک بەسـەر خـاکا خاڵـی ئەبـێ و دواییـن سـەتڵ قـوڕێ ئـاودار بەسـەر خاکەکـەدا ئـەڕژێ.

# شەهادەتی عاقڵانە

پرسۆناژ:

- سوڵتان
- وەزیری باش
- کابرای تووڕە
- دۆستی پیاوی تووڕە
- جەماعەتێ لە خەڵکی ئاوایی

خەڵکەکە راوەستاون.

کابرایەک هەر خەریک ددانە قرووچەیە و وا دیارە تووڕە بێ.

نەفەری یەکەم: هۆشی دەمت بێ، مامە گیان، سوڵتانە، ئەتوانێ فیلفەور حوکمی قەتڵت بدات!

تووڕە: کورە بە توون! کورە بە دەرەک! خۆ لە زوڵم و زۆری ئەم سەگبابانە گیانم هاتووتە سەر لووتم! ئەو نەمکوژێ، برسییەتی و نەداری ئەمکوژێ! «سەرێ لە زک دایک دەرهات ئیتر ناچێتەوە ئەوێ». هەر کام مردنێ بە خوا قەرزارین، باکوو وا من بڕۆم! قەی چی ئەکا.

نەفەر: مەکە کاکە، بەخودا نەک هەر بۆ تۆ بۆ هەموو خەڵکی ئاوایی کارێکی باش نییە.

مونادی (جاڕدەر): سوڵتان تەشریفیان هێنا.

سوڵتان لەگەڵ دوو وەزیری هاوڕێی دێنە نێو خەڵکەوە!

خەڵک: بەخەیر بێی سەرچاوانمان هاتی، بەخەیر بێی!

تووڕە: هەی بەخەیر نەی زاڵمی لە خودا بێ خەبەر! ئەی بەخەیر نەی ناپیاوی لە خودا بێ خەبەر! هاتووی چی بکەی؟ لە مشتێ هەژار و بەدبەخت کە بە نانی شەو موحتاجن، چیت ئەوێ ئەی زاڵمی لە خودا بەدوور، ئەی کافری ناموسڵمان!

سوڵتان کە لە زمانی تێ ناگا، هەر وا تەماشای ئەکا.

کابـرای تـوورِه ئـەوەی بـە دەمیـا دێـت، ئەیڵـێ. دوو نەفـەر ئـەم لا و ئـەو لای ئەگـرن.

سوڵتان: (روو لە وەزیری باش) ئەوە چی ئەڵێ؟

وەزیـر: بەهەیەجانـەوە دوعـای خێـر و خۆشـی و بەرەکـەت بـۆ حەزرەتـی سـوڵتان ئـەکا و ئەڵـێ، لێـت مەمنوونیـن کـە دەسـتی زاڵـم و زۆردارت لەسـەرمان کۆتـا کـرد و بـە عەداڵەتـەوە حکـووم ئەکـەی.

سـوڵتان سـەری بـۆ کابـرای تـوورِە دائەنەوێنـێ و چەنـد جـار ئەڵـێ، سپاس، سپاس و کیسـەیەک زێـرِ لـە بـەر شاڵەکەی دەردێنـێ ئەیـدا بـە کابـرا و دەسـتی دۆسـتانە ئەگوشـێ.

کابـرا: بەحەیرەتـەوە تەماشـای سـوڵتان ئـەکا و سـەری لـێ ئەشـێوێ و نازانـێ چـی بـکا، یـەک دەفعـە (لەپـرِ) دائەنـەوێ و دەسـتی سـوڵتان مـاچ ئـەکا و ئەچێتـە دواوە.

وەزیری خراپ سەر ئەنێتە لای گوێی سوڵتانەوە.

وەزیـری خـراپ: قوربـان وا نەبـوو! ئـەو کابرایـە بـە تـۆی وت، زاڵمـی لەخـودا بـەدوور! وتـی: بـێ شـەرەفی خـودا نەشـناس! وتـی: کافـر! وتـی، سـەگباب! لەباتـی ئـەوەی سـەری لـە تەنـی جیـا کەیتـەوە، پـارەی پـێ ئـەدەی؟! وەزیـر لەگـەڵ جەنابـت درۆی کـرد! ئەوانـەی وتـی، لەخۆیـەوە وتـی!

سـوڵتان: مـن ئـەم زووبانـە چـاک دەزانـم و لێـی حاڵـی ئەبـم، ئـەو کابـرا زوڵمـی لـێ کـراوە و خـۆی بـۆ مـردن ئامـادە کردبـوو، بـەڵام وەزیـر لـە حاڵـی گەیشـت و بـەو تەرجمـەوە وا کـردی. ئارامیـی بـە دڵـی مـن دا و ئـەوی لـە مـەرگ نەجـات دا و بـوو بـە سـەبەبی خەیـر بـۆ هەردووکمـان!

بەلاّم ئەوەی ئەو پێمی نەوت و لە رووی هەڵنەهات، پێمی بڵێت، تۆ پێمت وت و ئەو هەموو قسە خراپ و ناخۆشە، تۆ بە منت کردبێ! کەوابوو لە سەندنی گیانت گوزەشت ئەکەم، بەلاّم ئیدی نامەوێ چاوم بە نێوچاوت کەوێ، برۆ گۆڕت لە بەرچاوم گوم کە!

وەزیری بەدزات جگە تەعزیم و تەکریم و بەرەو دوا رۆییشتن، هیچی بۆ نامێنێتەوە.

# کۆپان

پرسۆناژ:

- سوڵتان بەگ خان، جەوان و مەغروور
- رەشی، رەعیەتی مامناوەندی
- حەمە، رەعیەت
- مەحموو، رەعیەت
- باقی، مامناوەندی و ریبوار

کەرێ لەنێو ئاسیاوە کۆنەکەدا بەستراوەتەوە و کۆپانەکەی بەلای دەسیەوە دانراوە. ساحێب کەرەکە کە پیاوێکی مامناوەندییە لە وەسەت وەتاقی ئاسیاوەکەدا، ئاوری کردووەتەوە کوفەکوف خەریکی گەرمکردنەوەی دەستانی خۆیە.

دەرەوەی ئاسیاو بەفر ئەبارێ، سپیبوونی بەفرەکە، تاریکەشەوی وەکوو رۆژ سپییەوە کردووە و چاو چاو نابینێ.

لە دەرەوە دەنگی کابرایەک دێتە گوێ کە بە دەنگی بەرز بانگی هاورێکانی ئەکا.

کابرا: ئاهای مەحموو، رەشی، سوڵتان بەگ خان، وەرن بەرەو ئێرە، ئەوەتە ماڵێکی چۆڵ وابزانم لێرەدایە! وەرن!

شوێن دەنگەکەم گوم مەکەن.

رەشی: (لە دوورترەوە) بێین بەرەو کوێ؟ تۆ وای لە کوێ؟ دایم دەنگ هەڵێنە کە گومت نەکەین!

کابرا: من وام لێرە مامە رەشی، وەرن! وەرن، هاو هاو هاو، هاو هاو هاو هاو.

ئەوەندەی پێ ناچێ یەک ئەگرنەوە و دێن بەرەو ئاسیاوە کۆن و رەشی چاوی بە گڕی ئاورەکە ئەکەوێ.

رەشی: نەخێر، ماڵە چۆڵ نییە، تێیدا ئەژین!

سوڵتان: چ باشتر، بانگیان کەن بێنە پیرمانەوە!

ڕەشی: ئاهای خاوەن ماڵ، ئەهای خاوەن ماڵ، لێمان قەوماوە و ڕێگەمان لێ گوم بووە، ئەو دەرگامانە بۆ بکەوە.

کابرای نێو ئاسیاو دێت و پشت دەرگا شەقوشڕەکە لا ئەبا و دەرگا ئەکاتەوە.

ڕەشی: شەو باش خاوەن ماڵ!

کابرا: من خاوەن ماڵ نیم کاکە گیان! منیش وەک ئێوە ڕێبوارم و لە حەیبەت ئەوا خۆم و وڵاخەکەم تووشی گورگ نەبین، پەنام هێناوەتە ئەم ئاسیاوە کۆنە، فەرموون فەرموون ئێوەش تەشریف بێنن.

ڕەشی: فەرموون سوڵتان بەگ خان، ئاسیاوە کۆنە، ئاوەدانی نییە.

سوڵتان: ئەی هەی بابە چۆن من لەنێو ئاسیاوە کۆن بژیم؟!

ڕەشی: چی ئەکرێ سوڵتان بەگ خان؟ خۆ ناتوانین بەم باوبۆرانە لە دەرەوە بژین! تاوێ تر تاکو بەیانی ئەم کەژوکێوە گورگەڕاوە نە گیانلەبەر گیان دەرئەکا و نە پەلەوەر ئەتوانێ پەل بوەشێنێ! ئەم ئاسیاوە چۆڵە ئەمشەو بۆ ئێمە نیعمەتی خوداوەندییە!

سوڵتان بە کەبکەبە و دەبدەبەوە دێتە ماڵەوە و سێ ڕەعیەت بە شوێنیا دەستەونەزەر، وارید دەبن.

سوڵتان: ئای لەم نیعمەتی خوداوەندییە!

تەماشای نێو ئاسیاوەکە ئەکا و لەژێر نووری ئاورەکەدا چاو بەناو ئاسیاوەکەدا ئەخشێنێ و زۆر بە دڵی نارازی، سەرێ ئەلەقێنێ.

سوڵتان: حەیاحەی! خودا دڵی خۆشە نیعمەتێکیشی لەم دەرک و

دۆڵایـە! ئەمـە چییـە؟ یانـی ئیمشـەو ئێمـە مەجبووریـن لەگـەڵ کەرێـکا هاووەتاقـی بیـن؟!

رەشـی: بەقـەوڵ هەورامـی وتەنـی، چێـش کـەردەن، سـوڵتان بـەگ خـان؟

رێبوار: فەرموون قوربان، فەرموون بێنە لای ئاورەکەوە.

خـان تەماشـایەکی خانانـە و پـڕ لـە فیـز و فـەزڵ ئەخشـێنێ بـە رووی رێبوارەکـەدا.

سوڵتان: تۆ کێیت و کوڕی کێیت و لێرە چی ئەکەی؟

رێبـوار: باقـی قوربـان، باقیـم نـاوە، کـوڕی باوکـی خۆمـم کـە قابیلـی عـەرز نییـە، بـەڵام خەڵکـی دێ باریکـەم و رەعیەتـی قەمەرەلـی خانـی دێ باریـک، لـە شـارەوە هاتمـەو بـۆ دێ، ئێـوارەم لـێ هـات و پەنـام هێنایـە ئـەم ئاسـیاوە کۆنـەوە.

سوڵتان: خوردوخوەراک چیت پێیە؟

باقی: وەڵا قوربان چی بڵێم، نەختێ نان و پەنیرم پێیە.

سوڵتان: ئا شتێکم بۆ راخەن، لەسەری دانیشم، ئا دەی!

هەرسـێ رەعیـەت هەراسـان ئەبـن و تەماشـای یـەک ئەکـەن و رەشـی سـەروێنەکەی خـۆی دەردێنـێ و لـە لای ئاورەکـەوە ئەیخـا ژێـر خـان.

رەشی: فەرموون دانیشن گەورەم.

سـوڵتان: نەدەبـوو شـتێکی گـەرم و نـەرم لەگـەڵ خۆتـان بێنـن؟! (دادەنیشـێ)

رەشـی: بـۆ نەدەبـوو قوربـان! خۆتـان فەرمووتـان لـە ئاوایـی دوورەوە ناکەویـن و هـەر لـە دەوروبـەری ئاواییـدا شـوێنی نەچیـر ئەگەڕێیـن، چاکـە

بارمـان سـەنگین نەبـێ!

سوڵتان: من وتم؟ من شتی وام قەد نەوتووە و بیرم نایێ.

حەمە: فەرمووتان قوربان.

سـوڵتان: ئیسـە منیـش وتبێتـم، ئێـوە نابـێ نەختـێ بیـری دوارۆژتـان بـێ؟ تاژییـەکان کوایـان؟

ڕەشـی: کەوتینـە نێـو ئـەو تەمومـژە، لێمـان ون بـوون، گـەورەم! پێـم وایـە چووبێتنـەوە بۆ ئاوایـی.

سـوڵتان: ئـەوان لـە ئێـوە عاقڵتـر و داناتـرن، چـوون زانییـان ئەمـڕۆ ڕۆژی ڕاو و نەچیـر نییـە!

ڕەشـی: جەسـارەت (بـێ ئەدەبـی) نەبـێ گـەورەم، هـەم خاتوونـی دایکتـان فەرموویـان ئەمـڕۆ ڕۆژی ڕاو و نەچیـر نییـە، هـەم ئێمـەش عەرزمـان کـردی، بـەڵام فەرمووتـان زۆر دوورەوە ناکەویـن.

سـوڵتان: منیـش بڵێـم، ئەشـێ ئێـوە ئەوەنـدە بـێ عەقـڵ نەبـن کەونـە شـوێن قسـەی من؟

ڕەشی: ڕاستە گەورەم! بەڵام دەکرا نافەرمانیی جەنابت بکەین؟

سوڵتان: مەگەر من نەموتووە زۆر دوورەو ناکەوین؟

ڕەشی: بەڵێ وەڵا.

سوڵتان: ئەی بۆ دوورەو کەوتین؟

حەمـە: خـوا خـراوی خـاس بـکا بـۆ ئـەو کەروێشـکە کلۆڵـە وا هاتـە نێـو ڕێمـان، جەنابـت تەقـەت لـێ کـرد، فەرمـووت پێـکام، بـە شـوێن ڕەدی ئـەودا دوورەو کەوتیـن و سـەرمان لـەو تەمومـژە دەرهێنـا و ڕێمـان لـێ ون بـوو!

ڕەشی: من عەرزم کردی نەتان پێکاوە، بەڵام ئێوە خۆتان فەرمووتان داومە لێی و ئەبێ پەیدای کەن!

سوڵتان: تۆ چۆن ئەزانی من ئەو کەروێشکەم نەپێکابوو ڕەشی؟ بۆ قسەی قۆڕ ئەکەی؟!

ڕەشی: تۆ خودا تووڕە مەبن قوربان! ئەوەی من تاکو ئێستا دیومە و چەند جار سەری کەروێشکم بڕیوە، کەروێشک خوێنی سووری هەیە و هەرچی چاوم بە شوێن پێی ئەو کەروێشکا خشاند، یەک قەترە خوێنم نەدی! جا یا تیرەکەی جەنابت چووەتە نێو کوڵک و مووی کەروێشکەکە و گیری کردووە و زەفەری بە گۆشت پەیدا نەکردووە، یان لەباتی خوێن ئاو لە ڕەگیدا بووە کە ڕژاوە و نەکەوتووەتە بەرچاو.

سوڵتان: من ئەزانم لێم دا، ئیدی بۆ خوێنی نەبوو نازانم، خۆشم سەرم سڕ ماوە! ڕۆڵە باقی چڵوچێو هەر ئەمەمان هەیە؟

باقی: بەڵێ وەڵا، ئەویش هەر بە زەحمەت لەنێو ئاسیاوەکەدا کۆم کردووەتەوە.

سوڵتان: ئەمە دوو سێ ساعەت زیاتر دەوام ناهێنێ، بەڵکوو بگەڕێن نەختێ چڵوچێو پەیدا کەن!

باقی: نییە قوربان، ئەوەی ئێوە لە تاریکیدا شوێنی بگەڕێن، من لە ڕۆشنایی ڕۆژدا شوێنی گەڕاوم نییە، ئەبێ بەو چەند شاخ (چڵ)ەوە مودارا (هەڵ)کەین!

سوڵتان: لا ئیلاهە ئیلەڵا!

(نەختێ چاو ئەگەڕێنێ و چاوی بە دەرگاکە ئەکەوێ)

سوڵتان: بۆ ئەو دەرگا دەرنەینین، بینینە ئاورەو؟

باقی: ئەوە تەنیا گیان پەنای ئیمشەوی ئێمەیە قوربان، ئەگەر نەبێ، نیمەشەو گورگ هێرشمان بۆ دێنن و زکی هەموومان ئەدڕن!

سوڵتان: دەی هیچ کاکە هیچ، ئەویش هیچ.

(نەختێ بێدەنگی و هجوومی بۆران و با)

سوڵتان: کورە وەڵا ئا لەم باوبۆران و کرێوەدا هیچ حەیوانێ لە لانەی خۆی نایتە دەرێ! تەنانەت گورک، با ئەو دەرگا دەربێنین و بیسووتێنین.

باقی: کاری وا ناکرێ قوربان!

سوڵتان: بۆچ ناکرێ؟!

باقی: من بۆ ئێوە نازانم قوربان، بەڵام من هەم گیانی خۆمم خۆش ئەوێ و هەم گیانی کەرەکەم و چنگ و کەڵوەی شەڕە گورگیشم نییە.

سوڵتان: من ئەڵێم، من سوڵتان بەگ خان؟!

باقی: من تۆ ناناسم و رەعیەتی تۆ نیم، هەرچی بڵێی، بڵێم سەرچاو! بەر لە ئێوەش هاتوومەتە نێو ئەم ئاسیاوە و هەقی خۆمە نەهێڵم.

سوڵتان: من ئەڵێم گورگ نییە!

باقی: من ئەڵێم هەیە!

سوڵتان: ئەگەر هەیە، کوا؟ وا لە کوێ؟

باقی: هان لە دەوروبەری ئاسیاوا و ماتڵی ئەوەن ئەو دەرگا بکرێتەوە! من خەڵکی ئەم ناوەم و ئەزانم!

سوڵتان: تۆ هیچ نازانی!

باقی: ئەزانم.

سوڵتان: نازانی، ئێمەش پێمان خۆش نییە بە بۆن خەیاڵاتی تۆوە ئەمشەو لەسەرما بمرین!

(روو لە پیاوەکانی) هەستن ئەو دەرگا دەربێنن!

باقی ئەکا بە کوتەکی سەر کۆپانی کەرەکەیا و بەریان ئەگرێ.

باقی: ببوورن، زۆرم بۆ بێ و گیانم لە مەترسیدا بێ، رای ئەوەشێنم و لە گیانی خۆم دیفاع ئەکەم.

سوڵتان: رەشی؟

رەشی: بەڵێ گەورەم بە زوان خۆش، هەرسێکتان رازیی کەن خۆم دەری دێنم.

هەر سێ رەعیەت هەڵئەسن و هجووم ئەبەنە سەر باقی و دەستی ئەگرن!

سوڵتان: هن! جواوجێ لەگەڵ سوڵتان بەگ خاندا؟! تۆ ناهێڵێ؟

بەرەو دەرگاکە ئەچێ.

باقی: تۆ سەری بابت قوربان، تۆ بیتو گیانی دایکت، کاری وا مەکە هەموومان لەبەین ئەچین!

سوڵتان: ئەگەر نەیهێنن و نەیسووتێنن لەبەین ئەچین بێ عەقڵ، گورگ لەم بۆران و کرێوەدا کەر بووە لە لانی خۆی بێتە دەر؟!

(سوڵتان دەست ئەبا بۆ کلۆنی دەرگا، لەناکاو دەنگی لوورەی گورگ بەرزەوە ئەبێ و سوڵتان دەردەچێتە دواوە)

سوڵتان: ئەک ماڵی کاولم ئەوە چییە؟!

باقی: عەرزم نەکردی قوربان؟! تازە ئەوە هیچ نییە بۆنی ئێمەیان کردووە و تا دوو سێ ساعەتی دیکە چی هاوسێ و بەرهاوسێیان هەیە بە لوورەلوور، ئەیکێشن بەرەو ئێرە.

سوڵتان: دەکماڵی باوکت کاول بێ بۆ قۆرەرەشیت! ئەوە چیت کرد؟

باقی: کێ، من؟!

سوڵتان: ئەرێ تۆ؟! بزانە تا ئەو کاتە دەنگی تۆ دەرنەهاتبوو یەک دانە گورگ لەم دەوروبەرا بوو؟ هەر دەنگی تۆ دەرهات، دەنگی ئەوانیش دەرهات! چیت کرد؟

باقی: وەڵا چی بڵێم قوربان؟ ئەوانە هەموو ئامۆزازای منن! هەر دەنگم بەرزەوە بوو هەموویان هاتن! بەڵام قەیدی نییە قوربان! ئەگەر پێت خۆشە دەری بێنی و بیسووتێنی، وا بکە، من لە کاری خۆم پەشیمانەوە بووم.

سوڵتان: چی بکەین رەشی؟ من زۆر سەرمامە!

رەشی: ئەتەوێ تا شاڵەکەمت پێ دەم، بیبەستە مل شاڵەکەی خۆتا.

سوڵتان: ئەرێ بیدە.

(رەشی شاڵەکەی ئەکاتەوە و ئەیدا بە سوڵتان، سوڵتان ئەیوەسێ بەسەر شاڵەکەیا)

(مەحموو شاڵەکەی ئەکاتەوە و ئەیوەسن بە دەور کەمەر و ملیەوە، هاورێی سێیەم شاڵەکەی ئەکاتەوە ئەیوەسن بە دەور سەریەوە و تەنیا چاوانی ها بە دەرەوە.)

(نەختـە نەختـە ئاورەكەيـش كـەم دەكا و بەقـەد شـەمێكى لـێ ئەمێنێتـەوە)

سولّتان: (رۆلّە باقى) تۆ چى، هيچت نييە پێمى بدەى؟!

باقـى: بەداخـەوە قوربـان، چـوون خۆشـم ولّكـم سـەرمايە و ژان دەكا، ناتوانـم شـالّەكەمت پـێ بـدەم، ببـوورە!

سـولّتان: زۆر سـەرمامە، مـن تـا ئێسـتا لـە لێـف و دۆشـەكەى گـەرم و نـەرم جيـاوە نەبوومەتـەو! ئـەم سـەرما زۆر لەسـەرم كاريگـەرە، ئـەوا پێـش بـڕوا مـن ئەمشـەو رەقـم ئەباتـەوە و لەبەيـن ئەچـم. نازانـم چـۆن، بـەلاّم بەلّكـوو كارێكـم بـۆ بكـەن.

رەشـى: چيمـان پـێ ئەكـرێ قوربـان! مـن ئەلّێـم جەنابيشـت وەكـوو ئێمـە بيـر لـە سەرماوسـۆلّە مەكـەوە، چاكتـر ئەبـى.

سـولّتان: مـن وەكـوو ئێـوە؟! خۆشـت ئەزانـى چـى ئەلّێـى رەشـى؟ خوێنـى مـن و خوێنـى ئێـوە يـەك جـۆرە؟!

رەشـى: نـە قوربـان مەبەسـتم لـەو قسـە، جەسـارەتى ئـەوە نەبـوو كـە خوێنـى بەگـزادە و رەعيـەت يەكـێ بـێ! شـتى وا هـەر نەبـووە و نابـێ! مەبەسـت ئەمەيـە كـە ئێمـەش گرفتـارى ئـەم سەرماوسـۆلّە هەيـن و وەكـوو ئێمـە نەختـێ سـەبر و تاقەتتـان بـێ! ئەگينـا هەمـوو عالـەم ئەزانـن خوێنـى خـان و بـەگ و بەگـزادە زۆر رەنگينتـر و سـەنگينترە.

باقـى: (سـەر ئەباتـە بـەرەو) ببـوورە گـەورەم، جەسـارەت نەبـێ، بيـلا تەشـبى! كۆپانـى كەرەكـە هەيـە بيكەمـە كۆلّـت!

سـولّتان: (تـووڕە) چـى؟! خەجالّـەت ناكێشـى كابـراى نەفـام؟ ئـەوە بـە چـى هاتوومـە بەرچـاوت؟! بـەوەلاّ لەبـەر خۆفـى خـوا نەبوايـا، هـەر

ئێستا گوللەیەکم ئەنا بە نێو دەمتەوە! ئەوە چی ئەڵێی؟ ئەوە ئێوە بۆ بێدەنگ ماون؟! بەوەڵا گوێی دایکم یا گوێی باوکم لەم قسە قۆڕە بایا، یان زیندوو دیواریان بە سەرتا ئەکێشا، یان زوبانتیان لە پشت ملەوە ئەکێشا دەرێ!

باقی: خۆ عەرزم کردی، جەسارەت نەبێ! خۆ وتم بیلا تەشبی! بۆ وا تووڕە ئەبی؟!

هەر سێ رەعیەت.

رەشی: بێدەنگ بە، نەفام!

حەمە: ئا ئەو قسە کەرانە، چی بوو تۆ کردت!

مەحموو: شەوەکەی شەوی ئەوە نییە، ئەگینا هەر بۆ ئەم قسە نەفامانانە لووت و گوێم ئەبڕیت!

باقی: باشە کاکە، باشە، نەمزانی و قسەیەکی کەرانەم کرد. چی بڵێم؟ بە لای خۆمەوە فکرم کردەوە کۆپانەکە گەرمە و پشتی گەرمەوە ئەکات!

رەشی: وس، نەفام، ئیدی ئەو قسە تکرارەوە نەکەی!

باقی: (بە چەپۆک ئەکوتێ بەسەر دەم خۆیا) باشە بەقوربان، ئا ها ئا!

دەرەوە باوبۆرانێکی سەختە و بەدایم گورگەکان ئەلوورێنن. باقی و هاوڕێکانی سوڵتان، هەرکام بە جۆرێ چوونەتە یەک و لە دەور وردە ئاورەکەدا نووستوون.

کەرەکەیش لە گۆشەیەکەوە چورت (وەنەوز) لێ ئەدا و وردەوردە تەقەی دگانی سوڵتان بەرزەوە ئەبێ.

سوڵتان سەر بەرزەو ئەکا و چاوێ بەسەر کۆپانەکا ئەخشێنێ.

چەند جار تەماشای کۆپانەکە ئەکا و چاوی لێ هەڵدەگرێ. ئاخر و عاقیبەت سەر ئەباتە نزیک باقییەوە.

سوڵتان: (بەئەسپایی) کا باقی! کا باقی! (چەند جار بانگی ئەکا)

باقی کەوتووە خرەپف.

سوڵتان: (تووڕە و بەرز) کا باقی!

باقی: ها، ها؟ بڵێ چییە؟ چی بووە؟

سوڵتان: (بەئەسپایی) زۆر سەرمامە کاک باقی!

باقی: ئەفەرمووی چی بکەم، گەورەم! چیم لە دەس دێ؟

سوڵتان چاوێ بەسەر هاوڕێکانیدا ئەخشێنێ.

هەموو خۆیان داوە لە خەو.

سوڵتان: هەستە ئەوەی وتت بیکە کۆڵم.

باقی: چی، کۆپانەکە؟

سوڵتان: ئەرێ، بەڵام ناوی مەبە!

باقی: کۆپانەکە ئەفەرمووی؟!

سوڵتان: هەی هوو، هەی هوو! ئەڵێم ناوی مەبە! هەستە ڕچام!

باقی: سەرچاو.

هەڵئەستێ، خان ڕائەکشێ.

باقی، کۆپانەکە تێرێ و ئەیکاتە کۆڵ سوڵتان و تەنگەکەی ئەخا ژێر زکی!

کەنین ئەکەوێتە سەر لچ ڕەشی و ئەو دوو کەسەکەی دیکەش.

# من ئەو کەسەم
# کە ئاغا وتی!

پرسۆناژ:

- عەودە (نۆکەر)
- ئەرباب (ئاغا)
- باخەوان
- گزگدەری پیاو
- بەننا و چەند کرێکارێك

خان لە سەربانەوە دەستی ناوەتە کەمەر و لە هاتوچۆدایە.

عـەودەی نۆکـەری شرکەپۆشـی، لـە دوورەوە دەسـتەونەزەری خـان راوەسـتاوە و هـەر جـارێ خـان هەڵئەگەرێتـەوە و بـەرەو ئـەو دێـت، وەکـوو سـڵاوکردن، سـەر دائەنەوێنـێ و تەعزیمـی خـان ئـەکا.

خان قەد بە حوزووری عەودە ئەهەمیەت نادا و جوابی ناداتەوە!

چەنـد کرێـکارێ بەنـاو کاریگـەر و باخـەوان لـە دەوروبـەری حەوشـدا، خەریکـی کارن.

عـەودە بەئاواتـە خـان بـۆ یـەک جاریـش بـووە، جوابـی سـڵاوەکەی بداتـەوە. بۆیـە چەنـد جـار بـە دەنگـی بـەرز هەناسـە هەڵدەکێشـێ، بەڵکـوو خـان لێـی بپرسـێ چییـە؟ بـەڵام خـان قـەد ئەهەمیـەت نـادا.

## (شەو -ماڵەوە)

عەودە نووستووە، خەو دەبینێ

عەودە: سڵاو قوربان.

خـان: سـڵاو، سـڵاو مامـە عـەودەی بەرێـز، نۆکـەری بـاش و بەهێـز، حـاڵ و ئەحواڵـت چۆنـە عـەودە؟ چـی ئەکـەی عـەودە؟ بـۆ دیـارت نییـە عـەودە؟ تاسـەتم کردبـوو عـەودە، لێمـان ناپرسـی عـەودە؟!

عـەودە لـە خۆشـیا ئـارەق دەردەدا و لـە خـەو رادەچڵەکـێ و لەنێـو

جێگەکـەی دادەنیشـێ و ئەچێتـە نێـو فیکـرەوە!

## (بەیانی)

کرێکارەکان لـە حەوشـدا خەریکـی کارن. خـان لـە سـەربان خەریکـی هاتوچۆیـە. عـەودە دیسـانەوە دەسـتەونەزەر راوێسـتاوە و خەریـک تەعزیمکردنـی بـێ جوابـە!

یەکـێ لـە تاژییەکانـی عەمـارەت کـە جلەکـەی کەوتووەتـە ژێـر زکـی، لەنێـو حەوشـەدا دیـاری دەدا.

خان لا ئەکاتەوە و چاوی بە تاژی ئەکەوێ!

تاژییەکە جل کەوتووەتە ژێر زکی و تەواوی حەرەکەتی بڕیوە!

خان نەختێ تماشای تاژییەکە ئەکا و لا لە عەودە ئەکاتەوە.

عەودە بەحەیرەتەوە چاو ئەبڕێ لە خان.

عەودە: (لەژێر لچەوە) ئەی خودا! ئەی خودا! دەی! دەی!

خان: عەودە؟

دەنگی خـان لـە گوێـی عـەودەدا دەنـگ ئەداتـەوە و چەنـد جـار تکرارەو ئەبـێ. عـەودە لـە خۆشـیا چـاو ئەقووچێنـێ و ڕۆحـی ئـارام دەبـێ.

عەودە: ئۆخەی! ئۆخەی!

خان: (بە دەنگی بەرزتر) عەودە؟

عەودە: بەڵێ بەقوربانی ئەو دەمگوفت و کەلامەت بم، ئاغا گیان!

خـان: بـۆ ئـەوەی بـە جێگـەی وێسـتان و تماشـاکردنی مـن، کارێکیشـت کردبـێ، ئـا بـڕۆ جلـی ئـەو تاژییـە کەوتووەتـە ژێـر زکـی، راسـتەوە بکـە!

عەودە: چی قوربان! باش تێ نەگەیشتم!

خـان: (بەتەئکیـد) عـەودە، بـڕۆ جلـی ئـەو تاژییـە راسـتەوە بکـە، هـا دەی!

عەودە: ئەی بەسەرچاو! ئەی بەسەر سەر!

رائـەکا و بـە دەرچـوون خـۆی بـە تـاژی ئەگەیەنـێ و جلەکـەی راسـت ئەکاتـەوە!

عەودە: (روو لە بان) باشە قوربان؟

خان بە تەکانی سەر، جوابی موسبەت ئەداتەوە!

عـەودە خۆشـحاڵ ئەبـێ و دەسـت ئەنێتـە کەمـەر و بەنێـو حەوشـدا وەیـلان ئەبـێ و ئەچێتـە بـەردەم باخـەوان.

عەودە: ئەمساڵ بۆچی گوڵی چاکیان نەداوە مامە ڕەشی؟

باخەوان: بڕۆ لاچۆ، هادەی! هەر تۆ ماوی ئیرادم لێ بگری

عەودە: وا دیارە نازانی من کێم؟!

باخـەوان: لاچـۆ بـڕۆ شـوێن کاری خۆتـا عـەودە، ئەگینـا بـەڵا! بـەم داسـە ملـت ئەپەڕێنـم... لاچـۆ!

عەودە نەختێ بەمۆڕەوە تماشای باخەوان ئەکا و ئەکەوێتە ڕێ.

کابرایەک خەریک گزگدانی حەوشە.

عەودە ئەوێسێ و نەختێ تماشای ئەکا.

عەودە: ئەو پەناتە جێ هێشتووە کا براخاس.

کا براخاس جوابی ناداتەوە.

عـەودە: وا دیـارە تـۆش نەتزانیـوە مـن کێـم، کا براخـاس! ئەڵێـم، ئـەو

پەناتە بەجێ ماوە!

کا براخاس بێ ئەوەی جوابی عەودە بداتەوە، پەناکە ئەداتە بەر گزگ.

عەودە نەختێ لەژێر لچەوە بۆڵەبۆڵ ئەکا و ئەڕوات و ئەگاتە سەر کاری کرێکارەکان.

بەننا خەریکی کاری خۆیە.

عەودە دەست ئەنێتە کەمەر و تماشای ئاجۆر (کەرپووچ) دانانی بەنناکە ئەکا.

عەودە: ماندوو نەبی مامە بەننا؟

بەننا: زۆر مەمنوون.

عەودە: ببوورە مامە بەننا ئەو ئاجۆرەی داتناوە، نەختێ لارە، راسی کەوە.

بەننا: کام ئاجۆر؟

عەودە: ئەوەی ئێستا ئاجۆرت نا سەری.

بەننا: ئەمە؟

عەودە: بەڵێ بەڵێ، ئەوە!

بەننا: (دوای نەختێ تماشا) نە کاکە گیان، چاوی تۆ لار ئەبینێ، ئەم ئاجۆرە لار نییە!

عەودە: من ئەڵێم لارە!

بەننا: من ئەڵێم لار نییە!

عەودە: بەڵام من ئەڵێم لارە!

بەننا: (تووڕە) باشە لارە! بە تۆ چە! تۆ چ کارەیت، تۆ کێیت؟!

عەودە: چۆن؟ گوایە تۆ نازانی من کێم؟

بەننا: نە، نازانم تۆ کێیت!

عـەودە: چـۆن نازانـی مـن کێـم؟ مـن هـەر ئـەو کەسـەم کـە تـاوێ لەمەوبـەر ئاغـا بانگـی لـێ کـردم، وتـی، ئـە هانـێ عـەودە، جـل ئـەو تاژییـە راسـتەو کـەوە! مـن ئـەو کەسـەم!

بەننا: (بەحەیرەتەوە چاو لە دەم عەودە ئەبڕێ) کورە نەیژی؟!

عەودە: بەڵێ من ئاوا کەسێکم!

بەننا: بەڵێ وایە!

# زۆرنافرۆش

پرسۆناژ:

- کوڕی زۆڕناسێن
- دایکی کوڕ
- وردەواڵەفرۆش
- پیرەپیاو
- چەند کەس بۆ هاتوچۆ

## دێهات، نێو ماڵ، ڕۆژ

دایـک: تـا کـەی دەتـەوێ وێـڵ وێـڵ و خوێـڕی خوێـڕی وەیلانـی ئاوایـی بیـت و لـەش بـە ئیـش و کار نەسـپێری ڕۆڵـە؟

کوڕ: چی بکەم دایە؟

دایـک: چووزانـم ڕۆڵـە؟ ئـەم هەمـوو عالەمـە چـی دەکـەن، تـۆش هـەر ئـەوە بکـە! بـەوەڵا باوکـت لـە تەمەنـی تـۆدا بـوو، خێزانـی دوو ماڵـی ئەژیـان!

کـوڕ: ئـەو دەورانـە تـەواو بـووە و ئەمـڕۆ بەڕێوەبردنـی دوو خێـزان بـۆ یـەک کـەس ناکـرێ، دوو خێـزان ئەبـێ کار بکـەن تـا یـەک نەفـەر بژیێنـن!

دایـک: تـۆ بـۆ هـەر قسـەیەک بەهانەیەکـت هەیـە کـوڕم! بـەڵام وا ناکـرێ و نائومێـدی بـرای مەرگـە، بـۆ خـۆت شـوێنی کارێ بگـرە کـە بەیانـی بـەکارت بـێ، مـن خـۆ تـا قامـی قیامـەت بـۆت نامێنـم.

کوڕ: ئەزانم دایە فکرم لێ کردووەتەوە.

دایک: خوا بیکا!

کوڕ: لە شایانەکەی ڕەحمەتەوە، فکرم لێ کردووەتەوە دایە.

دایـک: شـایانەکەی ڕەحمـەت بـۆ؟! هـا زانیـم! وایـە ڕۆڵـە! تـۆ چیـت لـە ڕەحمـەت کەمتـرە کـە ئـەو ژن بێنـێ، بـەڵام تـۆ لـە بیـر و فکـری ئـەوەدا نەبـی؟!

کوڕ: مەبەستم ژنهێنانی ڕەحمەت نییە دایە!

دایک: ئەی چی؟

کوڕ: ئەو شەوە چاوم بە زۆڕنازنەکەوە بوو کە بۆ دوو دەور هەڵپەڕکێ، زیاتر لە پەنجا سکە پارەی شاواش کەوت! بێت و حەسابی ئەو سێ ڕۆژ و سێ شەوە بکەین، زیاتر لە هەزار سکەی گیر کەوت! شتێکی سووک و ئاسان و خۆش و بێ سەرمایە و پڕ خەیروبەرەکەت!

دایک: ئەتەوێ بی بە زۆڕناچی؟

کوڕ: بەڵێ وەڵا، بۆ نەبم؟ هەم خەیری لێ ئەکەم، هەم شتێکی سووک و ئاسانە و بە چوار پف نانی خۆت دەردێنی، جا بەڵام حەیف زۆڕنام نییە!

دایک: وەڵا چی بڵێم؟ ئەویشت ئەگەر لێ بێ، هەر باشە!

کوڕ: تۆ نازانی لە کوێ زۆڕنا ئەفرۆشن؟

دایک: جا من چووزانم! زۆڕنا ئەگەر بێ لە شارا هەیە، خۆ لە دێدا زۆڕنا نییە.

کوڕ: وایە.. بەداخەوە ڕێم ناکەوێتە شار، ئەگینا چوار پەنج دانە زۆڕنای باشم ئەکڕی.

دایک: چوار پەنج بۆ؟

کوڕ: ئەو شەوە چاوم لێ بوو، زۆڕنازەنەکەی شایانەکەی ڕەحمەت، چوار پەنج زۆڕنای پێ بوو، هەر تاوێ یەکێکی ئەهێنایە کایەوە! منیش ئەبێ چوار پەنج دانە زۆڕنام بێ!

## (دەرەوەی ماڵ، نێو کۆڵان)

کابرای وردەواڵەفرۆش سەبەتێکی پڕ وردەواڵەی لە بن دەست داوە و لەنێو کۆڵاندا خەریکی بانگەوازە.

کابرا: وردەواڵە، وردەواڵە... جام، شانە، سابوون و دەسماڵ، عەتر و گوڵاو، مووروو و کلکەوانە، وردەواڵە، وردەواڵە.

## (نێو ماڵ)

دەنگی کابرای وردەواڵەفرۆش ئەگاتە گوێی کوڕ و ئەچێتە نێو فکرەوە! دوای کاتێ:

کوڕ: خۆیەتی! بەخودا خۆیەتی!

ئەچێ بەرەو دەلاقەی ماڵەکە و ئەیکاتەوە و بانگی کابرا ئەکا.

کوڕ: ئەهای کاکی وردەواڵە راوەستە.

کابرا: سەرچاو. (ئەوەستێ)

کوڕ لە ماڵ دێتە دەرەوە و ئەچێتە نێو کۆڵان.

کوڕ: ماندوو نەبی برا!

کابرا: سپاست دەکەم، چیت ئەوێ؟

کوڕ: چیت هەیە؟

کابرا: ئەبینی هەموو شتێکم هەیە، تۆ چیت پێویستە؟

کوڕ: غەرقی تماشای شتەکان ئەبێ.

کوڕ: شوکر بۆ خودا کار و کاسبیت باشە؟

کابرا: کورە نەوەڵا! لە بەیانییەوە بای باڵم بڕا و قورگم دڕا، بێ

ئـەوەی یـەک سـکەم بـۆ دەرهاتبـێ! نەتـوت چیـت ئـەوێ؟

کوڕ: من زۆڕنام ئەوێ کاکە گیان، زۆڕنا!

کابرا: زۆڕنا؟!

کوڕ: بەڵێ وەڵا، بۆ زۆڕنا ناهێنی؟

کابرا: زۆڕنا بێنم؟! جا کێ زۆڕنا ئەکڕێ؟

کوڕ: چۆن کێ زۆڕنا ئەکڕێ؟ تۆ بڕۆ زۆڕنا بێنە بزانە چۆن لێتی ئەکڕن! ئـەم عالەمـە هەمـوو عاشـقی زۆڕنـان و ئەگـەر بـاری چـوار هێسـر زۆڕنـا بێنـی، هەتـا ئێـوارە تاقـی ئەبڕێتـەوە!

کابرا: کورە برا؟!

کوڕ: بەوەڵا!

کابـرا: دەی وەڵا ئەگـەر وا بـێ، هەرچێکـم هەیـە ئەیفرۆشـم و ئەیـدەم بـە زۆڕنـا و ئەیهێنـم!

کوڕ: ئـەرێ کاکـە تـەواو ئاوایـی بگـەڕێ، یـەک دانـە زۆڕنـای تێـدا پەیـدا ناکـەی و کـەس زۆڕنـای نییـە، یانـی هەموویـان موحتاجـی زۆڕنـان، بـڕۆ مـن هـەر خـۆم چـوارو لـێ ئەکـڕم!

کابرا: سەرچاو، وای لێ ئەکەم.

سەبەدەکەی هەڵدەگرێ و ئەکەوێتە ڕێ و ئەچێ.

کوڕ تماشای شوێنی ئەکا و خۆشحاڵ دەبێ.

کـوڕ: (لەژێـر لچـەوە) زۆڕنـا، زۆڕنـا، زۆڕنـا، یانـی شـایی و خۆشـی! زۆڕنـا یانـی خەیروبەرەکـەت! زۆڕنـا یانـی پـارە دەرهێنانـی سـووک و ئاسـان!

وردەواڵەفرۆش لە ئاوایی دەردەچێ.

کـوڕ روو لـە دەشـت و کێـو ئـەکا و لـچ ئەنـێ بەسـەر قامکـەوە و لاسـایی زۆڕنالێـدان ئەکاتـەوە و بـۆ خـۆی هەڵدەپـەڕێ.

## (شەو، ماڵ) دەرەوە.

(ناوماڵ)

کوڕ نووستووە.

وردەوردە ڕۆژ ئەبێتەوە.

دەنگـی وردەواڵەفرۆشـەکە لەنێـو کۆڵانـەوە دێـت. پـف بـە زۆڕنـا ئـەکا و بـە دەمیـەوە بانگـەوازی زۆڕناکانـی ئـەکا.

کابرا: (پف پف پف) زۆڕنا، زۆڕنا، زۆڕنای باشم هێناوە زۆڕنا.

کـوڕ بەپەلـە هەڵدەسـتێ و ئەچێتـە پشـت دەلاقـەوە و ڕوو لـە کـۆڵان ئەکا.

کوڕ: ئەی بەخەیر بی! ئەی بەخەیر بی! ڕاوەستە، ئەوە هاتم!

کابرا: (خۆشحاڵ) وەرن تەواو بوو! های زۆڕنا، های زۆڕنا!

کـوڕ خـۆی ئەخاتـە نێـو کۆڵانـەوە و ئەبینـێ کابـرا پـڕ سـەبەدەکەی زۆڕنـای هێنـاوە! بەخۆشـحاڵی ئەکەوێتـە جیاکردنـەوەی زۆڕنـا.

کـوڕ: ئۆخـەی هەمـوو ئاواتەکانـم هاتـە دی! دە باشـە کاکـە گیـان، ئەمانـە هـەر یـەک دانـەی بـە چەنـدە؟

کابـرا: هـەر یـەک دانـەم بـە چـوار سـکە کڕیـوە، ئەیـدەم بـە پەنـج سـکە.

کوڕ: پەنج سکە؟! پەنج سکە زۆر کەمە، بیاندە بە دە سکە. ها ئەمە من دوو دانە لێ ئەبەم، ئەمەش بیست سکە بۆ هەردووکی.

کابرا بەخۆشحاڵییەوە پارەکە وەرئەگرێ.

کوڕ: دەی ئیدی بڕۆ بە شوێن رزق و رۆزی خۆتا، خۆش هاتی.

(کوڕ بەخۆشحاڵییەوە، بە زۆڕنا لێدانێکی نالەبارەوە، ئەچێتە ماڵەوە)

کابرا: (بەدەم ڕێوە) های زۆڕنا، های زۆڕنا! زۆڕنای چاک و خۆش دەنگ، بۆ شایانە و هەڵپەڕین، بە دە سکە، وەرن وەرن!

کەس هەواڵی لێ ناپرسێ.

کوڕ لەنێو حەوشەی ماڵدا خەریک زۆڕنالێدانە و دایکی لەپشت دارقاڵی (دارتەون)ەوە خەریکی کارە. بەتووڕەیی چەند جار بانگی کوڕەکەی ئەکا.

دایک: کورە دەی بەسیەتی، مەغزم بۆ نەما!

کوڕ گوێ نادا و هەر پف بە زۆڕناکەدا ئەکا.

(دەرەوە)

کابرا هەر هاواری زۆڕناکانی ئەکا.

کابرا: های زۆڕنا، های زۆڕنای چاکم هەیە، وەرن. زۆڕنا بە دە سکە!

خەڵکەکە ئەدەن بە لایا و کەس لای لێ ناکاتەوە.

کابرا ئەچێتە نێو فکرەوە.

کابـرا: (بـە خـۆی) ئـەوە بـۆ کـەس لام لـێ ناکاتـەوە؟! حەتـم بـۆ ئـەوەی بـە گرانـی ئەفرۆشـم وایـە، چاکـە هـەر بیکەمـە پەنـج سکەکەی خۆی، بەڵکوو بیانفرۆشـم. (بـە دەنـگ بـەرز) وەرن حەراجـم کـرد بـە پەنـج سـکە! وەرن هـادەی تـەواو بـوو.

کابرایـەک ریـش سـپی لـە دوورەوە بەرانبـەری دانیشـتووە و تماشـای ئـەکا.

## (ماڵ - کوڕ)

کـوڕ خەریـک زۆڕنالێدانـە و هـەر تـاوێ یـەک دانـەی لـێ ئازمایـش (تاقـی) دەکا.

دایکی بەتوورەیی لەسەر دارتەون دێتە خوار.

تاکە کەوشێ هەڵئەگرێ و بەتوندی فڕکی ئەدا بۆ سەر کوڕ.

تاکە کەوش ئەکوترێ بەسەر کوڕا و بێدەنگ ئەبێ.

دایـک: خوێـڕی! هـەر ئەمـەم ناتـەواو بـوو! هەسـتە هەسـتە، ئـەم شـیڕوهۆڕەت بـووە بـۆ دەشـت، هـادەی!

کوڕ هەڵئەستێ و بەتوورەیی لە ماڵ دەردەچێ.

دایک: نەگبەت! سەنعەتم بۆ فێر ئەبێ! خوێڕی!

## (دەرەوە)

کابرا: زۆڕنا، زۆڕنا، زۆڕنای چاک بە پەنج سکە.

پیرەپیـاو: کاکـە گیـان بـۆ دەمـی خـۆت ئـازار دەدەی؟ خەڵکـی ئـەم

ئاواییـیـە نابـن بـە مشـتـەریی تـۆ.

کابرا: بۆچی؟

پیرەپیـاو: عەقڵـت بـێ! زۆڕنایـان بـۆ چییـە؟ بەنیـازی شـایانە بـن، بانگـی زۆڕنـاژەن ئەکـەن کـە بـە دەهـۆڵ و زۆڕناکەیانـەوە بێـن، کـەس بەنیـازی زۆڕنـا نییـە!

کابـرا: ئـەی ئـەو کابـرا چـۆن بـە منـی وت زۆڕنـا بێنـە هەمـووی ئەفرۆشـی؟!

پیرەپیـاو: ئـەوەی خـۆی بەنیـازی زۆڕنـا بـووە وای زانیـوە هەمـوو موحتاجـی زۆڕنـان. بـڕۆ کاکـە بـڕۆ، خـودا ڕۆزیـت لـە لایـەک تـرەوە بـدا.

کابرا هەڵدەستێ و نائۆمێدانە بە زۆڕناکانیەوە لە ئاوایی دەردەچێ!

# نە لەوانەی
# وا تۆ ئەڵێی!

پرسۆناژ:

-پیاوی قاوەچی

- محەمەد

- کابرا

کابرایەک لەنێو چایخانە دانیشتووە و چورتکەیەکی داناوە و خەریک حەساباتی خۆیە و چورتکەی بۆ دادەخا.

قاوەچی چایەکی بۆ دێنێ.

قاوەچی: بەخێر بێی کاکە محەمەد.

کابرا: زۆر سوپاس دەستت خۆش.

قاوەچی: نۆشی گیانت.

کابرا چاییەکە هەڵدەگرێ و بەدەم چایی خواردنەوە، خەریکی چورتکە و حەسابە.

کابرایەکی دیکە دێتە نێو قاوەخانەکەوە، سڵام ئەکا و بە لای دەست محەمەدەوە دادەنیشێ.

کابرای دووەم: بەزەحمەت نەبێ چاییەکم بۆ بێنە.

قاوەچی: سەرچاو.

محەمەد بەدەم حەساباتەوە، یەک دەستە پارە لە گیرفان دەردێنێ و ئەچێتە نێو فکرەوە.

کابرا چاوی بە پارەکە ئەکەوێ، وەکوو پارەنەدیو چاو ئەخاتە سەر پارەکە.

محەمەد خەریکی ژماردنی پارەکە ئەبێ و کابرا لووت ئەخا سەر

تماشا و دەموچاوی محەمەد.

محەمەد سەرقاڵی کاری خۆیەتی و هەر ئەژمێرێ و هەر ئەچێتە نێو فکری حەساباتەوە. ئەو پارە ئەنێتە نێو گیرفانی و لە گیرفانیکی دیکە یەک دەستەی دیکە دەردێنێ و شرووع (دەست) بە ژماردن ئەکا.

کابرا حەیرەتزەدە ئەبێ و دیسان لووت ئەنێتە سەر پارەکەی محەمەد. محەمەد خەریک ژماردنە، کابرا لێی ئەپرسێ:

ببوورە کاکە گیان، تۆ نێوت چییە؟

محەمەد تا دوایی ژماردنەکەی جوابی ناداتەوە، جا ئەڵێ:

ببوورە تۆ شتێکت لێ پرسیم؟

کابرا: بەڵێ وەڵا پرسیم، ئەگەر بێئەدەبی نەبێ، نێوت چییە؟

محەمەد ئەو پارە ئەنێتە گیرفانی و ئەمجار لە گیرفانی شواڵەکەیەوە یەک دەستەی دیکە پارە دەردێنێ و بەر لە ژماردن ئەڵێ:

نێوم محەمەدە!

کابرا دیسان بە حەیرەتێکی زیاترەوە لووت ئەخا سەر پارەکە و ئەڵێ:

ئەڵاهوو مەسەلی ئەلا محەمەد و ئالی محەمەد!

محەمەد دوایی بە ژماردنەکەی دێنێ و پارەکە ئەنێتەوە گیرفانی و هەڵدەستێ و چورتکەکەی هەڵدەگرێ روو لە کابرا ئەکا و ئەڵێ:

عەلبەت نێوم محەمەدە، بەڵام نە لەو محەمەدانەی وا تۆ ئەڵێی!

(دوایی روو لە قاوەچی)

ئەم چاییەم بدە سەر چێو خەت، خودا حافیز.

قاوەچی: سەرچاو هاتی.

محەمەد ئەچێتە دەرەوە، کابرا موحەیر، تماشای شوێنی ئەکا.

# کفرئەحمەد و
# (چاوی بینای نیزامە کوێر)

**پرسۆناژ:**

- **کفر ئەحمەد**
- **نیزامە کوێر**
- **کوێخا کەریم**
- **چەند کەس خەڵکی ئاوایی**
- **یەك کەر و یەك گا**

کفر ئەحمەد بۆ ناوچەی لەیلاخی ئەسپەناوای سنە، ناوێکی کۆن و ئاشنایە و سەدان ساڵە بەسەرهاتەکانی وەکوو حەکایاتی باڵوول و مەلا نەسرەدین (مەلای مەشهوور) نەقڵی شەوانی ناوچەکەن و سینە بە سینە زەمان ئەپێون. کفر ئەحمەد، هەروا کە بە ناوەکەیدا دیارە، حەکایاتی تایبەت بە خۆی هەیە و جار بەجار، نیزامی سروشت و قودرەتی لایەزالی خوداوەندی ئەباتە ژێر سوعالەوە و لە حەقیقەتدا داخی دەروونی خەڵک کە لە هەزاران پرسیاری بێ جواو پێکهاتووە، سارێش ئەکا و مێشکی بیسەر ئەباتە نێو فکر و خەیاڵەوە.

ئەمە ئێوە و ئەمە چەند حەکایەت لە کفر ئەحمەد.

کفر ئەحمەد و نیزامە کوێر و سێ پیاوی ئاوایی، لەسەر سەکۆی بەر مزگەوت دانیشتوون و پێکەوە وتووێژیانە.

کوێخا: زۆر کز و خەفەتبار دێیتە بەرچاو.. ئەحمەو! شتێ قەوماوە؟

ئەحمەد: وەڵا چی بڵێم کوێخا کەریم، ئەوەی خوای گەورە دوای سێ ساڵ رەنج و مەشەقەت بە نێو ماڵ دنیا پێمی داوەن بیلاتەژبی، کەرێکە و گایێ! ئەمرۆ سیانە گازەردگ کزە و لێو بە ئاڵفەوە نادا،

تـەواو بووەتـە پێـس و سـوقان، نازانـم چـی لـێ کـەم؟

کوێخا: دەی کاکە گیان دەواێی دەرمانێ، شتێکت پێ نەداوە؟

ئەحمـەد: وەڵا بـۆ؟ حاجـی مەجیـدم بـردە سـەری هیچێکـی بـۆ نوانـد، بـۆم کـڕی و دامـە دەرخـواردی! بـەڵام هەمـووی بـە لای لچـا دا دواوە.

نیزام: دەی بۆ تا خراپتر نەبووە حەڵاڵی ناکەی؟

ئەحمـەد: حەڵاڵـی کـەم بـۆ کـێ نیـزام، کـێ جـگا تـۆ، گۆشـتی حەیوانـی نەخـۆش ئەخـوات؟

نیزام: بەشی منی لێ بدە و باقییەکەی بخە چاوانە!

ئەحمـەد: هـن! خوایـە شـەڕێ هەڵخـڕێ خێـری منـی تێدابـێ! ئـەرێ؟ لەجیاتـی ئـەم قسـە قۆڕانـە، دوعـای خێـر کـە خۆشـەوە بێـت، نـەزری سـەری نیـم مـەن گۆشـتی شـەکت بـۆ ئەکـرم!

نیزام: لە خوا ئەپاڕێمەوە، گازەردگ ئەحمەد ساق و سەلامەت بێ.

هەموو: ئامین یا ڕەبەلعالەمین.

## (حەوش و ماڵ و تەویلە)

ئەحمـەد لـە کۆڵانـەوە دێتـە نـاو حـەوش. ئەچـێ بـەرەو کادان و سـەوەتەیەک پـڕ لـە ئاڵـف ئـەکا و ئەیبـا بـۆ تەویلـە.

کەرەکە و گاکە لەسەر ئاخوڕەکەوە بەستراونەتەوە.

ئەحمـەد: حـە گیـان، حـە گیـان. شـەرت و ئـاە بـێ لـەم ئاڵفـە بخـۆی هـەر ئەمشـەو بـڕۆم و نیـم مـەن گۆشـتەکەی نیزامـە کوێـر بکـرم! ئـەی خـودای گـەورە!

ئاڵفەکە ئەکاتـە نێـو ئاخوڕەکـە و خـۆی دێتـە دواوە. کەرەکـە ئەچێتـە

بەرەو خەریک خواردن ئەبێ، بەڵام گاکە قەد سەری بەرزەوە ناکا.

غەم و پەژارە روخساری ئەحمەد دادەپۆشێ و لەسەر لێچ ئاخورێ روو بە کەر و گاکە دادەنیشێ و ئەچێتە نێو فکرەوە.

کەرەکە پڕ بەدڵ خەریک خواردنە.

گاکە سەری داخستووە و دیارە زۆر بەدحاڵە.

ئەحمەد: (سەر بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە) ئەی خودای گەورە، خۆت ئەزانی تەواو ماڵ و ژینی من بەم دوو سەر حەیوانەوە بەڕێوە دەچێ. بەڵام ئەگەر قسمەت وایە و بە قانوونی مەشیەت ئەبێ لەم دوو سەر حەیوانەم یەکێکیان لەبەین بچێ قەیدی نییە، منیش لەگەڵ مەشیەتی ئیلاهی شەڕ ناکەم.

ئەوەی بەو کەرە بۆم جێبەجێ ئەبێ، قەیدی نییە لەمەولا بە کۆڵی خۆم جێبەجێی ئەکەم. بەڵام گاکەم حەیفە، نە کەرەکەم جفت ئەکا و نە بۆ خۆم جفتم پێ ئەکرێ و نانی ئێمە لە شوخم (کێڵان)ی زەوی بەدەست دێ! کەوابوو خوایە هەرچی دەرد و بەڵای گازەردگە بکەوێ لە گیان کەرەڕەش و لەباتی گازەردگە کەرەڕەش بفەوتێ، ئامین یارەبەلعالەمین! خوایە من بەیانی گازەردگم ساق و سەلامەت لە خۆت ئەوێ! بەڵام کەرەڕەش بتۆپێنە، قەیدی نییە من لەگەڵ مەشیەتی تۆ شەڕ ناکەم.

هەڵئەستێ و سەوەتەکەی ئەدا بن دەست و ئەچێتە دەرەوە.

کەرەڕەش لەسەر ئاخوڕ خەریکی خواردنە و گازەردگ سەر لە خوار.

### (شەو نێومالّ)

ئەحمەد لەسەر بەرمالّ خەریکی خوێندنی نوێژە، دەست بۆ ئاسمان بەرزەوە ئەکا.

ئەحمەد: خوایە من بەیانی گازردگم ساق و سەلامەت ئەوێ، بەلاّم کەرەڕەش بتۆپێنە قەیدی نییە!

### (دەرەوە، شەو)

هەوا وردەوردە رۆشنەو ئەبێ و کەڵەباب دەست بە خوێندن ئەکا.

رۆژەوە ئەبێ.

ئەحمەد بەدەم دۆعاکردنەوە سەوەتەکە هەڵدەگرێ ئەیوا لە کاتی پڕکردنا چەند جار دەست بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە و تەمەنای گازەردگ ئەکا.

سەوەتە پڕ ئەکا و ئەچێ بۆ گەوڕ. وارید گەوڕ ئەبێ و چاوی ئەپەڕێتە تەوق سەرێ سەوەتەکە لە دەستی دائەکەوێ و بە هەردوو دەست ئەدا بەسەر خۆیا.

کەرەڕەش ساق و سەلامەت وێستاوە و گازەردگ مردارەوە بووە و لەنێو گەوڕدا کەوتووە!

ئەحمەد زۆر بەتووڕەیی تەماشایە کەرەکە ئەکا. جا ئەڕوانێ بۆ گاکە و دوایی بەرەو ئاسمان مۆڕێ ئەباتەوە و بەتووڕەیی لە تەویلە دێتە دەر.

بەتوندی لە مالّ دەردەچێ و کۆڵانەکان ئاوایی تێپەڕ ئەکا و ئەچێتە بەر مزگەوت.

نیزامــە کوێــر، گۆچــان بەدەســت دێــت و لەســەر ســەکۆی مزگــەوت دادەنیشــێ.

ئەحمەد ئەچێتە بەرەو.

ئەحمەد: بەیانی باش نیزام.

نیزام: سەلام کاک ئەحمەد، بەیانیی خۆت باش.

ئەحمــەد: بــۆت ئەکــرێ بــۆ تەنیــا کاتــێ لەگــەڵ مــن بیــت و پەنــج قەرانــێ کاســبی بکــەی؟

نیزام: بۆ ناکرێ، چی بکەم؟

ئەحمــەد: هیــچ، هــا ئەمــە پەنــج قەرانەکــە لەبــەرا بیــدەم، جــا هەســتە بــا بڕۆین.

نیزام: سەر چاو، بەزیاد بێ.

پەنــج قەرانەکــە ئەنێتــە گیفانــی و بــاڵ ئــەکا بەنێــو بــاڵ ئەحمــەدا و ئەکەونــە ڕێ.

دێنە ماڵەوە و ئەچن بۆ گەوڕ.

نیزام: ئەمە خۆ گەوڕە کاک ئەحمەد!

ئەحمەد: بەڵێ گەوڕە، ئافەرین!

نیزام: (دوای چەند جار بۆکێشان) گەوڕمت بۆ چی هێناوە؟!

ئەحمەد: خۆفت نەبێ کاکە، هەر ئێستا کارت تەواو ئەکەم.

نیزام: کاری من تەواو ئەکەی؟!

ئەحمەد: ئەرێ، راوێستە.

نیــزام گۆچانەکــەی بــە هــەردوو دەســت ئەگــرێ و خــۆی ئامــادەی دفــاع

ئەکا.

ئەحمەد: دوو حەیوان لەبەر دەستتدایە.

نیزام: دەی؟

ئەحمەد: یەکێک لەو حەیوانانە کەوتووتە سەر عەرز، یەکێکی ها سەر ئاخورەکەوە!

نیزام: دەی؟

ئەحمەد: دەی و دەڵەمە! دەست کێشە مل هەردووکیانا و پێم بێژە چ حەیوانێکن؟

نیزام لەپ ئەکوتێ بەسەر مل کەرەکەدا و دەست ئەکێشێ بە سەر پۆزە و گوێیدا.

نیزام: ئەمە کەرە!

ئەحمەد: وایە، ئێستا نەختێ بچۆ بەرەو و دەست بۆ ئەوە کەوتووە دەرێژەو بکە.

نیزام پا بەسەر عەرزا ئەخشێنێ و پێی لە گاکە گیر ئەکا، دادەنیشێ و دەست بە سەروملیا ئەکێشێ.

نیزام: ئەی داد و بێ داد، ئەمە گاکەتە! لائیلاهە ئیلەڵا!

ئەحمەد چاوی بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە.

نیزام: ئیدی چی بکەم؟

ئەحمەد: هیچ، کاری تۆ تەواو بوو، هەستە بتبەمە دەرەو.

نیزام هەڵدەستێ

ئەحمەد دەستی ئەگرێ و کێشان کێشان (بە ڕاکێشان) ئەیباتە

دەرەو.

نیزام ئەوا بەردەرگا.

ئەحمەد: خۆت خۆ ئەزانی بچیتەوە بۆ بەر مزگەوت؟

نیزام: بەڵێ وەڵا، خۆم ئەڕۆم.

ئەحمەد: دەی بڕۆ بەسلامەت!

نیزام: خواحافیز.

ئەکەوێتە ڕێ و ئەچێ و دوور ئەکەوێتەوە.

ئەحمەد سەر بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە.

ئەحمەد: (تووڕە) لەبیرت نەچێ خوایە! لەبیرت نەچێ نیزامە کوێر بە دوو چاوی قەلاپووتەوە، ئەزانێ ئەو دوو حەیوانە، کامی کەر و کامی گایە، بەلام تۆ کە ئەڵێن ئاگا و بینا و بەسیری، نەتزانی و لە جێ کەرەکەم، گاکەمت کوشت!

ئەچێتە ماڵەوە و بەتوندی دەروازەکە ئەکوتێ بەسەر یەکا (دەروازەکە پێوە دەدا).

# خوایە،
# ئەوەك ئەیدەی!

**پرسۆناژ:**

**- کابرای شرکەپۆشی هەژار، مامناوەندی.**

**- مجەویر (خادم)ی مزگەوت.**

**- چەند دوکاندار و ریبوار.**

کابرای هەژار و شڕکەپۆش لە کۆڵان و شەقامدا و شەیلانە، عومری لە پەنجا تێپەڕ بووە. پێڵاوەکانی چەک و دڕاوە، ئەچێتە نێو چایخانە ئەیکەنە دەرەو.

ئەچێتە کەبابی دەری دەکەن، ئەچێ بۆ حەمام فرکی ئەدەنە دەرێ، ئەچێ بە لای دیوارێکەوە ئەوەستێ و پاڵ ئەدا بە دیوارەکەوە و روو لە ئاسمان ئەکا.

کابرا: خوایە، خۆ خۆت ئەزانی لەنێو خەڵکدا رەحم و ریشە نەماوە! مروەت و ئینسانیەت و هەژارپەروەری نەماوە! هەموو شتێ بووەتە پارە و پارە و پارە! بەبێ پارە هیچ بۆ هیچ کەس نەماوە، عزەت و ئیحترام کەس ناگرێ، ئیدی بەسمە خودایە، ئەگەر ئیمتحانە پەنجا ساڵە ئیمتحانم ئەکەی! ئەگەر ئەزموونە، پەنجا ساڵە ئەیدەمە دواوە! ئیدی بەسمە خۆ لە خەزانەت کەمەوە نابێ، تۆ خودایی خۆت و خۆشەویستیی پێغەمبەرانت پوولٚ و پارەیێ بۆم بگەینە. ئەم دواییین ساڵەهاتی عومرە، لائەقەل یەک ساڵێ بە زک تێر و لەشی پۆشراو و عزەت و ئیحترامی خەڵکەوە بژیم! ئیدی بەسمە هەژاری و بێکەسی و داماوی! بەسمە، بەسمە، بەسمە!

نەختێ سەری ئەخورێنێ و ئەکەوێتە رێ.

بەدەم رێوە ئەگاتە بەر مزگەوتێ و ئەچێتە نێو حەوشی

مزگەوتەکـەوە.

کابـرای مجەویـر کـە خەریکـی گزگدانــی حەوشـەکەیە، چـاوی پێــی ئەکـەوێ، کابــرا ســەر دائەخــا و بــەرەو مســتەراح ئەچــێ.

مجەویر: ها بۆ کوێ؟

کابرا: بەڵێ؟

مجەویر: پرسیم بۆ کوێ؟

کابــرا: دەســت بەئــاوم هەیــە، ئەگــەر موشــکڵێ نەبــێ بــۆ مســتەراح ئەچــم، بــۆ مبــاڵ!

مجەویــر: باشــە بــڕۆ، بــەڵام هــۆش ئافتــاوە (مەســینە)کانت بــێ و دەســتیان لــێ نــەدەی!

کابرا: دەی جا من ئافتاوەم بۆ چییە بەقوربان؟!

مجەویر: وتم با وتبێتم و بزانی خۆم وام لێرە! بڕۆ.

کابرا ئەچێتە نێو مباڵەوە.

هــەر درگای مبــاڵ ئەکاتــەوە، چــاوی بــە یــەک کیســەی پــڕ لــە پــارە ئەکـەوێ کـە لــە شــان کونــای مباڵەکــەوە دانــراوە.

لەنــاگا، سێبەری پیـاوێ لەپشـت سـەر خۆیـەوە ئەبینـێ کـە واریـدی مســتەراحەکان ئەبــێ، هــەوڵ ئەبــێ (ئەپەشــۆکێ) خــۆی ئەخاتــە نێــو مســتەراحەکە کاتــی درگا بەســتن پــای لــە کیســە پارەکــە ئەکــەوێ و لــە کونــی گــەورەی مســتەراحەکەوە ئەکەوێتــە نــاو چاوانــەی مســتەراحەکە.

بــە دوو دەســتی ئــەدا بەســەر خۆیــا و لــە کونەکــەوە تماشــای خــوار ئــەکا.

کابــرا: (بــۆ خــۆی) چاکــە زۆر قــووڵ نییــە. ئەوەتــە کیســەکە دیــارە!

ئەگــەر بتوانــم بەقــەد یــەک گــەز خــۆم بکێشــمە خــوارێ، لــەم کونایــە ئەگاتــە دەســتم.

لە دەرکی مستەراحەکە ئەدەن.

کابرا: ئحۆ، ئحۆ!

کــەوا شــرِەکەی لەبــەر دەردێنــێ و بەســەرا خــۆی ئەکێشــێتە نێــو کونــا. دەســت درێــژەو ئــەکا بــۆ کیســەکە.

دەستی نــاگا، دیســان خــۆی درێــژەو ئــەکا و نووکــی قامکــی ئەگەینــێ بــە کیســەکە، نیــاز ئەبینــێ نەختــێ تریــش خــۆی بکێشــێتە خــوارەوە.

لەنــاگا تەعادوڵــی خــۆی لــە دەســت ئــەدا و بەســەرا ئەکەوێتــە خــوارەوە و بەپەلەقــاژێ خــۆی لــە خنــکان نەجــات ئــەدا و بــە ســەروکاپۆڵی غــەرق گەنــاو (گــواوی)، لەنێــو چاوانەکــەدا ئەوەســتێتە چــاوە و تەماشــای خــۆی ئــەکا تــا کەمــەر لــە گەنــاوا غــەرق بــووە!

دەســت ئەکوتــێ بەنــاو گەنــاوەکا و کیســەکە پەیــدا ئــەکا و بــە زەحمەتــی زۆر خــۆی لــە کونەکــە ئەکێشــێتە بــان.

کیســەکە ئەنێتــە گۆشــەیەکەوە و ســەر بــەرەو ئاســمان بــەرز ئەکاتــەوە و ئەڵــێ:

پــەروەردگار، نــەوەک تەمەنــای بەنــدەی هــەژاری خــۆت ئیجابــەت نەکــەی و پێــی نــەدەی و ئەیــدەی! بــەڵام تــا دوو قــوم گەنــاوی حەســاوی نەدەیــە دەرخــواردی، نایــدەی!

مجەویرەکــە خەریــک گزگدانــە و چــاوی لــە درگای مســتەراحە تاکــو بزانــێ کابــرا کــەی دێتــە دەرێ.

کابــراش لــەرووی هەڵنایــی بــەو شــکڵ و شــەمایلەوە بێتــە دەرێ.

دانیشتووە سەر چاڵاو مستەراحەکە و خەریک شۆردنی کیسە پارەکە و دەستانی خۆیە.

کابرا: (روو لە ئاسمان) خوایە تا ئێیرە باش بوو، زۆر لێت مەمنوونم. بەڵام کارێ بکە بەبێ قەرقەشە و دەردی سەر لێرەش بچمە دەرێ، لێت مەمنوون ئەبم.

لەناگا کابرای مجەویر لە بان سەر خۆیەوە ئەبینێ.

مجەویر: ئەوە خەریکی چیت؟! بۆ نایەیتە دەرێ؟!

کابرا هەوڵ ئەبێ و زوو کیسەکە ئەخاتە نێو باخەڵ کەواکەی و هەڵئەستێ.

کابرا: ببوورە ئەوە ئیدی ئەڕۆم، درگای مستەراحەکە ئەکاتەوە و ئەچێتە دەرێ!

مجەویر تماشایە سەرتاپای ئەکا و لێی مەشکووک ئەبێ.

کابرا: ببوورە خودات لەگەڵ.

مجەویر: راوەستە تۆ هاتی ئاوا نەبووی! چیت کردووە؟ لە کوێ وات لێ هاتووە؟!

کابرا دەست بە سەر کیسەکەوە ئەگرێ و دەردەچێ.

مجەویر بە گزگ ئەنیشێتە ملی و بە لێدان، دوو دەور حەوشەکەی پێ ئەداتەوە.

کابرا لە دەروازە دەردەچێ.

مجەویر بە شۆنیا ناچێ.

## (دەرەوە)

کابـرا بەهەناسـەبرکێ خـۆی ئەگەیەنێتـە جێگایەکـی چـۆڵ و پـاڵ ئـەدا بـە دیوارێکـەوە تـا ماندوویـی دەرکا.

دوای کاتێ سەر بەرەو ئاسمان بەرز ئەکاتەوە.

کابـرا: خوایـە زۆر لێـت مەمنوونـم کـەوا بـێ دەردی سـەر و قەرقەشـە لەوێـش نەجاتـم بـوو، زۆر مەمنـوون!

# بەشکردن
# وەکو خودا

پرسۆناژ:

- مامۆستا
- برای یەکەم
- برای دووەم

مامۆستا خەریک نووسینە و دوو نەفەر لەلای دانیشتوون.

مامۆستا نووسینی تەواو ئەبێ و دەسنووسەکەی ئەنێتە لاوە.

مامۆستا: جا ئێستا بڵێن بزانم ئیشتان چییە و من چیم لەدەست دێ بۆتان بکەم؟

نەفەری یەکەم: زۆر مەمنوونی تۆین مامۆستا گیان، هەروەها کە عەرزم کردی ئێمە دوو براین، باوکمان عومری داوە بە جەنابت و دوێنێ سێ رۆژەی تەواو بوو.

مامۆستا: خودا عەفووی بکا، بەڕەحمەت بێ ئینشائەڵا!

نەفەری یەکەم: شەریکی رەحمەت بی، باوکمان بەڕەحمەت بێ نە زۆر دارا و دەوڵەمەند بوو، نە زۆر هەژار و فەقیر. ئەوەی بۆ من و ئەم برامە لە باوک بۆمان جێ ماوە، ئەمەتە لەنێو ئەم کاغەزە نووسیومانە و هاوردوومە خزمەت جەنابت کە تۆ بە شێوەیەکی خواپەسەندانە، بۆمانی بەش کەیت.

مامۆستا: سەرچاو بیدە بزانم.

کاغەزەکەی لە دەست ئەسێنێ بەوردی تەماشای ئەکا.

مامۆستا: بەڕەحمەت بێ، شوکر باشی بۆتان بەجێ هێشتووە! وا نییە ؟

برای یەکەم: بەڵێ وەڵا خودا عەفووی بکا.

مامۆستا: جا ئێستا پێم بڵێ بزانم وەکوو خۆم بۆتانی بەش بەش کەم یان وەکوو خودا؟

برای یەکەم: وەکوو خودا مامۆستا گیان! دیارە هەموو شتێ ئەبێ وەکوو خودا بکرێ تاکو باش بکرێ!

مامۆستا: باشە بەسەرچاو من ئەمشەو لە رووی ئەم کاغەزە هەموو شتێکتان بۆ وەکوو خودا بەش دەکەم، تۆ بەیانی وەرە بیبەوە.

برای یەکەم: زۆر سوپاست دەکەم مامۆستا گیان.

(روو لە برا) هەستە کاکە گیان هەستە! ئیدی زەحمەت کەم کەین.

هەردوو هەڵدەستن.

برای یەکەم: دەی تا بەیانی خوداتان لەگەڵ.

مامۆستا: سەرچاو، بەیانی ئەوەڵ وەخت وەرەوە بیبە.

برای دووەم: خوداحافیز.

مامۆستا: سەرچاو بەسلامەت.

هەردوو برا ئەچنە دەرێ.

مامۆستا نەختێ کاغەزەکە ئەمدیو و ئەدیو ئەکا و فرکی ئەداتە گۆشەیەکەوە.

## (فەید ئەوت، فەید ئین)

مامۆستا کاغەزەکە ئەداتە دەست برای یەکەم.

مامۆستا: ئا کاکە گیان دەقیق وەکوو خودا بۆتانم بەش کردووە.

برای یەکەم: دەستت خۆش بێ.

مامۆستا: سەرت خۆش بێ.

برای یەکەم: جا بفەرموو بزانین...

مامۆستا: جارێ بڕۆن حەساباتی خۆتان بکەن، دوایی دێنەوە بۆ لام، بڕۆن ئیستا پێویست ناکا.

برای یەکەم: باشە بەقوربان، دوایی خۆم بە خزمەتت ئەگەم.

مامۆستا: سەرچاو هاتن بڕۆن جارێ.

هەردوو ئەڕۆن.

مامۆستا مەشغووڵی نووسینی دەفتەر ئەبێ.

## (فەید ئەوت و فەید ئین)

مامۆستا لەنێو حەوشی ماڵەکەی خۆیدا خەریک گوڵ و گیا ئاودانە.

هەردوو برا کاغەز بەدەست دێنە نێو حەوشەوە.

برای یەکەم: سەلام مامۆستا ماندوو نەبی.

مامۆستا: سەلام بەقوربان چاکی شوکر؟

برای یەکەم: زۆر مەمنوونم مامۆستا گیان ئا ئەمە چە بەشکردنێکە بەقوربانت بم؟

مامۆستا: بۆ؟ خراپم بەش کردووە؟

برای یەکەم: ئەمەتە ئیدی! بیدە براکەت باخەکەی بەر دێ!

باخچەککەی بەرماڵ باکو بۆ خۆت بێ! هەڵی گرە بۆ خۆت چاروا

کوێتەکـە، بیـدە بـە بـرات یابـووە شـێتەکە! رانەکـەی گـەوڕ هەمـووی بـۆ خـۆت بـێ، بـرات لـە مریشـک رانێکـی بـە پـێ! گا زەردگ بـۆ خـۆت بـۆ ئـەو کـەرەڕەش، خـواوەن تەعـالا هـەر وا ئەیـکا بـەش... ئا ئەمانـە چییـە مامۆسـتا گیـان؟!

مامۆسـتا: هـەوەڵ لێتـم پرسـی وەکـوو خـۆم بەشـی کـەم یـان وەکـوو خـودا؟ خـۆت فەرمـووت وەکـوو خـودا؟ منیـش هـەر وەکـوو خـودا بۆتـم بـەش کـردووە!

برای یەکەم: خودا وای بەش ئەکا؟

مامۆسـتا: ئەگـەر وای بـەش نەکـردووە، تـۆ چـۆن دەمـت بگـرن بـە لـووت و گـوێ قسـەی خـۆت ئەکـەی، بـەڵام براکـەت تەنانـەت لـە سـەلام و ئەحواڵپرسـییەکی سـادە و سـاکار بێوەرییـە؟ مەگـەر هـەردوو کـوڕی دایـک و باوکێـک نیـن؟!

برای یەکەم: بەڵێ وەڵا وایە!

مامۆسـتا: بەمـە ئەڵێـن قسـەی حەسـابی. سـەرچاو. کاغەزەکـەت دانـێ، نانـی بەیانـی بێـرەوە، بییـەوە کاکـە گیـان.

برای یەکەم: کاغەزەکەی دوو دەستی تەقدیم ئەکا.

برای یەکەم: بفەرموون.

مامۆستا: سەرچاو هاتی.

هەردوو برا ئەچنە دەرەوە.

مامۆسـتا کاغەزەکـە ئەنێتـە باخەڵـی کەواکـەی و خەریـک ئاودانـی گوڵـەکان ئەبـی.

# بانگی ناوەخت

پرسۆناژ:

- ئەمین جەوانی دێهاتی
- پیرەپیاوی ئاسنگەر
- سەرگەزمەی زاڵم
- حاکمی عادڵ
- ژنی ئەمین
- دوو نەفەر ژێردەستی سەرگەزمە
- دوو نەفەر قەرەوڵ و حاریسی دەربار
- دوو نەفەر خادمی دەربار
- ڕێجالی دەرباری

ئاسـنگەری پیـر خەریکـی سـازکردنی داسـە و بەسـەر سـندانەکەیدا پیکـی لـێ ئەوەشـێنێ.

کابرایەکی جەوانی توورە دێتە نێو دوکانەوە.

جەوان: ڕۆژباش مامە ئاسنگەر!

ئاسنگەر: ڕۆژباش کوڕم، چیت ئەوێ؟

جـەوان: شمشـێرێکی زۆر تیـژ کـە بـە یـەک زەربـەت، سـەر لـە لـەش جیـا بکاتـەوە!

ئاسنگەر تماشایەکی سەرتاپای کابرا ئەکا.

ئاسـنگەر: لـەوە ناچـێ پیاوێکـی شەڕاشـۆ بـی کـوڕم، شمشێری تیـژی سـەر لـە لـەش جیاکـەرەوەت بـۆ چییـە؟!

جـەوان: چـی بڵێـم مامـە گیـان، لـە ئـاوا شـارێکدا کـە هیـچ قانـوون و مەدەنیەتـێ بەڕێـوە نابـرێ و شمشـێری تیـژ بـە دەسـتی زاڵمەوەیـە، بـە تەنیـا شمشـێری تیژتـر ئەتوانـێ حەقانیـەت بەڕێـوە بـەرێ و حـەق هـەژار لـە زاڵـم بسـێنێ!

ئاسنگەر: زوڵمت لێ کراوە؟

جـەوان: بەڵـێ، زوڵمێکـی زۆر نالەبـار و کـەس نییـە گوێـی لـە هـاوارم بێ!

ئاسـنگەر: ئـەم شـارە حاکمێکـی زۆر عادڵـی هەیـە! حاکمێکـی موسـڵمان

و ئەهلی نوێژ و عیبادەت!

جەوان: بەڵێ وام بیستووە، بەڵام نوێژ و عیبادەتی ئەو بە کاری من ناخوا، چونکو زیاتر لە دە جار چوومە دەرگانەی و گەزمەکان بە شەق و زللە دەرمیانکرد! نوێژ و عیبادەتی ئەو بۆ قیامەتی خۆیە! دنیای بەدەست هێناوە، پێی خۆشە قیامەتیش بۆ خۆی ساز کا! چیی بە سەر رەنج و عەزابی منەوەیە؟!

ئاسنگەر: بەر لەوە خۆت تووشی رەنج و عەزابێکی زیاتر بکەی، بە من بڵێ بزانم چیت لێ قەوماوە؟ بەڵکوو توانیم کارێکت بۆ بکەم!

جەوان: چی بڵێم مامە گیان، خەڵکی لادێم، تازە ژنم هێناوە، بەقەد سێ مانگێکە. ژنەکەم دووچاری ژانەسەرێکی پیس بووبوو و بەبۆنەی ئەو ژانەسەرەوە، ژیانی لە خۆی و لە من تاڵ کردبوو. خەڵکی ئاوایی وتیان ئەم جۆرە ئێشانە بە حەکیمی شار چارەسەر ئەبێ. نەختێ پارەم هەبوو هەڵمگرت و ژنم سواری چاروا کرد و سێ شەو و سێ رۆژ، ئاوایی بە ئاوایی خۆمم گەیاندە شار. کاتێ گەیشتین شەو بوو، چون ئاشنا و کەسوکارمان نەبوو پەنای پێ بەرین و شاریش وەکوو لادێ نییە خەڵک بەئاسانی پەنات پێ بدەن یاخۆ بچیە مزگەوتەوە، بە ژنەکەم وت تۆ لە سەر چارواکە بخەوە، منیش هەتا بەیانی چارواکە بە شوێن خۆما ئەکێشم و ئەگەر رۆژەوە بوو، ئەچینە لای حەکیم. هێشتا دوو ساعەت لە وەیلانی و سەرگەردانیی ناوشارم رانەبوارد کە سەرگەزمە و دوو مەعمووری حکوومەتیمان لێ پەیدابوو و وتیان بۆ ئەم چاروا و ئەم ژنە بە ناوشارا ئەگەڕێنی؟

باس ناخۆشی و ژانەسەری ژنەکەمم بۆی کرد و وتم چون خزم و

کەسوکارمان نییە، بەناچار وەیلانی شار بووین و ماتڵین ڕۆژەو بێ بیبەمە لای حەکیم.

پرسی: من لە کوێ بزانم ئەم ژنە ژنی تۆیە؟

وتم: هەر ئەوەی کە پێکەوەین نیشانە.

وتی: شاهێدت هەیە؟

وتم: لە دێیا بەڵێ، بەڵام لە شارا، هەروا کە وتم، کەس ناناسم.

وتی: بەڵام من ئەڵێم، هەم ئەو ژنەت دزیوە هەم چارواکە!

هەوسار ئەسپیان لە دەسم دەرهێنا، هەرچی هاوار و داد و بێ دادم کرد، گوێیان بە قسەم نەدا و دامیانە بەر مشت و لەقە و چاروایان کێشان کێشان برد بۆ مەقەڕی حکوومەتی. نە گوێیان لە من گرت نە لە شیوەن و گریانی ئەو ژنە هەژارەم. سەرگەزمە ئەڵێ بڕۆ چوار کەس لە ئاوایی خۆتان بێنە شەهادەت بدەن کە ئەو ژنە ژنی تۆیە و ئەو چاروا، چاروای تۆیە تا پێتی بدەمەوە!

دەستم بە گریان کرد، ئەوەی پارەم پێ بوو کردمە دوو کوتەوە، کوتێکم پێیان دا، تەنانەت وتم، چارواکەشم بەرن، ژنەکەم بدەنەوە. نەیانکرد و ئەلان حەوت ڕۆژە من وەیلان و سەرگەردانم و کەس لە هاوارم ناگا! ئیدی چارەیەکم نەماوە کە سەر لە لەشی گەزمەی سەگباب جیا کەمەوە و دوایی خۆم بکوژم!

ئاسنگەر: عەجەب! بیستوومە سەرگەزمە پیاوێکی فاسید و پیس و بێ ئابڕووە، بەڵام نە ئەوەندە! تۆ بڵێی بێشەرەفییان لەگەڵ ئەو ژنەت نەکردبێ؟

جەوان: نازانم، هەر ئەوەندە ئەزانم ئەگەر زیندوو بێ، حیفازەتی

خۆی کردووە و ڕێگەی نەداوە، مەگەر ئەوەی گیانی تێدا نەبووبێ!

ئاسنگەر: ئافەرین، ئافەرین بۆ ژنت، هەر ئێستا پێکەوە ئەڕۆین و من بە گەزمە ئەڵێم، من ئەتانناسم و ئەزانم ئەو ژنە، ژنی خۆتە، جا بڵێ بزانم نێوی چییە؟

جەوان: نێوی مەریەمە.

ئاسنگەر: خۆت نێوت چییە؟

جەوان: ئەمین، مامە گیان من نێوم ئەمینە.

ئاسنگەر: باشە ئەمین، ڕێ کەوە با بڕۆین. (ڕوو لە شاگرد) هۆش دوکانەکەت بێ ڕۆڵە.

شاگرد: (لەپشت دەمەوە) سەرچاو.

لەگەڵ ئەمین ئەچنە دەرێ.

## (مەقەڕ)

سەرگەزمە: هێ! تۆ لەم شارەدا بە پیاوی چاک بەنێوبانگی و ئەهلی نوێژ و عیبادەت و تاعەتی! درۆکردن بۆ تۆ زۆر عەیبە!

ئاسنگەر: ئەڵێم من ئەزانم و سوێند ئەخۆم کە ئەزانم ئەم کوڕە مێردی ئەو ژنەیە!

سەرگەزمە: ئەگەر ئەیانناسی بۆ نەیانتبردە ماڵی خۆت کە وەیلانی کووچە و کۆڵان نەبن؟

ئاسنگەر: ئێستا هاتووم بیانبەم.

سەرگەزمە: باشە ئەگەر وایە، بارمتەیەکی قورس بەلامەوە دانێ، سەرچاو، بەری ئەدەم.

ئاسنگەر: من هیچ بارمتەیەکم نییە، یان ئەو ژنە بەردە و چاروگەیان بەرەوە، یان هەر ئێستا ئەچمە دارولحکوومە و کۆشکی حاکم!

سەرگەزمە: هن! برۆ، حاکم چاوەڕێتانە!

ئاسنگەر: (رۆڵە ئەمین) برۆین، رێ کەوە!

هەردوو پێکەوە ئەچنە دەرێ، سەرگەزمە دەست ئەکا بە کەنین.

## (بەرەو دارولحکوومە)

ئەمین لەگەڵ ئاسنگەر خۆیان ئەگەیەننە بەر دەرکی سەرای حکوومەتی، دوو حارس و نیگابان لەملا و لەولای درگاکەوە راوێستاون:

چیتان ئەوێ؟

ئاسنگەر: هاتووین برۆینە خزمەت حاکم.

حارس: حاکم پەزیرای کەس نییە، ئەبێ راوێستی تا نزیکی نەورۆز و لە کاتی باری عامدا چاوت پێی کەوێ.

جەوان: نەموت ناهێڵن؟!

حارس دووەم: مەگەر پێتم نەوت ئیدی لەم دەوروبەرا پەیدات نەبێ؟

ئاسنگەر: بەڵام من ئەبێ هەر ئەمڕۆ حاکم زیارەت کەم.

حارس: ئەگەر بۆت کرا سڵاوی ئێمەشی پێ رابگەیەنە! (پێکەنین)

ئاسنگەر: حاکم ئاوا پیاوێ نییە مەزڵوومێ لە دیداری خۆی مەحرووم بکات!

حارس: بەڵێ وایە، بەڵام بە ئێمە هیچ ناکرێ. بڕۆن لە سەرگەزمە کات وەرگرن، شایەد بۆ دیداری بەر لە نەورۆز کارێکتان بۆ بکات.

حارسی دووەم: یانی بۆ پەنج مانگی دیکە! (هەردوو ئەکەنێن)

ئاسنگەر: بەڵێ وایە. (روو لە ئەمین) بڕۆین رۆڵە با بڕۆین.

ئەمین: بڕۆین؟!

ئاسنگەر: ئەرێ، دوای بانگدان حەتمەن چاومان پێی ئەکەوێ. (ئەڕۆن)

ئەمین: بانگدانی کەی؟!

ئاسنگەر: بانگدانی ئێستا!

ئەمین: ئێستا؟! ئێستا کەی کاتی بانگدانە؟!

ئاسنگەر: کاتیشی نەبێ، ئێمە ئەیکەینە کاتی!

ئەمین: چۆن؟!

ئاسنگەر: بڕۆینە سەر ئەو تەپۆڵکە بەرزە تا بۆت بڵێم.

## (تەلاری حاکم)

حاکم لەنێو تەلاردا پاڵی داوەتە باڵش (سەرین)ەوە بەدەم میوەخواردنەوە خەریک خوێندنەوەی کتێبە.

## (دەرەوە)

ئاسنگەر ئەچێتە سەر تەپۆڵکەکە و دەست ئەنێتە سەر گوێی. ئەمین بەحەیرەتەوە تماشای ئەکا.

## ( تەلار)

حاکم خەریکی خوێندنەوەی کتێبە و دوو خادم لە بەردەرکی تەلاردا دەستەونەزەر راوێستاون.

دەنگی بانگدان لە دوورەوە بەرزەو ئەبێ.

دەنگی ئاسنگەر: ئەڵاهوو ئەکبەر، ئەڵاهوو ئەکبەر. ئەڵاهوو ئەکبەر، ئەڵاهوو ئەکبەر.

حاکم برۆ ئەباتە یەک و گوێی شل ئەکا بەئارامی کتێبەکە ئەنێتە سەر عەرز.

حاکم: ئەمە چ کاتی بانگدانە؟! (روو لە خادم) کاتی بانگدانە؟!

خادم: نە گەورەم.

حاکم: ئەو کافرە کێیە بانگی ناوەختی هەڵداوە؟

خادم: بە گوێم نائاشنایە گەورەم!

حاکم: برۆ بزانە کێیە، بیگرە و بیهێنە لای من.

هەرکەس هەیە یان شێتە یان موعتەرز، برۆن، برۆن بیهێنن!

هەردوو خادم ئەچنە دەرێ.

حاکم ئەچێتە نێو فیکرەوە.

## (فەید ئەوت، فەید ئین)

حاکم: (زۆر توورە) تۆ چۆن کاری وات کردووە؟

سەرگەزمە: غەڵەتم کرد (ناماقووڵیم کرد)!

حاکم: لە کەیەوە خەریکی ئەم جۆرە ئیش و کارانەی؟

سەرگەزمە: زۆر نییە گەورەم، وام ئەزانی خەریکی خزمەت بە ئەخلاقی مرۆڤ و ناموسی خەڵکم!

حاکم: بە بێناموسی خزمەت بە ناموسی خەڵک ئەکەی، بەدزات؟ سەروچاوی ئەو ژنەت بۆ خوێناوی کردووە؟

سەرگەزمە: لێی بپرسە گەورەم، کاری خەتا لێم سەری نەداوە.

حاکم: پرسیومە، رێی پێت نەداوە.

سەرگەزمە: سوێند ئەخۆم گەورەم، سوێند ئەخۆم ئیدی تێکرارەو نابێ!

حاکم: سەگ بوەسنە دەست رەفێقەکانیەوە، خۆشی بەرەودوا سوار کەر کەن و بە سووکایەتیی زۆر شارەودەریان کەن کە ببن بە عیبرەت بۆ هەموان! ها دەی!

سەرگەزمە و دوو هاوکاری بە سووکایەتی لە تەلار ئەکێشنە دەرێ. ئەمین و ژنەکەی بەخۆشحاڵییەوە تماشای یەک ئەکەن. ئاسنگەر لەسەر عەرز روو بە حاکم دانیشتووە!

حاکم: (روو لە ئاسنگەر) من زۆر مەمنوونی خۆت و ئەو بانگە ناوەختەی تۆم کە ئەگەر نەبوایێ، زوڵم زۆر ریشەی دەکوتا و ژیانی خەڵک بێ ئەوەی من ئاگەدار بم، ئەبوو بە ژەحری مار! لەمەودوا تۆ چاو و گوێی من بە و هەر زوڵم و زۆرێکت دی، وەعدەی دیداری من و تۆ بانگی ناوەخت بێ!

ئاسنگەر: سەرچاو گەورەم، زۆر سوپاسی گەورەییت دەکەم.

حاکم: (روو لە پیاوێکی دەربار) زەرەر و زیانی ئەم پیاوەش بۆی جوبرانەوە بکەن و ژنەکەی بە خەرجیی دەربارەوە بەرنە لای حەکیم

و هەموو ئیشەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن و بە سەروسۆقاتی باشەوە ڕەوانەی دیاری خۆیان بکەنەو.

ئەمین و ژنەکەی سەری تەعزیم دائەنەوێنن.

ئاسنگەر بەخۆشحاڵی لایان لێ ئەکاتەوە.

# ژنێ بێنە بۆ کەرەکە!

پرسۆناژ:

- خوامرا، پیر.
- شامرا جەوان، سیساڵە.
- پیاوی بەر چایخانە.
- چەند پیاوی موشتەریی نێو چایخانەکە.

چڵوچێوی زۆر دراوه لــه کەرەکـه و کا خوامــرا لــه بەیــن بارەکــه دانیشــتووه و هــۆره ئەچــڕێ...

شامرا کۆری، هەوسار کەرەکەی گرتووه و به شوێن خۆیا ئەیکێشێ.

هـۆره: واو واو واو چـرا مەسـۆزۆ تـا سـوب سـپی بـۆ... داخـۆ بەیانـی دەوران وه کـێ بـۆ؟

کا خوامــرا بــەدەم هۆرەکەیــەو تماشــای شــامرا ئــەکا و پینەوپــەڕۆی جلوبەرگەکــەی ئەبینــێ و هەناســە هەڵئەکێشــێ.

هـۆره: پیـری و بـێ کەسـی و هــەژاری هــەر سـێ... نــەوێ وەنەسـیو، بــار هیــچ کەسـێ.

خوامرا: رۆڵه شامرا، تۆ لەم دنیایه ئاواتت چییه؟

شامرا: بەڵێ؟

خوامرا: بۆ داهاتووی ژیانت ئاواتت چییه؟

شامرا: هیوا و ئاوات؟

خوامرا: ها؟ چییه؟

شــامرا: هیــوا و ئاواتــم ئەوەیــه خــوزگا لــه خوزگایــی خــوا، یــا هیــچ ئاواتــم نەبوایــێ، یــان یــەک ئاواتــم بهاتایــه دی.

خوامرا: کام ئاوات؟

شـامرا: چووزانـم، ئـەو ئاواتـەی وا هـەر جەوانـێ لـە تەمەنـی منـدا، ئەڵێـن هەیەتـی.

خوامرا: لە تەمەنی تۆدا، چ ئاواتێ هەیە؟

شامرا: چووزانم بابە گیان، تۆ لە تەمەنی مندا بووی، ئاواتت چی بوو؟

خوامرا: من لە تەمەنی تۆدا بووم، ئاواتم زۆر بوو، یەکێ لە ئاواتە گەورەکانم ئەمە بوو، خوزگا هەموو رۆژێ نەورۆز بایا و من بچوام بۆ شایان و هیلکەشکانێ! یان بە ئاوات بووم لەگەڵ بابم بچم بۆ شار و کەواوپاتۆڵی تازە بکرم، درۆم نەکردبێ ئاواتی تۆش ئەوەیە کەواوپاتۆڵی تازە بکری بۆ ئەملاو ئەولا، وایە؟

شامرا: بابە گیان عەڵبەت پێم خۆشە بە جلوبەرگی نوێوە بەو ئاواتەم بگەم، بەڵام جلوبەرگی نوێ خۆی بۆم ئاوات نییە.

خوامرا: تێ گەیشتم، بە ئاواتی بە جلوبەرگی تازەوە بچی بۆ هیلکەشکانێ! وایە؟

شامرا: نە بابەگیان! ئەوە ئاواتی خۆت بووە، من حەزم لە هیلکەشکانێ و ئەو شتانە نییە.

خوامرا: چۆن دڵت دێ! نووک یان قۆڵەت نەکردووە، بزانی چەندە خۆشە! نووک یان قۆڵە؟ قۆڵە یان نووک؟ (پێکەنین) ئای جوانی (جەوانی)! ئای جەوانی هەتا لە لام بووی قەورتم نەزانی! بەڵام ئاواتی خۆم بۆ تۆ شتێکی دیکەیە، بەڵام، پێت ناڵێم چییە تا خۆت بۆمی نەدرکێنی.

شامرا: چی بدرکێنم بابە گیان؟ ئاواتەکەی تۆ کە بۆم هەتە؟!

خوامرا: ئەرێ رۆڵە پێم بڵێ، باکو بزانم چەندە رۆحم بە رۆحتەوە نزیکە؟! بڵێ بڵێ.

شامرا: ئاخر لەرووم هەڵنایێ بابەگیان! هیچ کوڕێ لەرووی هەڵنایێ شتی وا بە باوکی بڵێ.

خوامرا: (ئەچێتە نێو فکرەوە) ها تێ گەیشتم چییە؟!

شامرا: چییە؟

خوامرا: ئەزانم رۆڵە، ئەزانم، بەڵام ئەو شتانە ئیدی لە تەوانی مندا نییە رۆڵە! یانی ئیدی بۆ من عەیبە کورم. بەتایبەت لە دوای ئەو دایکە هەژارەی تۆ کە زۆر بۆم خۆشەویست بوو، ئێستاش هەر دڵ بەدوای ئەوم.

شامرا: چی؟

خوامرا: ئەزانم رۆڵە، ئەزانم بەئاواتی ئەمن ژنێکی دیکە بێنم و لەم تەنیاییە وەدەر بێم. بەڵام لەرووت هەڵنایێ، چون ئەوە رەسم و یاسای هەموو دەورانێکە، ئەوەیە کە باب بۆ کوڕی خۆی قۆڵ و مەچەکی هەڵکا و بیکا بە زاوا، نەوەک کوڕ باوکی خۆی بکا بە زاوا.

شامرا: وایە بابەگیان وایە!

خوامرا: نە رۆڵە ئیدی بۆ تەمەنی من زۆر عەیبە.

شامرا: وایە.

خوامرا: من زۆر مەمنوونی تۆم رۆڵە! زۆر بە دەستەوە رازیم، خوات لێ رازی بێ کە ئەوەندە لە فکری منداێ! یەکێک لە ئاواتەکانی من ئەوەیە کە ئینشائەڵا ساڵانی دیکە ئەم کەرە بفرۆشم و دەست کچێ بۆ تۆ بگرم و پارەکەی بکەمە خەرجیی زەماوەند و ژنهێنانی تۆ.

شامرا: ئینشائەڵا بابەگیان ئینشائەڵا مورادی دڵت حاسڵ بێ.

لە حاڵی دوورکەوتندا.

خوامرا: ئەرێ رۆڵە تازەودوا من بۆ چیمە؟ تازەودوا من ئەبێ لە بیری قیامەتی خۆمدا بم.

شامرا: وایە بابەگیان وایە، بەڵام لە خوام تەڵەبە تەمەندرێژ بی.

دوور ئەکەونەو لە چاو ون ئەبن.

## (بەر چایخانەی ئاوایی)

چەند کەس لە بەر چایخانەدا دانیشتوون.

شامرا و خوامرایشیان لەگەڵە و کەرەکەیان لە گۆشەیەکەوە بەستووەتەو خەریک لەوەڕە.

پیاوی یەکەم: خەبەرات مامە خوامرا؟

خوامرا: خەبەر سەلامەتیی جەنابت.

پیاوی یەکەم: ئەرێ تۆ بەتەما نیت سەروسامانێ بە ژیان ئەم کوڕەت بدەی؟

خوامرا: کاتێ کە خۆی باسی ناکا من چیم لەدەس دێ؟

پیاو: شامرا نەختێ خەجاڵەتی و کەمڕووە مامە خوامرا. گاهەس خۆی لەڕووی نەیێ، تۆ ئەبێ لە خەیاڵیدا بی و کارێکی بۆ بکەی.

خوامرا: ئەو زیاتر لە خۆی لە بیری مندایە و هەر ئەڵێ، بابەگیان بۆ لە فکری خۆتا نیت؟

شامرا تەماشایەکی بە مەعنای باوکی ئەکا.

خوامـرا: بـاوەڕ ناکـەی ئەوەتـە لـە خـۆی دەپرسـم. ئـەرێ ڕۆڵـە گەورەتریـن ئاواتـی ژیانـت چییـە، بڵـێ بـا هەموویـان بژنـەون.

شـامرا: گەورەتریـن ئاواتـم، گەورەتریـن ئاواتـم ئەوەیـە کـە تـۆ کەرەکـە بفرۆشی.

خوامرا: فەرموون.

دانیشتوان تماشایەک یەک ئەکەن و روو لە شامرا ئەکەن.

پیاوی یەکەم: گەورەترین ئاواتی ژیانت فرۆشتنی کەرەکەیە؟!

شامرا: بەڵێ.

پیاو: بۆچی؟

خوامـرا: بـۆ ئـەوەی مـن بتوانـم بـە پارەکـەی ژنـێ بـۆ خـۆم بێنـم، ئێـوە ئاواتـی واتـان دیوە؟!

پیـاو: تـۆ شـێتی کابـرا؟! تـۆ عەقڵـت هەیـە؟ کام پیـاوی عاقـڵ ئـاوا ئاواتێکـی هەیـە؟! تـۆ خـوا بەڕاسـت وایـە؟

شامرا: کوڕە نەوەڵا، شتی وا چۆن ئەبێ؟

پیاو: ئەی چۆن؟ ئەی چۆن باوکت وا ئەڵێ؟

شامرا: وەڵا باوکم (خوامرا ئەپەڕێتە ناو قسەکەی)

خوامـرا: ئـەم کـوڕەی مـن زۆر باحەیایـە. شـوکر بـۆ خـودا، هـەزار شـوکر بـۆ خـودا، کـەس کـوڕی وای نییـە! مـن کـوڕی وا شـک نابـەم کـە تـەواو ئاواتـی راحەتـی و ئاسایشـی باوکـی بـێ و قـەد لـە بیـری خۆیـدا نەبـێ! ڕۆڵـە بـڕۆ دەسـتی خـودا پشـت و پەنـات بـێ و هەتـا مـاوی دەسـتی خاڵـی بـە گیفانـدا نەکـەی.

شـامرا: دەسـتی خاڵـی بـە گیفانـدا نەکـەم یـان دەسـت بـە گیفانـی

خاڵیـدا نەکـەم؟

خوامـرا: هەردووکـی ڕۆڵـە، ئەوەنـدە مـن بـە دەس تـۆوە ڕازیـم، خـودا و پێغەمبـەرت لـێ ڕازی بـێ، زۆر کەمـڕووە کاکـە، زۆر کەمـڕووە، شـتی وام نەدیـوە!

پیـاو: ئـەڕێ کاکـە ڕاوێسـتە بـا خـۆی جوابـی خـۆی بداتـەوە! خـۆ تـۆ نامێڵـی ئـەو قسـەی دڵـی خـۆی بـکات!

خوامـرا: بـۆ نامێڵـم، ئەوەتـە قسـەی دڵـی خـۆت بکـە ڕۆڵـە، قسـەی دڵـی خۆتیـان بـۆ بکـە باکـو بزانـن چ دڵێکـت هەیـە باوکەکـەم، بڵـێ.

شـامرا: (کەوتووەتـە نێـو حەیـا، مەنـزووری قسـەکانی باوکـی) وەڵا چـی بڵێـم، بابەگیـان چـی بڵێـم!

پیـاو: تـۆ بەڕاسـتی گەورەتریـن ئاواتـت ئەوەیـە باوکـت لـەم تەمەنـەدا ژن بهێنـێ؟!

شامرا: کوڕە وەڵا وا نییە کاکە.

خوامرا: (بە مۆڕپیردنەوە) ئەی چۆنە ڕۆڵە! ئەگەر وا نییە.

شـامرا: (ڕوو لـە کابـرا) ئەزانـی چۆنـە کاکـە گیـان، مـن ئەڵێـم ئـەو، ئـەو کـەرە بەسـتەزمانە، عومـری لـە سـی سـاڵ تـێ پەڕیـوە! مـن ئەڵێـم لەمـە زیاتـر خـوا هەڵناگـرێ گوناحـە! مـن ئەڵێـم بابـە گیـان مـن بفرۆشـە، بـە پارەکـەم ژنـێ بهێنـە بـۆ ئـەو کـەرە بەوبەختـە! خراپـم وتـووە؟!

هەموو بەحەیرەتەوە تماشای شامرا ئەکەن!

باوکی بێ قسە و باس تماشای ئەکا و ئەچێتە نێو فکرەوە!

# ئاواتی شار

پێرسوناژ:

- مەحیە، جەوانی لاوازی لادێیی
- دایکی مەحیە
- خاڵی مەحیە
- سوەیبە
- رێبواری پیر
-چوار دزی قومارباز
- خاوەن لاتاری و دوو هاوڕێی
- کابرای کەبابخۆر
- کەبابچی و شاگردەکەی
- کابرای ئیفلیج
- کابرای ئاڵف فرۆش
- کابرای خوانچەدار
- چوار پیاوی خوانچەبەر

## ماڵی لادێ (شەو)

مەحیە لەناو جێگەکەیا راکشاوە و گوێی لە قسەی خاڵۆ و دایکیەتی کە لە دیوەکەی تردان.

دایک: ئەی چۆن، بیست ساڵ لەمەوبەر خۆت رەشورووت لەم ئاواییە چوویتە دەرێ و لە شاردا بە هەموو شتێ گەیشتی! کوڕەکەی منیش وەکوو خۆت! وەک خاڵۆیەکی باش و دڵسۆز بیگرە ژێر باڵت، جا بزان ئەگەر لە خۆت زیرەکتر نەبوو، هەرچی ئەیژی، بیژە.

خاڵۆ: گوێ گرە و لە قسە حاڵی بە خوشکە، دە ساڵ لەمەوبەر ژیان شکڵ و شەمایلێکی تری بوو، خەڵک جۆرێ تر بوون! جیا لەوەش من بەڵای زۆرم بەسەر هات و جەزرەوەی زۆرم کێشا تا نیشتەجێ بووم، ئەو کوڕەی تۆ کوڕی شار نییە، من بیبەم هەم لە شار ئەبێ هەم لە دێ!

مەیکە با لەو جێگایە وا بە دنیا هاتووە، هەر لەوێش رێگای ژیانی خۆی بدۆزێتەوە!

مەحیە لە قسەکانی دایکی خۆشحاڵ ئەبێ و لە قسەکانی خاڵۆی تووڕە و خەمین.

دایک: تۆش گوێ شل کە بزانە من چی ئەڵێم، من چونکە جگە لە تۆ هیچ کەس لەم دنیایە شک نابەم، هەر بۆیە هیوا و ئومێدم

ئـەوەڵ بـە خوایـە و دوایـی بـە تـۆ، ئەگـەر ئەمـەت بـۆم کـردم و ئـەم کـوڕەت لـەم ئاواییـە وێرانـە بـردە دەرەوە، هەتاهەتایـە لـە دوعـای خەیـری مـن بێبـەش نابـی و بـە لای دنیـاوە ئەڵێـم چ برایەکـی بـاش و بەنرخـی، بـەڵام ئەگـەر نەیبـەی، بـە ئەرواحـی ئـەو بـاوک و دایکـە هەژارەمانـە، هەتـا مـاوم ڕووت لـێ ناکـەم، لەگەڵـت قسـە ناکـەم و پێـت ناڵێـم برایەکـم هەیە و حاشـات لـێ دەکـەم، عەڵبـەت کوڕەکەشـم هـەر ئەنێـرم بـۆ شـار و ناهێڵـم بـە قسـەی تـۆ، ژیانـی لـێ تـاڵ بـێ.

خاڵـۆ: باشـە خوشـکە باشـە، ئێسـتا کـە تـۆ پێـت کردووەتـە کەوشـێکا و ئیلاوبیـلا ئەشـێ وا بـێ، باشـە سـەرچاو مـن ڕێـگای هاتنـی بـۆ سـاف ئەکـەم، بـەڵام بـە شـەرتێک!

دایک: چی شەرتێک؟

خاڵـۆ: بەیانـی بەرلـەوەی بـڕۆم پێـت ئەڵێـم، چـون خـۆت ئـاگاداری کـە دووسـێ ڕۆژ ئەبـێ بـڕۆم بـۆ (بزمارئـاوا) بـۆ مـاڵ خـەزوورم و بـە شـوێن مناڵەکانما.

دایـک: باشـە کاکـە گیـان، بەیانـی هـەر شـەرتێکت هەبـێ ئەینێمـە سـەر چاوم.

مەحیە زۆر خۆشحاڵ ئەبێ و لێفەکەی ئەپێچێ بە سەر و کاپۆڵییەوە.

## (بەیانی حەوشی ماڵ)

کچێکـی زۆر جـوان لـە سـەربانی ماڵـی هاوسـێ خەریکـی مەشـکە ژەندنـە و جاروبـار تماشـایەکی نـاو حەوشـی مـاڵ مەحیـە ئـەکا.

دایکـی مەحیـە خەریکـی کۆپانکردنـی کـەرە و مەحیـەش جلوبەرگـی

تـازەی لەبـەر کـردووە و بەدزیـی دایکییـەوە جاروبـار تماشـای کچەکـە ئەکا و چـاو و برۆیەکـی بـۆ هەڵئەتەکێنـێ و قنـج و قیـت جلوبەرگەکـەی ئەخاتـە بەرچـاو کچەکـە و کڵاشـە تازەکانـی پیشـان ئـەدا.

چـاوی دایکـی ئەخشـێ بـە مـل رەفتـاری کچـەکا و ناوچـاوی ئەنێتـە یـەک.

کچەکە ئەترسێ و چاوی لێ ئەشارێتەوە.

دایک: ئەوە بۆ نایەی یارمەتییەکی من بەی کورە!

مەحیـە بـە ئیشـارەی چـاو و بـرۆی، دایکی حاڵی ئەکا کـە جلوبەرگەکەی پیـس ئەبێ.

دایـک: ئـەوە ئەمـرۆ بـۆ ئـەو جلوبەرگـەت لەبـەر کـردووە کـورە؟ زەماوەنـدی دایکتـە یـان خەتەنەسـوورانی بابـت؟!

مەحیـە: بـۆ ئـەوەی خاڵـۆم بـۆی بـە سـوقات هێنـاوە و خـۆی لـە بەرمـدا نەیدیـوە! ئەبـێ تماشـایەکم بـکا و بزانـێ بـاوی شـار هـەم یـان نـا! (هێـواش) باکـو بزانـێ چ کوڕێکـم و چ خوشـکەزایەکی هەیـە!

دایـک: (بزەیـەک دەکا) وایـە! ئافەریـن! فکرێکـی چاکت لـێ کردووەتەوە! بـەڵام بـەم جلوبەرگـەوە خـۆت مەخـە بـەر چـاو و دەم رۆڵـە! باکـو چـاوت لـێ نـەدەن، زۆر پێـت ئەکـەوێ! بەپیـرۆزت بـێ!

مەحیـە نەختـێ بـۆی هەڵدەقنجـێ و کەیفـی بـە قسـەکەی دایکـی سـاز ئەبـێ، کچەکـە بـە زوبانـی ئیشـارە دایـم لێـی دەپرسـێ، ئـەم جلوبەرگـە تـازە بـۆ چییـە؟

مەحیـە چـاک حاڵـی نابـێ و هـەر بەبێدەنگـی دەم ئەکاتـەوە کـە پێـی حاڵـی کا، خاڵـۆی بـۆی کڕیـوە.

ئەو لێی حاڵی نابێ!

مەحیە: (بێدەنگ، بە دەم) خاڵم بۆمی کڕیوە!

کچ: چی؟

مەحیە تا دێ دیسانەوە دەم بکاتەوە، دایکی لا ئەکاتەوە. مەحیە ئەکەوێتە دیان ریچەکردن.

دایک: ئەوە بۆ وا لە دەمت ئەکەی کورە؟

مەحیە: هیچ دایە، شتێ کەوتووە بەین دیانم.

دایک: تا نەختێ تۆشەی رێگا بۆ خاڵت دێنم، هۆشی کەرەکەت بێ، نەچێتە دەرێ.

مەحیە: ناهێڵم بڕۆ.

دایک: (ئیشارە بۆ کچەکە) خۆشت ئەوەندە مەخە بەر چاوورچڵەی ئەم و ئەو کورە!

دایک بە بۆڵەبۆڵ ئەچێتە ماڵەوە.

دایک: خۆ شەرم و حەیا نەماوە! ئاوا ئەکەن وا خوا غەزەب ئەگرێ! ئەرێ وەختە کوڕەکەم هەر بە چاو بتخوات دەی چۆن دنیا ئاخر نایێ! کاولم بوو کوڕ و کچی ئەم دەورە و زەمانە.

هەر دایکی ئەچێتە ماڵەوە، کچەکە نەختێ دەنگ بەر ئەدا.

کچ: بەپیرۆزت بێ مەحیە! ئەم جلوبەرگە تازەیە چییە ئەمڕۆ کردووتە بەرت؟! بۆ زەماوەند ئەچی؟

مەحیە: چی، ئەم جلوبەرگە؟

کچ: ئەرێ؟

مەحیە: (بە دەنگی نەوی) پێم ئەکەوێ؟

کچ: چی؟!

مەحیە: ئەڵێم، ئەمانە ئەڵێی؟

کچ: ئەرێ ئەرێ!

مەحیە: خاڵم بۆمی کڕیوە!

کچ: (بەسەرسوڕمانەوە) خاڵت تڕیوە؟

مەحیە: هاها! خاڵم بۆمی سەندووە!

کچ: تێ ناگەم، بێ بۆ سەر کانی، من ئەچم بۆ ئەوێ.

مەحیە: چی؟

کچ: کانی، کانی، کانی، ئاو، ئاو!

مەحیە: باش، باش!

خاڵۆ لە حاڵی سەروێن بەستندا دێتە ناو حەوش.

مەحیە: بەیانی باش خاڵە گیان!

خاڵۆ: با با با! جلوبەرگەکەت کردووەتە بەرت؟!

مەحیە: بەڵێ وەڵا، وتم خۆت بۆمت کڕیوە، وتم ئێستا کە تەشریف ئەبەیەوە، لەبەرمدا ببینی!

خاڵۆ: چاکت کرد، زۆر جوانە بە موبارەکت بێ!

هەر لە نووک پاوە تا تەوقی سەری تماشایەکی ئەکا.

هەم پانتۆڵ (شەلوار)ەکەی کوڵە، هەم قۆڵی کەواکەی.

خاڵۆ: جوانە، زۆر لەو جلوبەرگەی خۆت جوانترە، نەختێ قۆڵ کەواکەت و شواڵەکەت کۆتایە، ئەویچ هیچ نییە! سی چل ساڵ تر

کە پیر ئەبی و کۆتاوە ئەبی، ئەبێ بە قەد بەرت! دایکت لە کوێیە؟

دایک: (خەریکە لە ژوور دەرئەکەوێ) وام لێرە، کاکە گیان، نەختێ تۆشەی ڕێگام بۆت هێنا، نەوەک لە ڕێگا برسیت بێت.

خاڵۆ: دەستت خۆش بێ، چاوت لێیە مەحیە چ کوڕە باشێکی لێ دەرهاتووە؟!

دایک: بەڵێ وەڵا، دەستت خۆش بێ خاڵە گیان! کردوویە بەری تۆ تماشای بکەی بزانی چۆن کوڕێکە بۆ شار خاڵە گیان؟!

خاڵۆ: ها... چاک بوو ئەمەت وت و خستتەوە بیرم خوشکە گیان، جا وەرنە پێشەوە تاکو چاک پێتان حاڵی کەم.

مەحیە و دایکی دێنە بەرەوە.

خاڵۆ: من ئەڕۆم ئەم کەرە نابەم.

دایک: بۆ؟

خاڵۆ: گوێ ڕاگرە، من ئەمڕۆ ئەبێ بڕۆم بۆ بزمارئاوا بە شوێن خێزانما، بزمارئاوا نزیکە و پێویست بە کەر نییە و تۆشەی ڕێگاشم ناوێ، من ئێستا ئەکەومە ڕێ، ئەمشەو و بەیانی لە بزمارئاوا ئەبم و دوو بەیانی لەگەڵ خێزانم بە سواری چاروا ئەکەوینە ڕێ بۆ شار و هەتا ئێوارە لە ماڵ خۆماندا ئەبین، ڕۆڵە مەحیە چاک گوێ گرە.

یەک دانە سکە (پارەی ئاسن) لە گیرفانی خۆی دەردێنێ و نیشانی مەحیەی ئەدا.

خاڵۆ: ئەمە چەندە؟

مەحیە: ئەوە؟ ئەوە پێنج دینارییە.

خاڵۆ: مەرحەبا ئافەرین!

دایک: ئەموت کوڕە باشەیە و باوی شارە؟!

خاڵـۆ: باشـە کاکـە گیـان (دەسـت ئەنێتـە بـان پشـت کەرەکـە) ئەمـە چییـە؟

مەحیە: یانی چی ئەمە چییە؟

خاڵۆ: ئەمە چ حەیوانێکە رۆڵە؟

مەحیـە: مـن منداڵـی دێهاتـم خاڵـە گیـان، ئەگـەر هـەر هیـچ نەزانـم، ئەزانـم ئەمـە کـەرە!

خاڵۆ: ئەی رەحمەتی خوا لە باوک و دایکت!

دایـک: لـە بـاوک و دایـک خۆشـت! ناڵێـم، کاکـە گیـان ناڵێـم، ئـەو کـوڕەم بـاوی شـارە؟!

خاڵۆ: بەڵێ وایە، ئەمانەی بەرت چییە؟

مەحیە: چی؟ جلوبەرگەکەم؟!

خاڵۆ: بەڵێ.

مەحیە: جلوبەرگی تازەیە.

خاڵۆ: هەزار جار مەرحەبا.

دایکی لە خۆشیا سەری ئەلەقێنێ و هەناسەیەک هەڵدەکێشێ.

خاڵـۆ: ئـەم پەنـج دینـارەم هـەر دانابـوو بیـدەم بـە تـۆ، جەژنانەیـە، هـا وەری گـرە.

مەحیە: دەستت خۆش بێ.

دایـک: خـوا لێـت بەزیـا کا و هەمیـش و دایـم خـاوەن پـارە بـی خاڵـە گیـان.

خالۆ: جا بوو بە چی؟ ئەمە کەرە، ئەمە پەنج دینارە، ئەمەی بەرت جلوبەرگی تازەیە. تەواوە! جا کاکە گیان خۆ ماڵی خاڵت لە شارا ئەزانی و دوو جار هاتوویی؟

مەحیە: بەڵێ وەڵا، ئەزانم.

دایک: خوا جۆرە مەغزێکی پێ داوە کاکە گیان، کوڕی وا کەس نیەتی!

خالۆ: باشە خوشکە ئازیزەکەم ئەمشەو کە دێ هیچ، بەیانی و دوو بەیانی، هەر هیچ. ئێوارەی رۆژی سێیەم من لە ماڵی خۆما چاوەڕێ مەحیە ئەبم. مەحیە گیان! لەم کەرە و لەم پارە و لەم جلوبەرگە، تەنانەت یەکێکیان بە ساق بە من بگەیەنی لە دیوان خوا و پێغەمبەر شەهادەت ئەدەم کە تۆ پیاوی شاری و من لە شاردا هەموو خزمەتێ بە تۆ ئەکەم تا بگەیی بە هەموو ئاواتەکانت، باشە!

مەحیە: زۆر باشە، هەر زۆر زۆر باشە!

خالۆ: جا بەڵام ئەگەر وا نەبوو و تۆ نەتتوانی یەک شت لەم سێ شتە بە ساق و سەلامەت بە من بگەیەنی، ئیتر چاکە هەر نەیەی بەرەو ماڵی من و یەکراست بگەڕێرەوە بۆ ئاوایی، باشە کەکە گیان؟

دایک: یانی تۆ ئەتەوی بڵێی ئەم کوڕەی من ئەوەندە بێ قابلە کە ناتوانێ کەرێک و پێنج دینار و جلوبەرگەکەی بە ساقی بگەیەنێتە تۆ؟!

خالۆ: من قسەی وام نەکردووە خوشکم، شەرتی من ئەمەیە.

دایک: ئەگەر هەرسێکی ساق و سلامەت نایە بەردەستت چی؟

خالۆ: ئەوە ئیدی نووری عەلا نوورە! ئەوە ئیدی خۆم ئەیکەم بە

ساحیبی هەموو شتێ، قەوڵی پیاوانەت پێ دەدەم!

دایک: باشە خاڵە گیان شەرتێکی زۆر سادە و ساکارت ناوەتە رێی، ئینشەڵا سێ سۆ (سێ سبەی) ئێوارە بە هەموو شتێکەوە وا لە خزمەتی خاڵۆیدا.

خاڵۆ: ئینشەڵا! دەی خوشکە گیان، مەحیە گیان، ئەزیەت و زەحمەتی زۆرم دا پێتان، ئەبێ عەفووم بکەن!

دایک: بەین خوشک و برا ئەم قسانە نییە! سڵاوی کەیوانووت بکە و لەباتی من چاوی منداڵەکانت ماچ بکە.

خاڵۆ: خواحافیز.

دایک: خوات لەگەڵ، سەرچاو!

خاڵۆ لە ماڵ ئەچێتە دەرێ.

دایک یەک کاسە (جام)ی پڕ لە ئاو بە شوێنیدا دەڕژێنێ.

دایک: بان گیان، بان چاو.

خاڵۆ بەرەو چۆڵ و بیابان لە ئاوایی دوور ئەکەوێتەوە.

دایک: بۆ کوێ کورە؟

مەحیە: نەختێ ئەڕۆم بۆ ناو ئاوایی.

دایک: وەرە وەرە ئەو جلوبەرگە تازە دەربێنە، جا برۆ!

مەحیە: بەوەڵا ناهێڵم دەرکی لێ بچێ!

دایک: ئەوخەنە بەر چاوودەم، خوێڕی! وەرە ماڵەوە، بیکەنە جا بڕۆ.

مەحیە: جا ئەگەر بیانەوێ بێ جلوبەرگیش هەر چاوم لێ دەدەن،

دایە گیان!

دایک: کورە وەرە ماڵەوە خوێڕی، بۆچی نازانم تەماتە بچی بۆ کوێ؟! منت بە کەر زانیوە؟

بە کاسەکەی دەستی ئەنیشێتە ملی و بەزۆر ئەیخاتە ماڵەوە.

## (دوور لە ئاوایی، دەوروبەری کانی)

کچەکە گۆزە ئاوێکی ناوەتە بەردەمی و پاڵی بە دارێکەوە داوە و چاوەڕێ مەحیە ئەکا و جار بەجار بەردێ فڕێ ئەداتە ناو کانییەکەی بەردەمی، ئەوەندەی پێ ناچێ، مەحیە شڕەبار و ناشیرین دەرئەکەوێ و بەرەو کانی دێ.

کچە بە دیتنی مەحیە حەیرەت دەکا (سەر سوڕ دەمێنی) و هەڵدەستێتەوە.

مەحیە نزیکەو ئەبێ.

کچە تماشایەک دەوروبەری خۆی ئەکا روو ئەکا لە مەحیە.

کچ: ئەوە بۆ دیسان وات لێ هاتەوە؟!

مەحیە: چیم لێ هاتووەتەو؟

کچ: هن! وتم چاکە ئەمڕۆ نەختێ لە بنیام (بەنی ئادەم) ئەچی و وەکوو بنیام دێی بۆ لام! ئەمە چییە؟ بەم جلوبەرگەوە هاتوویتە دنیا؟!

مەحیە: چی بکەم دایکم لەبەرمی کەند! تۆ خوا زۆر پێم ئەکەوت سوەیبە!

سوەیبە: نەختێ شکڵ و شەمایلی بەشەرت لێ نیشتبوو، خراپ

مەحیە: کێ وتی؟

سوەیبە: لە قسەکان دایکت تێ گەیشتم، وایە؟

مەحیە: ئەرێ، بەڵام دێمەوە.

سوەیبە: کەی؟ کەی دێیتەوە؟

مەحیە: نازانم، بەڵام دایکم ئەڵێ هەر وەخت بوویتە پیاو!

سوەیبە: بۆ ئێستا پیاو نیت؟!

مەحیە: بەخوا نازانم سوەیبە، دایکم ئەڵێ خاڵم لە شارا بووەتە پیاو!

سوەیبە: یانی لە شارا ژنی هێناوە؟

مەحیە: کورە نا، ژنەکەی خەڵک بزمارئاوای ژوورە!

سوەیبە: ئەی چۆن؟

چووزانم تۆش، بە شوێن نیسک و نەخوشەرەکەیا ئەگەڕێ! من نازانم چەندم پێ ئەچێ و لە شاردا چۆن ئەبمە پیاو، بەڵام تا ئەبمە پیاو و دێمەوە، ئەبێ تۆ چاوەڕێم کەیت و دانیشی.

سوەیبە (دەستی ئەدا بە دەم خۆیا) من ناتوانم مەحیە، من ناتوانم.

مەحیە: بۆ ناتوانی؟

سوەیبە: بابم ئەڵێ، فەرمایشی خوایە کە کچ گەندەمووی سەرلچی دەرهات، ئەبێ بیدەیتە شوو، ئەگینا زۆر گوناحە و سوعال و جوابی رۆژی مەحشەری هەیە!

مەحیە: حای؟!

سوەیبە: بەخودا؟

مەحیە: (بەوردی تماشای دەکا) دەی کوا؟

سوەیبە: چی کوا؟

مەحیە: گەندەمووی سەر لچ؟

سوەیبە: جارێ دەرنەهاتووە.

مەحیە: دەی بەشکەم دەرنەیێ تا من دێمەوە.

سوەیبە: دەردێ مەحیە، بەخوا دەردێ! مەڕۆ مەحیە، مەڕۆ!

مەحیە: ئاخر نابێ سوەیبە، نابێ! دایکم قەبووڵ ناکا، بەلام تۆ ئەتوانی نەهێڵی دەربێ.

سوەیبە: چۆن؟

مەحیە: هەر سەری دەرهێنا، هەڵی کیشە با بابت نەزانێ.

سوەیبە: بەخوا بزانم چۆن ئەبێ، بەلام دێر بێیتەو بۆ من بەری ناگیرێ مەحیە!

مەحیە: نانا، من زوو دێمەوە.

دوو سێ ژن بە دیزە و گۆزەوە بەرەو کانییەکە دێن، گۆشەی چاوی سوەیبە ئەیانبینێ.

سوەیبە: ماڵ کاولم!

مەحیە: چی، دەرهات؟!

سوەیبە: چی دەرهات، ماڵ کاول، خۆت مەخە بەرچاو ئەو چەند کەسە، خۆت خە چەم تا نەتیاندیوە، ها دەی!

مەحیە خۆی ئەخا سەر عەرز و بە تل خواردن خۆی ئەخاتە چەم

و نایبینن.

سوەیبە گۆزەکەی دەنێتە سەر شان و ئەکەوێتە رێ و ئەدا بە لای دەسە ژنەکانا.

سوەیبە: ماندوو نەبن.

ژنەکان: خۆت ماندوو نەبی.

## (نێو چەم)

مەحیە لەناو چەمەکە لەسەر بەردێ دانیشتووە و پێی خستووەتە ناو ئاوکەوە و گۆرانی ئەڵێ.

مەحیە: کۆڵنجە ڕێ ڕێ، هەوری لار، دەسماڵ قاقانی. کاری ئەمن و تۆ، هەوری لار، پاک دنیا زانی... کۆڵنجە ڕێ ڕێ، باوانم، خۆت خە چۆڵێ چەم، ماچێکم پێ دە، سوەیبە گیان، با خەفەت نەخوەم، تۆ خوا با خەفەت نەخوەم...

## (شەو، ماڵ و دەر)

دایکی مەحیە لەناو ماڵدا خەریک تەشی ڕێسییە. مەحیە، سەوەتە وەدەست لە گەوڕ دێتە دەرێ و لەبەر نووری چرا مووشییەوە کا ئەکا ناو سەوەتەوە و دەست ئەکا بە گۆرانی وتن.

مەحیە: هەی داد هەی بێ داد، هەوری لار، کەس دیار نییە... کەس لە دەردی کەس، هەوری لار، ئاگادار نییە...

دایکی گوێی بۆ شل ئەکا، سوەیبە دێتە ناو تاریکیی دەرگای بانەکە و گوێ شل ئەکا.

مەحیـە: ماڵمـان مـاڵ هاوسـێ، هـەوری لار، چیخمـان جیایـی... کافـر نەخـەوێ، هـەوری لار، شـەو بەتەنیایـی...

دایکـی لـە کەلامـی ئاخـر زیـز (تـووڕە) ئەبـێ و لـە پەنجـەرە سـەر دەردێنـێ.

دایک: ئەهای هەوری لار؟

مەحیە: ها!

دایک: نـەڕە نـەڕ، خەڵـک نووسـتوون، نیوەشـەوە! ئاڵـف ئـەو دوو سـەر ئاژەڵـە بکـە و وەرە سـەر جێگەکـەت، بتۆپـە!

مەحیە بێدەنگ ئەبێ و سەوەتەکە هەڵدەگرێ بەرەو گەوڕ.

دایکی ئەچێتە سەر جێگەکەی و خەریک تەشییەکەی ئەبێ.

دوای ساتێ مەحیە دێتە ماڵەوە.

دایـک: کافـر نەخـەوێ شـەو بەتەنیایـی، ئـەرێ؟! تـۆ تەنیـای خوێـڕی؟ ئـەی مـن مەگـەر شـەو لەنـاو ئـەم ماڵـە نیـم؟ تـۆ تەنیـای خوێـڕی؟!

مەحیـە: ئـەوە گۆرانییـە دایـە! خـۆ بـۆ خۆمـم نـەوت! وتوویـان، منیـش فێـر بـووم دایـە گیـان!

دایک: کـورە خوێـڕی، بۆچـی مـن نازانـم چیـت لـە خەیاڵدایـە نەفـام، تۆ منـت بە کـەر زانیـوە؟!

مەحیە: هەی هەی باوا! جا ئیسە کێ بێ و تۆ حاڵی کا؟!

دایک: کـورە خوێـڕی! بەخـوا تـا نەچیتـە شـار و نەبـی بـە پیـاو، وەکـوو بەشـەر نەیەیتـەوە، چـاوت پـێ ناکـەوێ! ئـەوە بزانە!

مەحیە: بە چی؟ چاوم بە چی ناکەوێ؟

دایـک: (تەشـییەکەی ئەکوتـێ بەسـەریا) بـە کافـر نەخـەوێ، شـەو

بەتەنیایی، خوێڕیی لات! خاڵت ئەوەڵ چوو بۆ شار خۆی کردە پیاو، بە گیرفانی پڕ پووڵەوە هاتەو، جا کەوتە بزمارەو بزمارە وتن! ئەجا ئێمەش چووین بۆ بزمارئاوا و بزمارەمان هێنا. تۆش هەر کاتێ وا بووی، جا من ناهێڵم شەو بەتەنیایی بخەوی و ئەو بۆگەنکەتە بۆ دێنم! حاڵی بووی یان دیسان حاڵیت کەم!

مەحیە: حاڵی بووم دایە گیان، تێ گەیشتم! هەر کاتێ بوومە بزمارە بزمارە، جا تێمە هەوری لارا

دایک: ئافەرین، ئەوەیە ئەزانم بۆ شار چاکی! باش تێ ئەگەی چی بە چییە! وەرە بتۆپە!

مەحیە ئەچێتە ناو جێگاکەی و ئەخەوێ.

دایک: هن! کافر نەخەوێ شەو بەتەنیایی! خوێڕی!

مەحیە لە قینا سەر ئەکا بە ژێر لێفەکا.

## (ڕۆژی حەرەکەت)

مەحیە بە جلوبەرگی تازەوە لەناو حەوشەکە خەریک کۆپان کردنی کەرەکەیە.

سوەیبە لەسەر بانجێڵ خۆی بە جل هەڵخستنەوە سەرگەرم کردووە و بەدزییەکەوە لەگەڵ مەحیە خەریکی ئیما و ئیشارەیە.

مەحیە سەری داخستووە و کۆپانەکە توند دەکاتەوە.

سوەیبە: (هێواش) مەحیە؟

مەحیە تێ ناگا.

سوەیبە (نەختێ بەرزتر) مەحیە کەڕ؟

مەحیە: ها ها؟

سوەیبە: کەی تیتەو؟

مەحیە: نازانم (سەرقاڵی توندکردنی تەنگپێچەکە ئەبێ)

سوەیبە: مەحیە؟ مەحیە؟ مەحیە وڕ؟

مەحیە: ها ها چی ئەڵێی؟

سوەیبە: (دەست بەسەر لچیا تێرێ) لچ لچ!

مەحیە: تێ ناگەم.

سوەیبە: مووی، مووی، مووی مەحیە!

مەحیە: نازانم چی ئەڵێی؟

سوەیبە: موو کەڕەواڵە! باوکم! شوو شوو!

مەیە: خاس خاس.

سەر ئەباتەوە ژێر زگی کەرەکە.

سوەیبە تا دێ مەحیە بانگ کا، دایک مەحیە لە ماڵ دێتە دەرەو.

بانگکردنەکەی سوەیبە ناتەواو ئەبێ.

سوەیبە: مەحی...

دایک ئەبینێ ئەیا ئاوێتەی قۆزە و کۆکە، ئحم ئحم ئحم.

دایک مۆڕێ لە سوەیبە ئەباتەو دەسماڵ پڕ لە تۆشە دێنێ بەرەو مەحیە.

دایک: بازیکی حەیای قووت داوە و ڕوویەک فرەی خواردەسە ملیا! ئحم ئحم!

سوەیبە سەر خوەی لە پشت جلەکانەو ئەشارێتەوە.

دایـک: قـول بـەر ئـەدا و سـەر ئەشـارێتەوە! کیسـەڵە. هـا بیگـرە، ئەمـەش تۆشـەی رێـگا! نەنیشـیتە ملـی تـا نیـوەڕۆ هەمـووی بخـۆی، وەختـێ کـە برسـییەتی زۆری بـۆت هـاورد، بـە سـێ ژەم بیخـۆ، بـا بـەر لـە گەیشـتن لـە پـا نەکـەوی، شـار دوورە.

مەحیە: ئەزانم دایە، دەستت خۆش بێ! وەختی خۆی ئەیخۆم.

دایک: هیچ جێ نەهێڵی!

مەحیە: نا هیچ جێ ناهێڵم.

دایک: پێنج دینارەکەت پێیە؟

مەحیە: بەڵێ وەڵا، (لە گیفانی دەری دێنێ) ئەوەتە!

دایـک: باشـە رۆڵـە ئامـان سـەد ئامـان، هۆشـی کەرەکـە و پـارە و لیباسـەکانت بـێ! هەموویـان سـاق و سـڵامەت بگەیێنیتـە دەسـت خاڵـت! مـن ریشـم بـۆت ناوەتـە گـرەو!

مەحیە: چی؟!

دایک: ئاوڕوومم ناوەتە گرەو خاڵت، ئاوڕووم نەوەی!

مەحیە: باشە باشە، دڵنیا بە!

دایـک: (هێـواش) تـا مـن ئـەڕۆم نەختـێ ئـاو دێنـم، تـۆ لـەو کیسـەڵە خواحافیـزی بکـە، زایفـەس خـوا هەڵناگـرێ.

مەحیە: (دەوروبەری خۆی تماشا ئەکا) کام کیسەڵ؟

دایک: (هێواش) کورە مەبەستم سوەیبەیە، خوێڕی!

مەحیە: (هێواش) سوەیبە؟ دەی دەی چی بکەم؟

دایک: خواحافیزی ئەزانی چییە؟

مەحیە: ئەرێ!

دایک: خوا شوکرا خواحافیزیی لێ بکە زەعیفەیە، خوا هەڵناگرێ!

مەحیە: (بەسەرسوڕمانەوە) لە سوەیبە؟!

دایک: نە لە قاچوقولی! ئەرێ ئێترا!

مەحیە: تۆ خوا بەڕاستتە دایە؟!

دایک: ئەم جارە ئەرێ! با من بچمەماڵەو جا!

مەحیە: کورە کێ ئەڵی تۆ دایکی؟ کێ ئەڵێ عیسا نی؟! کێ ئەڵێ تۆ بەشەری؟! تۆ فریشتەی دایە، بەخوا فریشتەی!

دایک بەخۆشحاڵییەوە ئەچێتە ماڵەو.

مەحیە ملقێ بە خویەو ئەنێ و چەند هەنگاو بەرەو سوەیبە ئەچێت و بێ ترس و خۆف، بە دەنگ بەرز بانگی ئەکا.

مەحیە: سوەیبە، سوەیبە!

سوەیبە بەسەرسوڕمانەو دەست ئەنێتە سەر جلەکان و لە بان تەنافەکەو تماشای مەحیە ئەکا.

سوەیبە: منت بانگ کرد؟!

مەحیە: ئەرێ وەرە!

سوەیبە: بۆ کوێ؟

مەحیە: وەرە بەرترەو!

سوەیبە بێ ترس لەپشت جلەکانەو دێتە دەرێ و تماشای ناو حەوش ئەکا.

سوەیبە: کوا دایکت؟!

مەحیە: کارت نەبێ!

سوەیبە: ها، چی ئەڵێی؟

مەحیە: سوەیبە خۆشتم ئەوێ!

سوەیبە دیان ئەنێ بەسەر لچیا.

مەحیە: سوەیبە!

سوەیبە: بەڵێ؟

مەحیە: هۆشی موویت بێ! سوەیبە؟ خواحافیز.

سوەیبە: ئەوە چۆن زات ئەکەی؟!

مەحیە: عاشق لە کەس باکی نییە!

سوەیبە: وایە! سەرچاو هاتی، بە سلامەت، هۆشی خۆتت بێ!

مەحیە: تۆش هۆشی خۆتت بێ!

دایک بە کاسەیەک ئاوەوە لە ماڵ دێتە دەر.

سوەیبە دەردەچێ.

## (بەردەرگا)

مەحیە بە دوای کەرەکەدا لە ماڵ دێتە دەرێ، دایکی بە شوێنیا دێت.

دایک: خۆش هاتی سەرچاو، هۆشی خۆت بێ! جگە لە خاڵۆکەی خۆت متمانە وەکەس نەکەی رۆڵە! رەفاقەت کەس نەکەی، هەرچی خاڵۆکەت ئەڵێ، بڵێ سەرچاوا

مەحیە: سەرچاو، تۆش هۆشی خۆت و ماڵەکەو بازێهاوسێ و

بەرهاوسـێت بـێ، خواحافیـز!

مەحیە بە کەرەکەیەوە دوور ئەکەوێتەو.

سوەیبە لەپشت جلەکانەوە تماشای ئەکا.

دایک دێ ئاوەکە بکا بە شوێنیا، پەشیمان ئەبێتەو.

دایک: (لەبەرخۆیەوە) بۆ تۆ ئاو پێویست ناک، نامەوێ زوو بێیتەو.

دایک ئەچێتە ماڵەو.

سوەیبە تەشتێ پڕ چڵکاو لە کۆڵانەکە، ئەکا بە شوێن مەحیەدا.

## (ڕێگای دەشت و کێو)

مەحیـە جارجـار بـە سـواری کـەر و جارجـار بـە شـوێن کـەرەوە بەڕێوەیە و بـە گۆرانـی گوتـن، پـلان (قۆنـاخ) ئەبـڕێ و گۆڕانـی پلانـەکان (ریزاڵـف) ئەکرێ.

گەرمای نیوەڕۆ... مەحیە لەسەر پشتی کەر خەریکی نانخواردنە.

خـۆر ئەنیشـێ و مەحیـە دەگاتـە دووڕێیانێـک و تووشـی ڕێبوارێکـی پیـر دەبێ.

ڕێبوار: ماندوو نەبی کوڕم! ئۆغر؟

مەحیە: خۆت ماندوو نەبی بابە گیان! خۆت ئۆغر؟

ڕێبوار: وەڵا باوکم بۆ شار ئەچم.

مەحیە: دەی منیش بۆ شار ئەچم!

ڕێبـوار: ئۆغـرت بەخێـر بـێ، کـوڕم! بـەم حەسـابە ئەمشـەو بەیانـی تاکـو دەمـەو نیـوەڕۆ، پێکـەوە رەفیقین.

مەحیە: زۆر باشە.

نەختێ رێ ئەکەن و مەحیە تەماشای کۆڵەکەی کابرا ئەکا و ئەبینێ بۆی قورسە.

مەحیە: ببوورە بابە گیان ئەگەر کۆڵەکەت قورسە باری کەرەکەی منی بکە.

رێبوار: بەخوا زۆر مەمنوونی پیاوەتیت ئەبم!

مەحیە: دە باشە بیخە سەر کەرەکە.

رێبوار بەدەم ڕێوە، جواڵەکەی لە کەرەکە بار ئەکا.

رێبوار: ئای پشتم خەریک بوو بتەقێ، خوا تۆی بۆم نارد، رۆڵە! زۆر سپاست ئەکەم، نەختێ کولێرە و ماست و کەرە و سەروسەوقاتە ئەیبەم بۆ ماڵ کوڕەکەم.

مەحیە: کوڕەکەت لە شار ئەژی؟

رێبوار: بەڵێ وەڵا دە ساڵێکە لەگەڵ ژن و مناڵەکەی لە شار ئەژین.

مەحیە: ژنی لە شار هێناوە یا لە دێ؟

رێبوار: ژنەکەی هەر خەڵکی ئاوایی خۆمانە.

مەحیە: زۆر باشە.

بەدەم ڕێوە وتووێژ ئەکەن.

دنیا بەرەو تاریکی ئەڕوا.

رێبوار: ئاوەتە لە بەرانبەرمانەوە کەپرێکی چاکیان کردووە! لە هەر کوێ کەپری لێ بێ، ئاویش هەیە، وا چاکە ئەمشەو لەو کەپرە ماندوویی دەرکەین و بە ئۆمێدی خوا بەیانی بکەوینە ڕێ.

مەحیە: وای لێ کەین.

## (شەو نیو کەپرەکە)

مەحیە و پیرەپیاوی ڕێبوار لە دەور ئاگرێک دانیشتوون و کابرا لەناو کترییە ڕەشەیەکدا، خەریک دەمکردنی چایە.

ڕێبوار: ببوورە ڕۆڵە، لێتم نەپرسی ناوت چییە؟

مەحیە: وەڵا ناوم مەحیەیە، بەڵام دایکم ئەوەندە بانگی کردووم مەحیە خوێری، خەڵکەکەش هەر ئەوەم پێ ئەڵێن!

ڕێبوار: مەحیە خوێری؟

مەحیە: بەڵێ وەڵا.

ڕێبوار: (بەپێکەنینەوە) کاکی خۆم ئەم وڵاتی ئێمە هەر لە مێژەوە وا بووە و وایە! کەس عەیبی خۆی نابینێ، بەڵام هەر چاوێکیان ئەکەنە چوار چاو، بۆ بینینی عەیب و نوقسانیی خەڵک! جا ئەوەی بە فتوای ئەوان عەیب و نەقس بێ، ئەیکەنە لەقەب و نازناو بۆ کابرا. لە ئاواییی ئێمە حەمە ناوێ نەختێ لووتی درێژە، پێ ئەڵێن، حەمە دەنووک! کابرایەک تریش کۆمە و ملی کۆتایە، پێ ئەڵێن ئەحە کیسەڵ! یەکێ تر هەژار و داماوە، پێی ئەڵێن ڕەحیمە گاڕووت، وایە ئیدی!

مەحیە: خۆت ناوت چییە؟

ڕێبوار: من، ناوم نەسروڵایە، بەڵام چونکە ئیشی چارواداریی ماڵ خانم هەیە و لە دەورانی لاویدا چەند جار چاویان پێمەوە بووە، سەخوڕ لە تەویلەی چارواکان دەرداوە و جاروبار بووەتە جلوبەرگەکەمەوە، ئیسە ناویانگم بە نەسێ سەخوڕ دەرکردووە! چوومە حەج بەڵکوو پێم بڵێن حاجی نەسروڵا، بەڵام هەر سەخوڕەکەم پێوە ما و بووم بە حاجی نەسێ سەخوڕ! وایە ئیدی چی لێ ئەکەی!

مەحیـە: ببـوورە حاجـی تـۆ کـە ئەڵێـی چـارواداری، بـۆ بـە چـاروا سـەفەر ناکـەی؟

رێبـوار: وەڵا رۆڵـە، قەدیـم هـەر بـە چـاروا هاتوچـووم ئەکـرد، بـەڵام پێـرار بـە سـواری چاروایەکـی بـاش چـووم بـۆ شـار، هـەر گەیشـتمە نـاو شـار، چاروا‌کەیـان لـێ دزیـم و تووشـی زیانێکـی زۆر بـووم، چونکـە چاروای خـۆم نەبـوو! ئیـدی تۆبـەم کـرد بـە چـاروا هاتوچـووی شـار نەکـەم. بەڵـێ وەڵا ئەگـەر چـاروام بایـێ، بەیانـی بکەوتمایـێ رێ، ئێـوارە لـە شـارا بـووم، پێویسـت نەبـوو شـەو لـە دەرەوەی شـار بمێنمـەوە.

مەحیە: دەی بۆ هێشتت لێت بدزن، ماڵت ئاوا؟! بۆ هۆشیت نەبوو؟

رێبـوار: هـەی هـەی! هۆشـی چـی کاکـە، بـەوەڵا هـەر نەمزانـی چۆنیـان لەژێـرم کێشـا و بـەرەو کام لا بردیـان، هۆشـی چـی؟! بـۆ هیشـتیان بیـر و هـۆش بـەکار بێنـم؟

ئەکەوێتە سەرلەقانن و دوو چایی دائەکا.

مەحیە ئەچێتە ناو فکرەوە.

## (رۆژی دوایی)

رێبـوار و مەحیـە هـان بەرێـوە. دوای چەنـد پـلان، شـار لـە دوورەوە دیـاری ئـەدا، چەنـد جەوانـێ هـەرزەکار لەنـاو چاڵـێ خەریـک قومارکردنـن.

تەقـەی سـمی کەرەکـە دێتـە گوێیـان، یەکێـک لـە قوماربـازەکان بـە نیشـانەی بێدەنـگ کـردن، دەسـت بـەرز ئەکاتـەو.

هەموو بێدەنگ ئەبن.

کابرا گوێ بە عەرزەوە دەنێ.

دوای ساتێ سەربەرز ئەکاتەو.

کابرا: یەک ولاخە!

کابرای دووەم: بزان کێیە، چییە؟

کابـرا، بەوریایـی لـە چاڵـە دێتـە دەرێ و چـاوی بـە مەحیـە و حاجـی ئەکـەوێ کـە خەریکـن دوورەو ئەکـەون.

کابرا: کوڕێکی جەوانە و پیرەپیاوێ.

کابرای دووەم: شتێکیان پێیە؟

کابرای: پێم وایە ئەرێ.

کابرای دووەم: بانگیان کە.

کابرا: (بە دەنگی بەرز) ئاهای کاکە، ئەهای کاکە!

هەردووکیان لا ئەکەنەو.

مەحیە: لە ئێمە بانگ ئەکا؟

حاجی: ئەرێ، وابزانم!

مەحیە: ها، بەڵێ؟

کابرا: وەرە وەرە ئێرە!

حاجی ورد ئەبێتەوە.

مەحیە: بان چاو، گەرەکی ئەبێ کەرەکە راگرێ.

حاجـی: (پەشـۆکاو) چـی، بـان چـاو، کـورە! ئـەوە دزە! لێخـوڕە لێخوڕە هـا دەی!

حاجـی بـە چەپـۆک ئەنیشـێ بـە کەرەکـەوە و بەتونـدی کەرەکـە لـێ ئەخـوڕن و خۆیـان بـە شـوێنیا دەچـن.

مەحیە: (بەدەم دەرچوونەوە) کورە گاهەس وا نەبێ حاجی!

حاجی: لا کەرەوە بزانە وایە یا وا نییە!

مەحیە بەدەم ڕاکردنەو لا ئەکاتەو، چوار کەس بە تێڵاوە، کەوتوونەتە شوێنیان!

مەحیە: حەک ماڵ کاولم!

هەردووکیان ئەوەندە توند هەڵدێن ئەکەونە بەر کەرەکە.

دوای چەند پلان ڕاکردن و ڕاونانیان، لە دەروازەی شار تێئەپەڕن.

دزەکان ڕائەوەستن.

هەردوو هەسکە هەسک ئەچنە شارەوە و لە گۆشەیەکەوە بەر کەرەکە ئەگرن.

حاجی: هۆوەش هۆوەش.

مەحیە: خوا رەحمی لێمان کرد، ئەزانی؟

حاجی: بەڵێ وەڵا!

کابرایەک بێکارە لەسەر سەکۆیەک دانیشتووە و تماشایان ئەکا و ورد ئەڕوانێ بە حاجیا.

حاجی: رۆڵە زەحمەتی زۆرم پێ دای، لێرەدا ئەبێ ئیدی لە یەک جیا بینەوە، بارەکەی لە کەرەکە دائەگرێ.

مەحیە: منیش زەحمەتی زۆرم بە تۆ دا حاجی گیان، زۆر مەمنوون، ئەگەر تۆ نەبوایێ، خوای ئەیزانی چیم بەسەر بهاتایێ!

حاجی: هۆشی خۆتت بێ، رۆڵە! شار کافرستانە و رەحم بە کەس ناکەن... خواحافیز!

مەحیە: خوات لەگەڵ حاجی گیان، خوات لەگەڵ!

حاجی ئەکەوێتە رێگا و جواڵەکەی ئەدا بە کۆڵیا.

کابرای دانیشتوو هەڵدەستێ و سەرەڕێگە بە حاجی ئەگرێ.

کابرا: رۆژباش مامە گیان!

حاجی: رۆژباش باوکم.

کابرا: ببوورە تۆ مامەحەمە نیت؟

حاجی: مامەحەمە کێیە؟

کابرا: مامەحەمە دارتاشی؟

حاجی: نە باوکەکەم من مامەحەمە دارتاش نیم.

کابرا: کورە وەڵا خۆتی مامە گیان، ئەوە بۆ خۆتم لێ ئەشاریتەوە؟

ئەنیشێتە سەروبەچک حاجییەوە و تێر ماچی ئەکات.

مەحیە کە ئەمە ئەبینێ، زۆر خۆشحاڵ دەبێ.

مەحیە: ئەوە حاجی خزم و کەسوکاری خۆی پەیدا کرد!

لا ئەکاتەو دوای چەند قەدەم چاوی بە لاتاری ئەکەوێ کە چەن کەس خەریکی کایە و پارە بردنەوەن.

لاتاریدار: وەرن وەرن خەڵکینە، گەنجی بادئاوەردە ئەمەتە لێرە! یەک دینار بە پێنج دینار! وەرن بەخت و ئیقباڵی خۆتان تاقی بکەنەوە.. ها دەی!

مەحیە باوەش بە مل کەرەکەیا ئەکا و غەرقی تماشای ئەبێ.

کابرایەک دێتە بەرەوە و ئەپرسێ!

کابرا: ئەمە چییە و چۆن ئەکرێ؟

لاتاریـدار: لەنـاو ئـەم قەڕابـە پـڕ لـە ئـاوە یـەک دانـە ئیسـتیکانمان داناوە، ئەگـەر تـۆ یـەک سـکە (پـارەی ئاسـن) بخەیتـە نـاو ئیسـتیکانەکە و بـە لایـا دەرنەچـێ، پەنـج بەرابـەری جایـزەت پـێ ئـەدرێ، یانـی یـەک دینـار بـۆت ئەبـێ بـە پەنـج دینـار.

کابـرا لـە بەرچـاو مەحیـەوە یـەک سـکە ئەنێتە لـچ قەڕابەکە و بـەری ئەدا بـۆ نـاو ئاوەکە، سـکەکە ئەچێتـە خوارەوە و دەکەوێتە ناو ئیسـتیکانەکە.

لاتاریـدار: دەسـتت خـۆش، هـا کاکـە گیـان، ئەمـەش پەنـج سـکەی تـەواو.

وەرن وەرن خەڵکینە، گەنجی بێ رەنج ئەمەتە لێرە.

کابـرا: حەیـف ئیشـم هەیـە و ئەبـێ بـڕۆم، بـەڵام دوای نیـوڕۆ دێمـەوە و دیسـان کایـە دەکـەم.

لاتاریدار: من وام لە خزمەتتدا.

وردە وردە تەماع چاوی مەحیە ئەگرێ.

حاجـی: وەڵا بیـلا تـەڵا مـن مامەحەمـە دارتـاش نیـم، کاکـە گیـان بـۆ حاڵـی نابـی؟

کابـرا: مـن هاتمـە ماڵەکـەی تـۆ، تـۆ بەرخێکـت بـۆ مـن سـەربڕی و کـردت بـە کەبـاب! بـۆ لەبیـرم دەچـێ؟! سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ خێزانەکـەت بەوپـەڕی مەحەبەتـەوە خزمەتـی منیـان کـرد. بـۆ لەبیـرم ئەچێتـەو مامەحەمـە گیـان؟! هـەر بەخـوا هەتـا ئـەوەی بـۆ منـت کـردووە بۆتـی نەکـەم، دەسـتهەڵگر نابـم! تـۆش ئەبـێ سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ بێیتـە ماڵـی مـن، خـۆم و ژن و منداڵـم خزمەتـی تـۆ بکەیـن!

حاجی: دەی ئاخر من مامەحەمە نیم کاکە بۆ حاڵی نابی؟ من کارم هەیە، ئیشم هەیە،ماڵی کورِم لێرەیە، ئەبێ برِۆم، چۆن ئەتوانم سێ شەو و سێ رۆژ بم بە میوانی تۆ؟!

کابرا: ئەزانم لە چی ئەترسی! لەوە ئەترسی من جارێکی دیکە روو لە ماڵی تۆ بکەم، بەڵام خۆفت نەبێ مامە گیان، بەوەڵا وەک ئاواتێ لەسەر دڵم ماوە کە بۆ یەک جاریش بووە، قەرەویی ئەو مەحەبەتەت بکەم، تەواو.

حاجی: لائیلاهە ئیڵەڵا!

یەکێ تریش دێتەو دوو سکە لە کیس ئەدا، بەڵام سکەی سێیەم ئەخاتە ناو ئیستیکانەکەوە و پێنج سکە ئەباتەوە.

مەحیە: (لەبەرخۆیەوە) ئەم کارە کارێکی زۆر ئاسانە بە منیش ئەکرێ، زۆر زانستی ناوێ! سا ئەمەیە هەر کەس دێ بۆ شار دەوڵەمەند ئەبێتەوە!

حاجی: خوامەرگ خوا! باوکم، برام، ئازیزم، ئەڵێم بە پیر، بە پێغەمبەر من مامەحەمە دارتاش نیم، ئەوە بۆ باوەرِ ناکەی؟!

کابرا: جا ئەگەر تۆ مامەحەمە دارتاش نەبی، منیش میرزا حەسەن خان تاجر ئەڵوار نیم. کاکە گیان بۆ ئەوەندە تووڕەی، برای باوکم؟! باشە سێ شەو و سێ رۆژ تەشریف ناهێنی قەدەم بنێیتە سەر چاوی من و خێڵ و خێزانم، قەیدی نییە، ئەوا ئێستە نیوەرِۆیە کاتی نانخواردنە، نیو سەعات پێکەوە ئەچینە ئەو کەبابخانە، لەوبەرەوە

یـەک نیـوەڕۆ ئەبـی بەمیوانـی مـن و ئـەم دەینـە لەسـەر سـنگم پـاک ئەکەیتـەو و دوایـی مـن بـە خێـر و تـۆ بـە سـلامەت.

حاجـی: (لەبەرخۆیـەوە) ئـەرێ ئـەوە مـن لـە چـی ئەترسـم؟ دوای ئەمـە خـوا کـەری کـردووە و پێـی خۆشـە کەبابـی بـەزۆر باتـە دەرخـواردی مـن، بـۆ نەیخـۆم؟ ئەویـش ئـا لـەم کاتـا کـە زکـم لەبرسـا قـۆڕەی دێ!

کابرا: دەی بوو بە چی مامەگیان؟

حاجـی: باشـە کاکـە باشـە، بـەلام دیسـانەوە وتبێتـم، مـن مامەحەمـە دارتـاش نیـم!

کابرا: دەی فەرموون، دەی فەرموون!

کابرا ئەکەوێتە بەر و حاجیش بە شوێنیا، ئەڕۆن بەرەو کەبابی.

مەحیـە دڵـێ رازی، دڵـێ نـاڕازی، سـکەکەی دەردێنـێ و ئەچێتـە بـەرەو کایەکردن.

مەحیە: ئەبێ ئەم سکەمە بۆ بکەی بە پێنج سکەی یەک دیناری؟

لاتار: بەڵێ وەلا بۆ نابێ؟ بیدە بە من!

سکەیکەی لێ ئەسێنێ و بۆی ورد ئەکاتەو.

مەحیـە یـەک دانـە لە سـکەکان، زۆر رازی و نـاڕازی، میزانی بان قەڕابەکە ئـەکا و بـەری ئـەدات، سـکەکە تـل ئەخـوا و بـە شـان ئیسـتیکانەکەدا ئەکەوێتـە نـاو قەڕابەکـە، مەحیـە زۆر نیگـەران ئەبـێ.

لاتار: ئەبێ زۆر دیقەت کەی کاکە گیان!

## (ناو کەبابخانەکە)

حاجـی و کابـرا لەسـەر سـەکۆ دانیشـتوون، شـاگرد کەبابیەکـە دێـت

بەرەو.

شاگرد: چی مەیل ئەکەن؟ (چی ئەخۆن؟)

کابرا: من نازانم، هەرچی مامەحەمە مەیلی بخوازێ.

حاجی: هەرچی تۆ بفەرمووی، منیش هەر ئەوە ئەخۆم، بەڵام من مامەحەمە نیم!

کابرا: چیتان هەیە؟

شاگرد: کەبابی بەرخ، کەبابی گوێرەکە، کەبابی مریشک، کەبابی کەو و کەبابی قیمە.

کابرا: لە هەر کامیان دوو سیخ (شیش)مان بۆ بێنە، بە نانی تازە و ڕێحان و کاسەیەک دۆوە.

حاجی: ئەم هەموو کەبابە کێ بیخوا؟

کابرا: جا ئەوە چییە، هەمووی بنێنە بان یەک نابێ بەو بەرخە پەروارەیەی وا تۆ بۆ یەک ژەم بۆ منت ساز کرد!

حاجی: باشە برا، باشە، بەڵام من مامەحەمە نیم.

شاگرد: تەواو؟

کابرا: تەواو.

## (دەرەوە)

مەحیە سکەی دووەمیش بە لای ئیستیکانا بەرئەداتەوە ناو قەڕابەکە.

مەحیە: ئەی! ئەمە بۆ وایە؟

لاتار: دیقەت ناکەی کاکە، دیقەت ناکەی! دەستت وەکوو ئەوانی

تر فێر نەبووە!

یەکێ لەوانەی چەند جارێ بردوویەتییەو، چاوێ لە کابرای لاتار ئەقرتێنێ.

مەحیە: ئەی دادوبێداد!

کابرای دووەم: ئەم جار بیدە بە من بۆتی بەردەم.

لاتار: نە کاکە گیان، ئەبێ هەر کەس خۆی کاری خۆی بکا، ببوورە!

مەحیە سکەیەکی دیکە بە دیقەت میزان ئەکا و بەری ئەداتە ناو قەڕابەکە.

سکە تل ئەخوا و بە شان ئیستیکانەکا ئەکەوێتە ناو قەڕابەکە.

مەحیە: ئەی ماڵ کاولم!

کەرەکە لایەک لە مەحیە ئەکاتەو.

مەحیە عارەق دەردەدا.

مەحیە: من تەنیا دوو سکەم بۆ ماوە!

کابرای دووەم: (قەیدی نییە کاکە) دوو سێ جار چاوت لێ بوو، من سێیەم جار و چوارەم جار سەرکەوتم، یەکێ تریش بخە، لەسەر خوا، بەڵکوو ئەم جارە سەرکەوی!

مەحیە عارەقرێژان سکەیەک تریش ئەنێ بە لچ قەڕابەکەوە و بەری ئەدا، ئەویش هەر بە لای شان ئیستیکانەکەدا خەسار ئەبێ.

مەحیە: ئەی ئەوە چییە؟!

لاتار: بەداخەوە!

کابرای دووەم: لێ نازانی مەیکە کاکە گیان.

حاجی و کابرا دانیشتوونەتە پای کەباب خواردن.

حاجی تیکەی چکۆلە چکۆلە ئەگرێ و ئەیخوا، بەڵام کابرا تیکە ئەنێ هاکا چاوی دەربێ!

کابرا: حەزی لێ ئەکەی؟

حاجی: بەڵێ وەڵا، خوا لێت بەزیاد کا، بەڵام من مامەحەمە نیم.

کابرا: نۆشی گیانت!

کابرا کاشی (جام)ی پڕ لە دۆ ئەنێتە سەرەو.

حاجی تماشای ئەکا.

کابرا: خوایە هەزار جار شوکر نیعمەتت! زۆر بەمەزە بوو!

حاجی: نۆشی گیانت، بەڵام کەبابی زۆر ئەخۆی، زۆر خواردنی باش نییە !

کابرا: (سەر دێنێتە بەرەو) تا ماوی ماڵی خۆت، خۆت بیخۆ، ئەی؟ بۆتی ئەخۆن!

حاجی: بەڵێ وایە! (پێکەنین)

کابرا: ئیستا کاتی نوێژ و عیبادەتی خوایە، تا من ئەچمە حەوش و لەسەر حەوزەکەوە دەسنوێژ ئەگرم، تۆ لەسەر خۆ نانەکەت بخۆ!

هەڵئەسێ و لە دەرگای پشتەوەی کەبابییەکەوە ئەچێتە دەر.

مەحیە وا سوورەوە بووە و عارەق لە سەروچاوی ئەتکێ کە وەختە

سەكتە بكا!

كابراى دووەم: حاڵت زۆر خراپە كاە، ئيدى كايە مەكە!

مەحيە: چۆن كايە نەكەم، ئەو پارە پارەى خۆم نييە، ئەمانەتە!

لاتر: دەى باشە كاكە گيان ئەو دوايين سكەيشە بخە گاهەس شانس بێنى و پێنج دينارەكەت ساقەوە بكەى!

مەحيە بە دەستى لەرزۆكەوە ئەو سكەيشە ئەنێتە لچ قەرابەكەوە، ئەويش بە لاى ئيستيكانەكەدا دەرئەچێ.

كەرەكە لايەک لە مەحيە ئەكاتەوە و دەست ئەكا بە سەڕين.

مەحيە چاوى سوور ئەبێ و ئەكەوێتە لەرزە.

لاتار چاوێ لە رەفيقەكانى ئەقرتێنێ.

يەكێ لە رەفيقەكانى ئەيكا بە قاڵ.

رەفيق: لايبە لايبە، گەزمەكان هاتن، گەزمەكان هاتن.

كابراى لاتار باوەش ئەكا بە قەرابەكا و ئەوانى تر هەر كام شتێ هەڵدەگرن و بە شوێنيا دەردەچن.

مەحيە: راوەستە كاكە بۆ كوێ دەردەچێ؟!

ئەيەوێ بە شوێنيانا بڕوا، بە بۆن كەرەكەو پەشيمانەوە ئەبێ.

هەرسێ نەفەرەكەيان دەردەچن.

## (ناو كەبخانە)

حاجى هەر چاوێكى لە دەرگاى پشتەوەيە.

شاگرد: (دێ بۆ لاى حاجى) ئەرێ تۆ ماتڵى چيت مامە گيان؟

حاجی: ماتڵی میرزا حەسەن خانم.

شاگرد: میرزا حەسەن خان کێیە؟

حاجی: میرزا حەسەن خانی تاجری ئەڵوار.

کابرای شاگرد تێکئەچێ و بەحەیرەتەوە ئەچێ بۆ لای ساحیب کەبابخانەکە.

ساحیبەکە قسەکانی شاگردەکە ئەبیسێ و دێ بۆ لای حاجی.

ساحیب: ببوورە مامە گیان، تۆ بۆ هەڵناستی بڕۆیت؟

حاجی: وەڵا من رەفیقێکم هەیە، ماتڵی ئەوم چون میوانی ئەوم.

ساحیب: رەفیقت کێیە؟ لە کوێیە؟

حاجی: ناوی میرزا حەسەن خانە، میرزا حەسەن خانی تاجری ئەڵوار، چووەتە حەوش، سەر حەوز، دەسنوێژ بگرێ!

ساحیب: کام حەوش؟ کام حەوز؟

حاجی: (قامک بەرەو دەرگای پشت درێژ ئەکاتەو) حەوش و حەوزی خۆتان بەقوربان، ئەوێ!

ساحیب: ئەوێ حەوش و حەوز نییە کاکی خۆم، ئەوە دەرگایەکی دیکەی ئەم دوکانەیە، لەسەر شەقامێکی دیکەوەیە!

میرزا حەسەن خانی تاجری ئەڵواریش ئەوەتە دووکانەکەی لە پێرارەوە کە خۆی فەوتی کردووە، داخراوە، چون کەسی نەبووە، دەی دە دینار دانێ و هەستە بڕۆ دەرەوە مامە گیان.

رەنگ لە رووی حاجی ئەپەڕێ.

حاجی: دە دینار؟!

ساحیب: بەڵێ، ئەو کەبابە کە تۆ خواردت سیخێ بە یەک دینارە! ئەی چی، وەتزانی موفتە؟!

حاجی: کورە وەڵا من دوو سیخم نەخوارد، هەمووی میرزا حەسەن خان خواردی خوا خراوشەڕی بۆ بکا! جا ئێستە من دە دینار لە کوێ بێنم؟

ساحیب: یانی ئێستا تۆ پارەت نییە؟

حاجی: نە بەوەڵا هیچ!

ساحیب: (روو لە شاگرد) بزانە جواڵەکەی چی تێدایە؟

شاگرد جواڵەکەی لای دەستی حاجی ڕائەکێشێ و تەماشای ناوی ئەکا.

ساحیب: بزانە دە دینار ئەیژێت، یا گاوەسەری بکەین؟!

حاجی: گاوەسەری چی، ڕەحمەت لە باوکت؟! ئەوە تەنیا بایی شەست دینار کەرەی تێدایە!

جگە لە هەنگوین و کولێرە و نانی ماڵی!

شاگرد: (دوای سەیرکردنی) وایە.

ساحیب: باشە تاکو بەیانی ئێوارە، رای گرن، ئەگەر هاتەو و پارەکەی دا، پێی بدەنەوە، نەهاتەو، هەمووی ئەبەمەوە بۆ ماڵی خۆم! ئاخر تۆ کە پارەت نییە چۆن داوای دە سیخ کەباب ئەکەی؟! هەستە هەستە بچۆ دەرە، ئادەی!

حاجی: تووڕە و عەسەبی دیتە دەرەو.

حاجی: ئەی خوا لاڵ و کەڕ و کوێرت کا، میرزا نێرەکەر خان، بۆ پەنێ دات پێم، هەر ئەڵێم مامەحەمە تەڕەماش نیم، ئەو هەر ئەڵێ

مامەحەمـە تەڕەماشـی! مـن هـەر ئەڵێـم مامەحەمـە تەڕەگەمـاڵ نیـم، ئـەو هـەر ئەڵـێ مامەحەمـە تەڕەگەماڵـی! ئەمـە گوایـا هاتـم سـەرقاتی بـۆ مـاڵ کوڕەکـەم بێنـم. ئـەی ماڵـت کاول بـێ میـرزا سـەگباب خـان بـۆ پەنـێ دات!

بە بۆڵەبۆڵ ئەڕواتە دەرەوە و لە چاوان ون ئەبێ.

مەحیە کەوتووەتە بەر و هەوسار کەرەکە رائەکێشێ.

مەحیـە: کارێکـی باشـم نەکـرد، بـەڵام قەیـدی نییـە، ئەڵێـم برسـیم بـوو، دامـە نیوەڕوانەیـەک خـواردم، بـەڵام خۆزگـە وا نەدەبـوو!

کابرایەکـی فەلـەج کاسـە ماسـتێکی بـە دەسـتەوەیە و لەرزەلـەرز خـۆی داوەتـە مـل گۆچانەکەیـا و لـە بـەردەرگای بەسـتراوی ماڵێـکا وەسـتاوە و بـە ناڵـە و نرکـە داوای یارمەتـی لـە خەڵـک ئـەکا.

فەلەج: کاکە لەڕێی خوا، داماوم، یارمەتییەکم بدەن.

فەلەج: برا مەحز رەزای خوا یارمەتییەکم بدە، ئیفلیج و داماوم.

لە کاتی قسەکردنا تماشایەکی باش و خەریدارانەی کەرەکە ئەکات.

مەحیە: بەخوا من لە تۆ هەژارترم کاکە، ئەنێ یارمەتیتم ئەدا.

فەلەج: بۆ مەگەر من هەژارم کاکە؟!

مەحیە: ئەی چی؟

هاتمـە دەرەوە لـەو دوکانـە نەختـێ ماسـت بکـڕم، تـا چـووم و هاتمـەوە بـا داوبـووی لـێ و لەودیـوەو دایخسـتووە. نازانـم لـەم دیـوارەوە چـۆن بچمە بـان و خـۆم بخەمـە حەوشـەوە و دەرگاکـە بکەمـەوە، حـازرم دە دینـار بـدەم، یەکـێ بۆمـی بکاتـەوە؟!

مەحیە: دە دینار؟!

فەلەج: بەڵێ وەڵا، زۆر نەخۆشم، ناتوانم ئەوەندە لەسەر پێ ڕاوەستم.

مەحیە: (تماشایەک دیوارەکە ئەکا) باشە کاکە گیان، دە دینارەکەم پێ بدە، تا بڕۆم بۆتی بکەمەو.

فەلەج: وەڵا من هەر ئەوەندە پارەم لەگەڵ خۆم هێنا کە ئەم ماستە بکڕم، پارەم پێ نییە، پارەکەم لە ژوورەوەیە، دەرگاکەم بۆ بکەوە، سەرچاو بۆتی دێنم.

مەحیە: (لەبەرخۆیەوە) خوایە شوکرت! چاکە ئیدی خەجاڵەتی خاڵم نابم.

(ڕوو لە فەلەج) باشە کاکە گیان، هانێ هەوساری کەرەکەم بۆ بگرە، تا بڕۆم بۆتی بکەمەو.

کابرا بە لەرزەلەرز ماستەکەی ئەنێتە سەر عەرز و هەوسار کەرەکە ئەگرێ.

مەحیە تف ئەکا لە دەستی و زۆر بەزەحمەت لە دیوارەکەوە ئەچێتە بان.

کابرا لە ژێرەوە لەرزەلەرز تماشای ئەکا.

فەلەج: ئەی باوکمە ساقەی کوڕی باش! ئەی ئافەرین! ئەی مەرحەبا!

مەحیە ئەچێتە سەر دیوار ماڵەکە و خۆی شۆڕەو ئەکا بۆ ناو حەوش و لە چاو کابرای فەلەج ون ئەبێ.

کابرای فەلەج زیندووەو ئەبێ، ماستەکەی جێ ئەهێڵێ و ئەپەڕێتە کۆڵ کەرەکە و پای پێیا ئەکوتێ و دەردەچێ.

مەحیە ئەپەڕێتە ناو حەوش و لە گرمەی داکەوتنەکەیەوە، چەند کەس لە ژوورەوە ئەیکەن بە هاوار.

خەڵکیماڵەکە: های دز! های دز! های بیگرن ئەوە دزە!

مەحیە هەراسان (حەپەساو) هەڵدەستێ و بەرەو دەروازەکە هەڵدێ! تا خەڵکەکە کەوش لەپێ ئەکەن دەگاتە دەروازەکە و ئەبینێ دەروازەکە دانەخراوە. ئەیکاتەوە و دەردەچێتە دەرەوە و تماشا ئەکا، نە کابرا هەیە نە کەرەکەی!

مەحیە: ئەی ماڵ کاولم!

دێ دەرچێ پای لە باییە ماستەکە دەکەوێ و هەڵدەگەڕێتە و چەن تل ئەخوا، بەڵام نارژێ!

مەحیە ئەکا بە باییە ماستەکا و هەڵدێ.

چەند کەس لە ماڵەکەڕا دەکەونە شوێنی!

مەحیە زۆر نیگەران و غەمبار لە گۆشەی دیوارێکا خۆی ئەشارێتەو.

مەحیە: ئەی بە لەعنەتی خوا بی ناپیاو! ئەی خوا لە چوار دەست و پێ کوچت کا بۆ درۆت!

خۆ ئەگەر هەڵنەهاتایم، بە ناو دز و درۆزنەو ئەنجن ئەنجن ئەکرام و تیکە گەورەکەم ئەبوو بە گوێم!

ئای خۆ ناو زکم گڕی گرتووە، ناقەڵەن باکو دوو ئەنگوس لە ماستەکەی بخۆم.

دەست ئەکا بە ماستەکا.

وەکوو بەرد سفت و سەختە.

مەحیە: ئەی خوا لێت قەبووڵ نەکا! ئەمە خۆ گەچە! بە توورەیی

کاسـەکە ئەکوتـێ بـە عـەرزا.

ئەرێ من بۆ ئەوەندە کەرم خوایا؟!

لەپشـت دیوارەکـەوە دێتـە دەرێ، بەنائۆمێـدی ئەکەوێتـە رێ، چەنـد جارێـک تفـی دەمـی قـووت ئـەدا. ئەگاتـە بـەر دووکانێکـی ئاڵـف فرۆشـی، کابرایـەک لـە بـەر دوکانەکـە دانیشـتووە، ئەچێتـە بـەر دوکانەکـە.

مەحیە: رۆژباش بابە گیان!

پیاوەکە: رۆژباش! چیت ئەوێ؟

مەحیـە: وەڵا غەریبـم و زۆر تینـوو، ئەگـەر نەختـێ ئـاوم پـێ بدەی، زۆر مەمنوونـت ئەبم.

پیاوەکە: وەڵا مـن ئاڵفـم هەیـە کاکـە گیـان، ئـاوم نییـە، بـەڵام ئەگـەر لـەو کۆڵانـە باریکـەو بچیتـە بـان لـە ئاخرەکەیـەو مەیدانچەیـەک هەیـە، پـاڵ چەپـی مەیدانچەکـە چاوانـەی ئـاوە. ئاوەکەیـش زۆر فێنـک و خۆشـە. دڵـوێ چەرمیشـی لەسـەرە، بـەری دە نـاو چاوانەکـە هەتـا زگـت ئەگـرێ ئـاو بخـۆرەوە میوانـی مـن، دە بـرۆ بـان چـاو هاتـی.

مەحیە ئەکەوێتە رێ.

ئەگاتە سەر کۆڵانە باریکەکە.

چـوار پیـاو ئەبینـێ کـە هـەر کام یـەک تەبـەق خوانچەیـان ناوەتـە بـان سـەر و بەشـوێن یـەکا ئـەڕۆن.

مەحیـە ئەوەسـتێ تـا ئـەوان رەد ئەبـن، جـا واریـدی کۆڵانەکـە ئەبـێ و ئەکەوێتـە رێ.

کابرایـەک تەبەقـی خوانچەکـەی لـە شـان چاوانـەک دانـاوە و خەریکـە بـە تەنـاف ئـاو هەڵئەگۆزێ.

مەحیە دێت لە بەرانبەریەوە ئەوەستێ.

کابرا تەماشایەک کەوش و جلوبەرگەکەی مەحیە ئەکا و سەر دائەخا بە مل چاوانەکا و دڵۆەکەی لێ دەردێنێ.

تماشایەک ناو دڵۆەکە ئەکا و ئاوەکەی بەنیگەرانییەوە هێواش هێواش ئەڕژێنێتە سەر عەرز و تماشای ئەکا و بە دوو دەستی ئەکوتێ بە تەوق سەری خۆیا و دەست ئەکا بە گریان.

مەحیە ئەچێتە بەرەو.

مەحیە: ببوورە کاکە، زۆر تینووم وەختە بخنکێم.

کابرا بەدەم گریانەوە دڵۆەکە بەرەو ئەدا بۆ ناو چاوانەکە و هەر بەو حاڵەتەوە دڵۆەکە دەردێنێ. تەماشایەک ناو دڵۆەکە ئەکا و بە ئیشارە مەحیە حاڵی ئەکا کە بێتە بەرەو بۆ ئاو خواردنەوە.

ئاوەکە جۆرێ لار ئەکاتەوە بۆ سەر عەرزەکە کە مەحیە دەم بنێتە بەریەو بۆ خۆشی چاوی لە ئاوەکە بێ.

مەحیە دەم ئەداتە بەر ئاوەکە و بە زەحمەت چەند قومێک ئەخواتەوە.

مەحیە: ئۆخەی! تینوێتیم شکا!

کابرا دڵۆەکە دادەتەکێنێ و و بەدەم گریانەوە ئەیخاتەوە ناو چاوانەکە.

مەحیە: ببوورە مامە گیان بۆچی ئەگری؟

کابرا: کورە ملم بشکێ، لەگەڵ چەند کەسی دیکە خوانچەی زەماوەندی کوڕی حاکم، ئەبەین بۆ ماڵ بووک، گەیشتمە ئێرە تینوێتی زۆری بۆ هێنام. خوانچەکەم لێرە دانا، دڵۆەیەک ئاو دەربێنم، کلکەوانەی کوڕی حاکم کە پێم بوو، تاکو پێشکەشی بووکی بکەم، بە دەستمەوە بوو،

هەردڵوەکەم دەرهێنا لە دەستم بەربوو و کەوتە ناو چاوانەکە ئێستە نازانم چ خاکێ بە سەری خۆما بکەم و چۆنی دەربێنم؟ دە دڵو ئاوم لێ کێشاوەتە دەر، بەڵام بە دڵو دەرنایێ! بەوەڵا کوڕی حاکم بزانێ پەنی وام داوە، ئەمکێشێتە سێدارە! مەحز ڕەزای خوا کارێکم بۆ بکە کاکە، هەر چی بڵێی پارەت ئەدەمێ!

مەحیە: چی بکەم؟

کابرا: بە لای ئەم خوانچەمەوە دانیشە، بەڵکوو بڕۆم بە دوای قومەشکەنێکا و بیهێنم، بۆمی دەربێنێ، قورسە ناتوانم لەگەڵ خۆما بیبەم.

مەحیە: قومەشکەن دوورە؟

کابرا: کورە نەوەڵا هەر لەم کۆڵانەی ژوورەوەدایە، یەکێ ئەناسم، بڕۆم بەڵکوو لە ماڵ بێ.

مەحیە: دەی چۆن بڕوات بە منە تا بێیتەوە، خوانچەکەت نەدزم؟

کابرا: قسەی وا مەکە کاکە گیان، تۆ پێتا دیارە چەنێ پیاوێکی شەریف و ئینسانێکی مەزنی! من بڕوات پێ ئەکەم.

مەحیە: باشە کاکە گیان باشە! بڕۆ، بەڵام تۆ خوا زوو بێرەوە، منیش دەرد و چارەڕەشیی خۆمم هەیە!

کابرا: ئەوە هاتمەو.

مەحیە دادەنیشێ و کابرا بە دەرچوون دوورەوە ئەبێ.

مەحیە: ئەی خوای گەورە من ئەمڕۆ بە چ ڕوویەکەوە دەرگای ماڵی خاڵم بکوتم، لێم بپرسێ کەرەکەم کوانێ، چی بڵێم؟!

ئەوەندەی پێ ناچێ کابرا لەگەڵ قومەشکەندا دێتەوە.

پیاو: کەوتە ئەم چاوانەوە کاکە گیان.

قومەشکەن: قیمەتی کلکەوانەکە چەندە؟

کابرا: نازانم، بەڵام ئەبێ گران بێ، زۆر گران.

قومەشکەن: ئەگەر قیمەتی کلکەوانەکەت بزانیبا، من بە نیوەی قیمەتەکەی بۆتم دەرنەهێنا!

بەڵام ئێستا کە نازانی و لێت نامەعلوومە، من سەد دینارت لێ ئەسێنم و بۆتی دەردێنم.

کابرا: سەد دینار؟! بۆ مەگەر پارە رژاوە کاکە؟!

قومەشکەن: ئەی چی وەتزانی بە موفت بۆت دەردێ؟!

کابرا: نە کاکە گیان، دە دینار نە بیست دینار، ئیدی بۆ سەد دینار؟!

قومەشکەن: نەوەڵا ببوورە بە من ناکرێ، برۆ یەکێکی تر بێنە.

ئەکەوێتە رێ ئەچێ.

کابرا: راوەستە کاکە سی دینار.

قومەشکەن: (بە دەم دوورکەوتنەوەوە) نە سەد دینار، ئەویش هات بە دەممدا.

ئەچێتە ناو کۆڵانەکە و لە چاوان ون ئەبێ.

کابرا: ئەی داد و بێ داد! (رۆڵە مەحیە بەقوربانتم بە شوێنیا برۆ، بڵێ، ئاخری بە پەنجا دینار بۆم دەربێنێ).

مەحیە: (چاوی زەق ئەبێتەوە) پەنجا دینار ئەدەی؟!

کابرا: ئەی چی بکەم کاکە گیان؟ گیان و ژیانم لە خەتەردایە!

مەحیـە: (لەبەرخۆیـەوە) هەمـوو زەرەر و زیانـی خالْـم ئەدەمـەوە! (بـە دەنگی بـەرز) مـن خـۆم بۆتـی دەردێنم، بـەڵام پارەکـەم لە بـەرا وەرئەگرم.

کابرا: ئەتوانی؟

مەحیە: بۆ ناتوانم؟

کابرا: باشە بەقوربان، لە بەرا پێتی ئەدەم.

دەسـت بـە گیفانیـدا ئـەکا و یـەک کیسـە سـکە دەردێنـێ و ئەیـدا بـە مەحیـە.

کابرا: ئەوەتا بیژمێرە! پەنجا دیناری تەواوە!

مەحیـە بەخۆشـحاڵییەوە پارەکـە وەرئەگـرێ و ئەینێتـە نـاو باخەڵـی کەواکـەی.

مەحیە: جا ئێستا...

خـۆی رووتـەوە ئـەکا، لـە ژوور چاوانەکـەو گژوگیایەکی زۆر هەڵـەو دراوە. ئەچـێ لەپشـت گژوگیاکـەوە کەواوپاتۆڵەکـەی دەردێنـێ و نەختـێ گیـا ئەداتـە دەور خـۆی.

کـەوش و جلوبەرگەکـەی لەنـاو گژوگیاکـەدا دادەنـێ و بـە گیـا دایـان ئەپۆشـێ و وەک خەڵکـی رووتـی ئامـازۆن دێـت بـۆ بـەر چاوانەکـە و بـە یارمەتیـی کابـرا ئەچێتـە نـاو چاوانەکـەوە.

کابرا: جا ئێستە چنگ بخە بن ئاوەکە و باش بۆی بگەڕێ.

مەحیە: سەرچاو، بەڵام ئاوەکەی زۆر ساردە!

ماوەیەک خەریک ئەبێ، سەربەرز ئەکاتەو.

مەحیە: نییە، کاکە، هەموو لەیەکی گەڕام نییە!

مەحیە: جواب نابیسێ و وردەوردە مەشکووک ئەبێ!

مەحیە: ئەک ماڵ کاولم! کەلوپەلەکەم! جلوبەرگەکەم!

بە تەنافەکا خۆی هەڵئەکێشێتە بان.

سەر لە چاوانەکە دەردێنێ و تەماشا ئەکا. نە کابرا دیارە و نە تەبەق و خوانچەکەی!

مات و موتەحەیر سەیری بەردەمی خۆی ئەکا.

زۆر بە نائۆمێدی دێتە دەرەوە و بە گژوگیا تەڕەکەوە کە چۆڕەی دێ، خۆی ئەخاتە ناو گژوگیاکە هەرچی ئەگەڕێ بۆ جلوبەرگەکەی پەیدای ناکا.

دائەنیشی و پەنجە هەڵئەپێکێ و دەست ئەکا بە گریان. خەڵک بە لایا رائەبوورن و ئەیبینن ئەگری، بەڵام کەس لێی ناپرسێ و ئەویش کاری بەسەر کار کەسەوە نییە.

مەحیە: (لەبەرخۆیەوە) خاڵم ئەمەیە لێ ئەزانی، وا وتی، ئەگەر لە هەرسێکی یەک دانەم پێ بگەیەنی، ئەوجا قەبووڵ دەکەم کە تۆ کوڕی شاری! ئێستا جا بە چ ڕوویەکەوە بڕۆم لە دەرگای ماڵەکەی بدەم و بڵێم هاتووم؟! نە کاری وا ناکەم، ئەمشەو هەر لەناو ئەم گژوگیایەدا ئەخەوم، ئەگەر تا بەیانی خۆشمیان نەدزی، بەر لەوە خەڵکی شار لە خەو هەستن، خۆم ئەخەمە دەرەوەی شار و ئەچمەوە بۆ ئاوایی خۆمان. هیچ نەبێ جلوبەرگە شڕەکەم هەر ماوە.

خۆر ئەنیشێ.

تاریکی شار دادەپۆشێ.

مەحیە لەناو گژوگیاکەدا خەوتووە.

خۆری بەیانی هەڵدێ.

مەحیە بەو گژوگیایەی کە لە خۆی پێچاوە، رەشوپووت و پاپەتی ڕێگای گرتووەتە بەر.

یەکێ لە قوماربازەکان لە چاڵەکە سەر دەردێنێ و چاوی بە مەحیە ئەکەوێ.

قومارباز: موور محەمەو! ئەمە ئیدی چییە؟!

ئەوان تریش سەر دەردێنن.

پیاوی یەکەم: ئەوە چییە؟!

پیاوی دووەم: جن و پەرییە یان ئادەمیزاد؟!

پیاوی سێیەم: کورە جن و پەریی چی؟ داخۆ چ ڕۆژڕەشێکە لە خۆشیا شێت بووە!

هەموو دەست بە پێکەنین ئەکەن و ئەچنەوە بۆ ناو چاڵەکە.

مەحیە بەرەو ئاواییی خۆیان دوور ئەکەوێتەوە و لە چاوان ون ئەبێ.

# پیرەژنی مەدائن

**پرسۆناژ:**

**- پیرەژن**

**- بەننا**

**- میعمارباشی**

زەمانی کۆنە

چەند بەننا و کرێکار خەریکی سازکردنی تاقی کەسرا یان ئەیوانی مەدائنن.

پیرەژنێ دەستی ناوەتە پشتی لە عەمارەتەوە بە راگوزەر ئەڕوا.

بەننا خەریکی کاری خۆیە و کرێکار ئاجۆر (کەرپووچ)ی بۆ هەڵدەخا، پیرەژن ئەوێستێ و دوای نەختێ تماشاکردن، روو لە بەننا ئەکا.

پیرەژن: کاکی بەننا ئەو یەک ئاجۆرە داتناوە، لارە، راستی کەوە!

بەننا: (دوای نەختێ تماشاکردنی ئاجۆرەکان) بڕۆ دایکم تۆ کارت نەبێ.

پیرەژن: ئەڵێم ئەو ئاجۆرەت لار داناوە یانی چی تۆ کارت نەبێ؟

بەننا: بە تۆ مەربووت نابێ دایکم، بڕۆ بە شوێن ئیشی خۆتا!

پیرەژن: (تووڕە) من بۆ خۆت ئەڵێم کەری نەفام! ئەڵێم ئەو ئاجۆرەت لارە، بڵێ بان چاو، بۆ وا ژوابم ئەدەیەوە نەفام؟!

لە قیڕە و هاواری پیرەژنەکە، میعمارەی عیمارەتەکە بە تۆمارێکەوە خەریک نیزارەتە، تێ دەگا لە هاوار و دادی پیرەژن و دێتە بەرەوە!

میعمار: چی بووە، چی قەوماوە دایکم؟ بۆ داد و بێدادت رێ خستووە؟!

پیرەژن: بەم کەرەی نەفامە ئەڵێم ئەو ئاجۆرەت لار داناوە، جوابی بێحورمەتانەم پێ ئەداتەوە!

بەننا: وتوومە تۆ کارت نەبێ، ئەمە بێ حورمەتییە؟!

پیرەژن: ئەرێ، چۆن بێحورمەتی نییە! ئەمە عیمارەتی مەدائنە و دەبێ جێ شانازی و ئیفتیخاری هەموو میللەت بێ، چۆن ئەبێ ئاجۆرێکی لار بێ!

میعمار: تۆ راست دەکەی دایکم، بە من بڵێ کام ئاجۆر لارە تا بە سپاسەوە راستی کەینەوە، سەرچاو، تۆ هەر تووڕە مەبە!

پیرەژن قامک بەرەو ئاجۆرەکە درێژ ئەکاتەوە.

پیرەژن: ئا ئەو یەک دانە.

میعمار: بەڵێ وەڵا بەڕاست لارە! راست دەکا کاکی خۆم ئەو یەک ئاجۆرە لارە، هەڵی تەکێنە و جارێ تر بینە سەر جێگاکەی.

بەننا: من ئاجۆری لار نابینم میعمار باشی، کام ئاجۆری من تا ئێستا لار بووە؟

میعمار: ئەی بابا! تا ئێستا ئاجۆرت لار دانەناوە، بەڵام ئەم یەک دانە نەختێ لارە! جێبەجێی کە، تەواوی کە.

بەننا: کام دانە؟ ئەمە؟

پیرەژن: نە ئەو یەکەی پشتی.

بەننا: ئەمە؟

پیرەژن: نا، پشتی ئەوە!

بەننا: ئەمە؟

پیرەژن: ئەرێ ئەوە، خۆیەتی.

میعمار: ئەریّ ئەوەیە، نەختیّ جێبەجێی كە.

كابـرای بەننـا بەتوورەیـی ئاجۆرەكـە دەردێنــیّ و یـەك جـاری دیكـە ئەینێتــە سـەر جێیەكـەی خـۆی!

بەننا: ها، چاك بوو؟

پیرەژن: بەڵیّ وەڵا، دەستت خۆش بیّ.

میعمار: ئێستا بەدڵتە؟

پیرەژن: بەڵیّ وەڵا، چاك بوو!

میعمار: ئێمەش زۆر سپاسی تۆ ئەكەین كە پێمانت وت.

پیرەژن: خوداحافیز. ( ئەچیّ)

میعمار: سەرچاو هاتی.

بەننا كار وێڵ ئەكا و لەسەر چێوبەست دێتە خواریّ.

پیرەژن دوور ئەكەوێتەوە.

میعمار: بۆ هاتیتە خواریّ؟

بەننـا: ئیـدی مـن كار ناكـەم میعماریاشـی، ئیزنـم بـدە بـڕۆم، یەكێكـی دیكـە بنـیّ جێگاكـەم.

میعمار: بۆ؟

بەننـا: بـۆ ئـەوەی مـن شـەوارەمە و دوای بیسـت سـاڵ بەننایـی، ئاجـۆر لار دادەنێـم!

میعمار: گەوج مەبە، ئاجۆری تۆ لار نەبوو، بچۆوە سەر كارەكەت!

بەننا: ئەگەر لار نەبوو، ئەی چۆن بە منت جێبەجیّ كرد؟!

میعمـار: بـۆ ئـەوەی تووشـی پیرەژنێكـی ناحاڵـی بوویـن و ئەگـەر ئـەو

کارەم نەکردایا، دەچوو قووی ئەدا بە نێو شارا، ئەیگوت، عیمارەتی مەدائن ئاجۆرێکی لارە و خەڵکی ناحاڵیی تر لەوەوە مەشیای تاکو ئەبەد بیانگوتایێ، کۆشکی مەدائن ئاجۆرێکی لارە! ئەوەم وت کە خەیاڵی ئەو ژنە ئاسوودە کەم و دوایی بە ماجەرای (سەرئێش)ەکە بێنم، ئەگینا ئاجۆری تۆ هیچ ئیشکاڵی نەبوو.

بەنناکە نەختێ تماشای میعمارباشی ئەکا و سەر بۆ تەئیدی قسەکانی دادەتەکێنێ و لە چێوباسەکەوە ئەچێتەوە بان و خەریک کاری خۆی ئەبێ.

پیرەژنەکە بەرەو شاری مەدائن، دوور و دوورتر ئەکەوێتەوە.

# هەتا ئەبەد هەر ئەمەیە!

**پرسۆناژ:**

**- دەرویشی دەوڵەمەند**
**- غوڵامی دەرویش**
**- پیرەمێردی جۆڵا**
**- قاوەچی**
**- کەبابچی**

دەروێش لەگەڵ غوڵامەکەیدا دێتە ناو بازاڕەوە. لە دوورەوە دەنگی کابرای جۆلا لە کاتی کارکردندا بە گوێی ئەگات.

جۆلا: ئەمەسە و ئەمەسە! هەتا ئەبەد ئەمەسە! نە من ئەڵێم ماندووم، نە تۆ پێم ئەڵێی بەسە. ئەمەسە و ئەمەسە... هەتا ئەبەد ئەمەسە، نە من ئەڵێم ماندووم نە تۆ پێم ئەڵێی بەسە!

جۆلا بە ریتمی دەزگای جۆلاییەکەی، هەر ئەم شیعرە تێکرار ئەکاتەوە.

دەروێش: گوێت لێیە؟!

غوڵام: بەڵێ گەورەم.

دەروێش: تاکو ئێستا دەیان جار لەم تیمچەوە هاتوچۆم بووە و هەر ئەم کەلیماتەم بیستووە.

غوڵام: بەڵێ وایە گەورەم.

دەروێش: بڕۆینە ناو دوکانەکەی و لێی بپرسین بزانین دەردی چییە و بۆ دایم ئەم دروشمە تێکرار ئەکاتەوە!

غوڵام: فەرموون، بڕۆین.

هەردووکیان ئەچن بەرەو دوکان کابرای جۆلا. کابرای جۆلا هەر ئیش ئەکا و هەر شیعرەکەی تێکرارەوە ئەکا. دەروێش و غوڵام وارید دوکانەکە ئەبن.

دەروێش: ماندوو نەبی مامە جۆلا!

جۆلا: سوپاست ئەکەم مامە دەروێش، فەرموو فەرموو دانیشن.

دەروێش: یالا (روو بە غولام) دانیشە!

هەردوو پێکەوە دادەنیشن.

دەروێش: یارەبی بەخێر بێن، هەر ئەمرێکتان هەیە من لە خزمەتاندام!

دەروێش: بەڵێ وەلا یەک دانە بەرماڵم ئەوێ، بەلام پێویستتر لەوە، پرسیارێکە کە لێتم هەیە و ئەبێ جوابم بدەیەوە.

جۆلا: بەسەرچاوان، فەرموو بیکە!

دەروێش: دوو سێ ساڵە، من جار بەجار لەم تیمچەوە هاتوچۆ ئەکەم و هەموو جارێ دەنگی تۆ ئەبیسم کە ئەم کەلیماتە ئەڵێی و دووبارەی ئەکەیتەوە، هۆی چییە، ئەمەسەو ئەمەسە، هەتا ئەبەد ئەمەسە!

جۆلا: وەلا قوربان زۆر منداڵ بووم کە دایکم دەستمی گرت، بۆ ئەوەی ئیش و کارێ بۆ داهاتووی ژیانم فێر بم، نامیە جۆلایی. دوای چەند ساڵ شاگردی، باب و دایک مردن. ئەوەی لە ئیرس و میرس بۆ من ما نامە بان یەکەوە و فرۆشتم و ئەم دوکانەم پێ کڕی و ئەم ئامێری جۆلاییمە پێ خستە ڕێ. هەموو ڕۆژی هەتا ئێوارە ئیشم کرد و دەستکەوتی ئەو ڕۆژەم هەر ئەوەندە بوو کە ڕۆژی دوایی بیخۆم. نە زیاتر، نە کەمتر! ئەلعان دەوروبەری چل ساڵە لەم دوکانە ئیش ئەکەم. هەموو ڕۆژێ لەنێو تیمچە، بۆنی کەبابی گۆشت و کەبابی مریشک دێ بە لووتما و حەزی لێ ئەکەم، یەک دوو جار نەمتوانیوە

بەری نەفسی خۆم بگرم، کڕیومە و خواردوومە. تاکو ئێستا پارەکەی قەرزدارم! چی بڵێم دەروێش؟ بە مێشکمدا وەکوو ئیلهام هاتووە کە: ئەمەسەو ئەمەسە، هەتا ئەبەد ئەمەسە، نە من ئەڵێم ماندووم، نە تۆ پێم ئەڵێی بەسە! یانی نە من بە ئامێری ئیشەکەم ئەڵێم ماندووم و نە ئەو بە من ئەڵێ ئیدی بەسە و هەردوو تاکو ئەبەد مەحکوومین بەم ژیانە. ئەوەتە دوکانەکەم بەرەو خراپبوون ئەڕوا، ئامێرەکەم تەو لەق بووە، خۆم شڕەبار و لاواز، ئەمەیە!

دەروێش: عەجەب! تێ گەیشتم مامە گیان، بەڵام خودا گەورەیە. من بۆ نیوەڕۆی سبەی، مریشکێکت بۆ بەم هاوڕێیەما ئەنێرم، بیخۆ، ئینشەڵا مورادت حاسڵ ئەبێ.

جۆڵا: زۆر مەمنوونم مامە دەروێش، بەڵام رازی بە زەحمەتی ئێوە نیم.

دەروێش: نە زەحمەت نییە.

جۆڵا: دەستت خۆش بێ.

دەروێش: جا ئێستا بەرماڵەکەم پێ بدە.

جۆڵا: لێم ببوورە مامە دەروێش، بەرماڵی ئامادەم نییە، مەگەر سەبرم لێ کەی دوای ئەم جاجمە، بۆت ساز کەم.

دەروێش: باشە بەقوربان من سەبر ئەکەم، بەڵام دیسانەوە پێت ئەڵێم ئەو مریشکەی بەیانی بۆت ئەنێرم بیخۆی! هەموو شتێ رێکوپێک ئەبێ.

جۆڵا: بەسەرچاو.

دەروێش: هەڵئەستێ، غوڵام هەڵئەستێ.

دەروێش: خوداحافیز.

جۆلا: خواتان لەگەڵ.

هەردوو ئەچنە دەرەوە.

جۆلا دیسانەوە شیعرەکەی دەست پێ دەکا.

## (شەو... ماڵی دەروێش)

دەروێش لەژێر نووری چەند دانە شەما خەریک خوێندنەوەی کتێبە.

## (رۆژ... ماڵی دەروێش)

دەروێش چەند دانە کتێبی لە دەور خۆیا داناوە و خەریک تەماشاکردنی کتێبێکە. غولام بە سینییەکەوە کە مریشکی سوورەوکراوی تێدایە دێتە ماڵەوە.

غولام: ئیزنم هەیە گەورەم.

دەروێش: وەرە وەرە دەستت خۆش.

غولام مریشکەکە لەبەردەم دەروێشدا دادەنێ .

دەروێش: زۆر چاکە. جا ئێستا برۆ دوو دانە نانی تازە بێنە، تا تۆ بێیتەو من ئامادەی دەکەم.

غولام: سەرچاو.

غولام ئەچێتە دەرەوە. دەروێش لەپشت پشتییەکەیەوە یەک کیسە پڕ لە سکەی تەلا دەردێنێ. زکی مریشکەکە ئەکاتەوە و پڕ ئەکا لە سکەی تەلا و دای ئەدووریێ.

## (رۆژ... نێو تیمچه)

خەڵـک لـە هاتوچـۆدان. دەنگـی کابـرای جـۆلا ئەبیسـترێ کـە شـیعرەکەی تێکـرارەوە ئـەکات. غـوڵام بـە قاوەسـینییەکی سەرپۆشـدار کـە مریشـکەکەی تێدایـە دێتـە نێـو تیمچـەوە و بـەرەو دوکانـی جـۆلا ئـەڕوا. واریـدی جۆلاییەکـە ئەبـێ.

غوڵام: ڕۆژباش مامە جۆلا ماندوو نەبی.

جۆلا: ڕۆژباش برام تۆ ماندوو نەبی.

غـوڵام: ئەمـەش ئـەو مریشـکە سـوورەوکراوە کـە دوێنـێ دەروێـش قەوڵـی پـێ دای. فەرمـووی حەتـم بیخـۆی.

جـۆلا: ئـەی دەسـتی خـۆش بـێ، زۆر مەمنوونـم، خـودا ئینشـائەلا لـە گەورەیـی کەمـی نـەکا، دەسـتی تـۆش خـۆش بـێ.

غوڵام: نۆشی گیانت.

سینییەکە لەسەر سەکۆی دوکانەکە دادەنێ.

جۆلا: ڕەبی دەستت خۆش بێ

غوڵام: خوداحافیز

جۆلا: سەرچاوانم

غـوڵام لـە دوکان ئەچێتـە دەرێ. جـۆلا دەسـت لـە کار هەڵئەگرێ و ڕوو لـە مریشـکەکە ئـەکا و چەنـد جار بـە چـاوی قووچـاو بۆنـی ئەکێشـێ.

جـۆلا: بـەه بـەه! بـەه بـەه! چ عەتـر و بۆنێکـی هەیـە! ئۆخـەی وا ئەتوانـم ئەمـڕۆ بەبـێ دڵەڕاوکـێ نیوەڕوانەیەکـی بـاش بخـۆم و زکـم لـە شـیوەن دەربێنـم! جـا ئێسـتا بـڕۆم بەرلـەوەی دەسـتی پێـوە بـدەم، دەسـتانم تەمیـس بشـۆم، جـا بێمـەوە و بـە باوکمـەوە بێـم دەوریـا!

جۆلا هەڵئەستێ لە پاچاڵ دێتە دەرێ، هەر دەرگا ئەکاتەوە کابرای کەبابچی لە بەدەمیدا سەوز دەبێ و دێت نێو دوکانەوە.

جۆلا: سەلام ماندوو نەبی.

کەبابچی: وەڵا چی بڵێم مامە گیان ئەگەر چوار مشتەریی وەکوو تۆم بێ، هەتا هەتایە ئەبێ هەر ماندوو بم و ماندووییم دەرنەچێ!

جۆلا: بۆ؟

کەبابچی: چی بوو؟ منیش وەکوو تۆ هەژارم کاکە گیان، منیش سەرمایەیەکی چکۆلەم هەیە کە ئەبێ رۆژانە بیدەم بە چەند دانە مریشک و بیکەم بە کەباب و بیدەم بە خەڵک! جا ئەگەر هەموو بێن و بە قەرز بیخۆن و بڕۆن ئیدی من ئەبێ چۆن بژیم؟ دوو مانگە کەبابەکەت خواردووە و پارەکەی نادەی!

جۆلا: بەوەڵا نیمە کا گیان، بەڵام قەول شەرەفت پێ ئەدەم ئەو جاجمە تەواو بێ، لە دەینت دەربێم.

بۆنی مریشکەکە ئەچێ بە لووت کابرای کەبابچییا. چەند جار بۆن دەکێشێ.

کەبابچی: بەه بەه! بەه بەه! (لووتی ئەنێتە بان مریشکەکە) کە نیتە، ئەگەر نیتە ئەمە چییە؟ قەرزەکەت بۆ منە و نەختەکەت ئەبەی لە لایەکی ترەوە مریشکت بۆ کەباب کەن، ئەرێ؟! ئەگەر پارەت نییە ئەمە چییە؟!

جۆلا: ئەوە دوێنێ کابرایەکی دەروێش هاتە نێو دوکانەکەم و نەختێ دەردەدڵم بۆی کرد، ئەمڕۆ لەڕێی خودا ئەو مریشکە کەبابەی بۆم ناردووە!

کەباچی: هـن! ئـەم جـۆرە دەروێشـانە لای مـن بـۆ چـە نایێـن؟! لاوە پارەکـەم بـەرێ باکـو تووشـی قەرقەشـت نەکـەم! هـا دەی!

جۆلا: یانی بڕوات بە قسەکەی من نییە؟

کەبابچی: نەوەڵا بڕوای چی؟

جـۆلا: دە باشـە کاکـە. لـە چتـی بەقیمـەت ئێسـتا هـەر ئـەو مریشـکەم هەیـە. تـۆ رانێکـت بـۆ مـن نـارد بـەڵام ئـەوە حەتـم مریشـکێکی کامڵـە. بیبـە لەباتـی قەرزەکـەت مـن نایخـۆم.

کەبابچی: وەڵا ئەیبـەم بـۆ نایبـەم! دوو مانگـە سـەرمایەی دوکانـی مـن لای تـۆوە نووسـتووە، ئەگـەر یـەک مریشـکیش بـێ حەقـی خۆمـە، بـۆ نەیبـەم؟

سینییەکە هەڵدەگرێ و لە دوکان ئەچێتە دەرێ.

جـۆلا ئەگەڕێتـەو بـۆ نێـو پاچاڵەکـەی خـۆی و دەس بـە کار ئـەکا و شـیعرەکەی ئەڵێتـەوە.

## (ماڵی دەوریش)

دەروێـش خەریکـی روونووسـینەوەی یـەک نـاوەڕۆک لـە کتێبـە. غـوڵام لـە دەرکـە ئـەدا.

دەروێش: وەرە ژوورێ

غوڵام: (دێتە ماڵەوە) ئیزن هەیە گەورەم!

دەروێش: ها چ خەبەر؟

غـوڵام: وەڵا هیـچ گـەورەم، هـەر ئەمـەس و ئەمـەس، هەتـا ئەبـەد ئەمەسـە!

دەورێش: مەگەر ئەبێ؟

غولام: چی بڵێم قوربان!

دەورێش: هیچ گۆڕانکارییەک، هیچ فەرق و تەحەولێ؟

غولام: هیچ و هیچ، بەڵام...

دەروێش: بەڵام چی؟

غـولام: کەبابچییەکـەی لای دەس دوکانەکەیـان رمانـدووە و خەریکـن چاکسـازی ئەکـەن، پێـم وایـە ئـەو مریشـکە دەسـتکەوتی ئـەوان کرابـێ، ئـەو کەبابچییـە زۆر هـەژار بـوو، لـەوە ناچـوو بتوانـێ ئـاوا کارێ بـکا.

دەروێش تەماشای ناو چاوی غولام ئەکا و ئەچێتە فکرەوە.

غولام: من وا تێ گەیشتووم.

دەروێش: لێت نەپرسی خواردوویەتی یان نا؟

غـولام: بەڵـێ وەڵا ئەیگـوت خواردوومـە و دوعـای خێرێکـی زۆری بـۆ جەنابـت کـرد و ئەیگـوت زۆر بەتـام و چێـژ بـووە! دەروێـش: هـن! باشـە قەیـدی نییـە، مـن بەیانـی مریشـکێ تـری بـۆ ئامـادە دەکـەم.

غولام: سەرچاو.

دەروێش: سەری پیرەژنە هەتیوبارەکەشت دا؟

غولام: بەڵـێ وەڵا، ئـەو زۆر چـاک بـوو! جلوبەرگـی تـازە و جوانـی لەبەر هەتیـوەکان کردبـوو، بەپێچەوانـەی ئـەو رۆژەوە کـە هەموویـان زەرد و زەعیـف و چاوبەگریـان بـوون، هەمـوو بـە سـەرگۆنای سـوورهەڵاتوو، خەریکـی کایـە و کەنیـن و زەقیـن بـوون!

دەروێـش: زۆر چاکـە! شـوکر بـۆ خـودا! ئیـدی تـا بەیانـی هیـچ کارێکـم پێـت نابـێ، بـڕۆ بـۆ خـۆت ئیسـتراحەت بکـە.

غولام: (بە تەکریم) ڕۆژباش گەورەم.

ئەچێتە دەرێ.

## (ڕۆژی دوایی)

دەستی دەروێش دیسانەوە پڕ زک مریشکی سوورەوکراو ئەکا لە سکەی تەلا.

## (دوکانی جۆلا)

کابرای جۆلا خەریک ئیش و قسەی خۆیە.

غولام بە قاوەسینیی مریشکەوە دێتە ناو دوکان.

غولام: ڕۆژباش مامە جۆلا، ماندوو نەبی.

جۆلا: زۆر سوپاس بەقوربان خۆت ماندوو نەبی.

غولام: کاکی دەروێش دیسانەو مریشکێ تری بۆت ناردووە مامە گیان.

جۆلا: ئەی دەستی خۆش بێ، ئەوەکەی تر زۆر بەتام بوو، هێمان تامەکەی وا لەژێر دیانمدا.

غولام: (دای دەنێ) کاکی دەروێش فەرمووی پێت بڵێم ئەم مریشکە ئەگەر بخۆی بە هەموو ئاواتەکانت ئەگەی! فەرمووی بیخۆی مورادت حاسڵ ئەبێ! فەرمووی حەتم، خۆت بیخۆی!

جۆلا: ئەوەکەی تریش هەر خۆم خواردم، ئەمیش هەر خۆم ئەیخۆم!

غولام: ئینشائەڵا، ئیدی لە من خوداحافیز.

جۆلا: سەرچاوانم بە سلامەت، غولام ئەچێتە دەرەوە، جۆلا نەختێ بۆن ئەکێشێ و روو ئەکا لە مریشکەکە.

جۆلا: بە خواردنی مریشکێ، بە هەموو ئاواتەکانم ئەگەم و مورادم حاسڵ ئەبێ! ئەی نابێ! دەرویش نەفەسی لە جێی گەرمەوە دەردێ و نازانێ من بە خواردنی سەد مریشکیش بە هیچ ئاواتێکم ناگەم! ئاخر دوای پیری و بەساڵاچوویی چ ئاواتێ؟ چ مورادێ؟

لەم کاتەدا کابرای قاوەچی چایەک بە دەستەوە دێتە نێو دوکان.

قاوەچی: سەلام مامە گیان.

جۆلا: سەلام رۆڵە بەخێر بێی، دەستت خۆش!

قاوەچی: ئەوە وسا (وەستا)م وتی، پێت بڵێم حەسابمان زۆر کێشاوەتە سەر، بەڵکوو نەختێ پارەم بۆ بنێرێ.

جۆلا: بۆ مەگەر من چەند قەرزارم؟

قاوەچی: شەش مانگی تەواوە، هەموو رۆژێ لە سێ نۆبەتا چاییم بۆ هێناوی، شەش سی رۆژ، سەدوهەشتا رۆژ. رۆژێ سێ چایی، ئەکاتە پانسەوچل چایی!

جۆلا: ئەی باوکم رۆ! من پانسەوچل چاییم خواردووە؟!

قاوەچی: بەڵێ وەڵا، عەڵبەت نە پێکەوە، لە مودەی شەش مانگا.

جۆلا: دەی بەوەڵا هیچ پارەم نییە، بەڵام کارێکی دیکە ئەکەین. ئەوە ئیستا نیوەڕۆە. ئەوەتە یەک دانە مریشکیان بۆم هێناوە، بیوە بیدە بە وەستات، بڵێ یان خۆی بیخوا یان بەش بەشی کاتەوە بیفرۆشێ لەباتی پارەی چایەکانی.

قاوەچی: شتی وا چۆن دەبێ؟

جۆلا: بۆ نابێ بەقوربان! (سینییەکە هەڵدەگرێ و ئەیدا بە دەس قاوەچییەکەوە) ئا باوکی باوکم، بۆ نابێ؟

قاوەچی: ئەگەر وەری نەگرت، چی؟

جۆلا: بۆمی بێرنەوە، بۆ وەری ناگرێ؟

قاوەچی: باشە سەرچاو.

جۆلا: برۆ بە سلامەت.

قاوەچی لە دەرگا ئەچێتە دەرێ. جۆلا دووبارە خەریکی ئیشی خۆی ئەبێ.

جۆلا: بە خواردن و نەحواردنی یەک دانە مریشک من هیچم لێ نای. بەلام بەم شێوە کۆتایی بە دڵەڕاوکێی قەرزاریم ئەدرێ. ئەو لە کوێ ئەزانێ من خواردوومە یان نەمخواردووە! ئەڵێم خواردم.

## (ماڵی دەرویش)

دەروێش خەریکی نووسینە، غوڵام لە دەرگا ئەدا.

دەروێش: وەرە ژوورێ.

غولام: ئیزن گەورەم.

دەروێش: وەرە.

دێتە ژوورێ.

دەروێش: ها! چ خەبەر؟

غولام: وەلا چی بڵێم گەورەم! ئەمەسە و ئەمەسە، هەتا ئەبەد ئەمەسە.

دەروێش: کورە نەڵێی، شتی وا چۆن ئەبێ؟

غوڵام: چی بڵێم گەورەم.

دەروێش: (دوای نەختێ فکر) یانی چی لێ کردووە؟

غـوڵام: وەڵا نازانـم، بـەڵام قاوەخانەکـەی لای دەسـتیان رووخانـدووە و خەریکـن بـە شـێوەیەکی رازاوە سـازی ئەکـەن. پێموایـە داویەتـی بـەو قاوەخانــە!

دەروێش: عەجەب نەگبەتێکە ئەو کابرا!

غوڵام: ئەفەرمووی چی بکەین؟

دەروێـش: هیـچ یەکـێ تریشـی بـۆ ئەنێـرم، بزانـم نەجاتـی ئەبـێ یـان هـەر ئەوەسـە و ئەوەسـە و هەتـا ئەبـەد هـەر ئەوەسـە!

غوڵام تەعزیمێ ئەکا و ئەچێتە نێو فکرەوە.

## (رۆژێکی دیکە)

غـوڵام بـە مریشـکێکی دیکـەوە کەوتووەتـە رێ بـۆ دوکانـی جـۆڵا. جـۆڵا لـە دوورەوە دەنگـی دێـت و شـعرەکەی ئەڵـێ. غـوڵام سـەری ئەلەقێنـێ و ئەچێتـە نێـو دوکانەکـەوە.

غوڵام: ماندوو نەبی کاکی جۆڵا!

جـۆڵا: خـۆت مانـدوو نەبـی بەقوربانـت بـم، دیسـانەوە کەوتیتـە زەحمەتــەوە بـۆم؟

غـوڵام: زەحمــەت نییــە مامــە گیــان، ئەگــەر ئەمجــارە ئــەم مریشــکە بخـۆی، بـۆ مـن ئەبـی بـە رەحمــەت!

جـۆڵا: ئـەی بـۆ مەگـەر ئـەو دوو جارەکـەی تـر نەمخـواردووە؟ یارەبـی

ماڵــی مــام دەروێــش ئاوابــێ، خــودا لــە تــۆش رازی بــێ کــە زەحمەتــی زۆرت بــۆم کێشــاوە.

غـولام: مـن ئـاگادار نیـم، ئـەو دوو جـارە خواردووتـە یـان نـە، بـەڵام مـام دەروێـش وتـی پێـت بڵێـم، تـا ئـەم مریشـکە نەخـۆی ئاواتەکانـت بـەدی نایـێ، فەرمـووی پێـت بڵێـم، ئەمجـارە بیخـۆی.

جۆلا: حەتم بەسەرچاو، یارەبی ماڵی ئاوابێ!

غولام: نۆشی گیانت.

غولام مریشکەکە ئەنێتە سەر سەکۆکەوە.

جۆلا: دەستت خۆش بێ.

غولام: نۆشی گیانت بێ، خواحافیز.

جۆلا: خودات لەگەڵ.

غــولام لــە دوکان ئەچێتــە دەر، جــۆلا چەنــد جــار بــۆن ئەکێشــێ و ئەچێتــە نێــو فکــرەوە!

جـۆلا: جـا ئەگـەر خواردنـی مریشـک باعیسـی مـوراد حاسـڵکردن بایـا، حاجـی موعتەسـەمی کەتیرافـرۆش ئێسـتا شـاهی مەملەکـەت بـوو، چـون بیسـتوومە هەمـوو رۆژێ یـەک دانـە مریشـک ئەخـوات! نـە بەختـی مـن جـۆرێ بەسـراوە کـە بـە خواردنـی سـەد هـەزار مریشـک و کەڵەبـاب و بۆقلەمـووت ناکرێتـەوە! خواردنـێ ئەبـێ بـە چـی، ئـەوە هـات و خـواردم. دوو سـێ سـاعەتێ تامەکـەی لـە دەممدایـە و دوای ئەبـێ بیبـەم بـۆ مەبالـی مزگـەوت بیـدەم بـەدەم ئـاوەوە! ئەمەیـش چاکـە لەباتـی قـەرز بدەمـەوە بـە کەریـم بەقـاڵ، باکـو ئەویـش هیچـی لـە لام نەمێنـێ و ئەوەنـدە چـەپ و راسـت بانگـم لـێ نـەکا و لەنێـو خەڵـکا لـە گـۆم نەبـا!

ئـەرێ ئەمەیشـە ئەبـەم بـۆ کەریـم و ئەڵێـم خـواردم. دەروێـش خـۆ عیلمـی غەیبـی نییـە!

لـە پاچـاڵ دێتـە دەر، مریشـکەکە هەڵدەگـرێ و لـە دوکان ئەچێتـە دەرەو.

## (حەو رۆژ دواتر)

دەروێـش و غـوڵام پێکـەوە دێـن بـۆ نێـو تیمچـە، دەنگـی جـۆڵا لـە دوورەوە دێـت.

دەروێـش رائەوێسـتێ و گوێـی بـۆ شـل ئـەکا و بەحەیرەتـەوە لا بـۆ غـوڵام بـە دەورووبـەرا ئەکاتـەوە، غـوڵام سـەری ئەلەقێنـێ و چـاو بـە دەورووبـەرا ئەخشـێنێ.

غـوڵام: ئەوەتـە گـەورەم تەماشـای ئـەو دوکانـە وێرانکـراوە بکـە. حـەوت رۆژ لەمەوپێـش ئـەوە دوکانێکـی بەقاڵـی بـوو! تەماشـا مەسـاڵح (کەرەسـتە)ی جۆراوجـۆری بـۆ رژانـدووە و چاکسـازی ئەکـەن، هـەر وەکـوو کەبابـی و چایخانەکـە!

دەروێش: بڕۆین.

هەردوو پێکەوە ئەچنە دوکان جۆڵاوە.

جۆڵا: سەلامون عەلەیکم مامە دەروێش، ئەی یاڕەبی بەخێر بێی!

دەروێش: وەعەلەیکەسەلام مام جۆڵا، باشی شوکر؟

جـۆڵا: بەسـایەی سـەری جەنابتـەوە باشـم، زۆر بـاش، فەرمـوون دانیشـن.

دەروێش و غوڵام دادەنیشن.

جـۆلا: ڕەبـی بەخێـر بێـن، ئەوەتـا دوو بەیانـی کاری ئـەم جاجمـە تـەواوە، دوای ئـەوە بەرماڵەکـەی ئێـوە دەسـت پـێ ئەکـەم.

دەروێـش: زۆر مەمنـوون، پێـم بڵـێ بزانـم لـەو مریشـکانە وا بۆتـم نـارد، خواردتـت یـان نـە؟

جۆلا: بەڵێ وەڵا، زۆر بەتام بوو، دەستت خۆش بێ.

دەورێـش: ئـەی بـۆ هێشـتا هـەژار و دامـاوی؟ ئـەی بـۆ هێشـتا ئـەو دروشـمە تێکـرارەو ئەکـەی؟ ئـەی بـۆ هێشـتا هیـچ مورادێکـت حاسـڵ نەبـووە؟

جـۆلا: وەڵاهـی چـی بڵێـم قوربـان، مـن نەمدیـوە و نەمبیسـتووە کەسـێ بـە خواردنـی مریشـک خۆشبەخت بـێ و بـە ئـاوات و مـورادی بـگات، مـن هەرسـێکم خـوارد، بـەڵام هیچـم نـەدی!

دەروێـش: چاکـە، ئـەی بـۆ لـە خۆتـت نەپرسـی، چـۆن مـورادی کەبابچـی و چایچـی و بەقاڵـی هاوسـێت حاسـڵ بـوو؟ ئـەرێ کاکـی خـۆم دەیـان جـار بـە تەئکیـد پێتـم وت و سفارشـم نـارد کـە بیخـۆی، بـەڵام بـە قسـەمت نەکـرد. ئەوەڵیەکـەت دا بـە کابـرای مریشـکپەزی هاوسـێت، دووەم دانـەت دا بـە کابـرای قاوەچـی، سـێیەم دانـەت دا بـە کابـرای بەقـاڵ. بـۆ ئـەوان بـوو بـە خێـر و هـەر وا کـە ئەبینـی دوکانەکانیـان رووخانـد و تازەیـان کـردەوە و هەمـوو مورادێکیـان حاسـڵ بـوو، لـە بەرەکەتـی وجـوودی تـۆ و ئـەو مریشـکانە. بـەڵام خـۆت هەتاهەتایـە ئەمەسـە و ئەمەسـە، هەتـا ئەبـەد ئەمەسـە، چـون بـۆ ئـەم و ئـەو خێـری و بـۆ خـۆت شـەڕ! بەرماڵیشـم نـاوێ.

( هەڵئەستێ) خوداحافیز.

دەروێـش و غـوڵام ئەچنـە دەرەوە. جـۆلا حەیـران و بێدەنـگ بـە

شـۆنیانا چـاو ئەبـڕێ لـە دەرگای دوکانەکـە.

جۆلاّ: (بۆ خۆی) ئەی دڵی غافڵ!

# شوکرانەی پێچەوانە

پێرسوناژ:

- کفر ئەحمەد
- حەمەخان
- نۆکەرەکەی حەمەخان

چەند جۆر تەعام لەسەر سفرەیەکی رەنگین بۆ حەمەخان دانراوە، بە قیزوبێزەوە تماشایان ئەکا و لە هەرکام نەختێ ئەنێتە دەمی و لە هەمووی ئیراد ئەگرێ! نۆکەری هەژار لەدەم دەرگاوە پڕ لە ترس و خۆف وەستاوە!

حەمەخان: ئەمە چییە؟!

نۆکەر: گۆشتی سوورەوکراوی کەوە قوربان!

حەمەخان: ئەی ئەمە چ ژەحرمارێکە؟!

نۆکەر: ئەوە سینەی بوقلەموونە کە بۆتان ئاوکوڵ کراوە!

حەمەخان: درۆم نەکردبێ ئەم یەکە ئەبێ ئاشی شلە حەیی حەیی بێ!

نۆکەر: ئەوە خۆراکی دڵ و جەرگی بوقلەکەیە، ئەوەکەی تر کەبابی گۆشتی بەرخە، ئەمە لەملاوە قیمەی گوێرەکە و باینجانە و مابەقیی پلاو و ئاش و تورشیات و ئەو چتانەیە کە خۆتان حەزی لێ ئەکەن!

حەمەخان: حەزم لێ ئەکرد، بەڵام نە بۆ هەموو رۆژ و هەموو شەوێ! لایانبە هەموویان، ئا بەم شیوە فڕێ بەنە دەرەوا!

یەک کاسە لە غەزاکان لە پەنجەرەی ماڵەکەیەو فڕێ ئەدا بۆ ناو حەوش ماڵ کفر ئەحمەد.

کفر ئەحمەد ڕائەچڵەکێ...

کفـر ئەحمـەد لەسـەر بانجێـڵ دانشـتووە نانەڕەقـە ئەکاتـە دەمـی و نەختـێ دۆ بـە شـۆنیا هەڵئەقوڕێنـێ!

نۆکـەر: دیسـان کەوتـە مـاڵ کفـر ئەحمـەد گـەورەم! ئیـدی ئێـوە زەحمەتـی فرکدانـی مەکێشـن، ئێمە خوەمـان فرکـی ئەدەیـن.

حەمەخـان: بـە ڕۆحیانەتـی بابـم قەسـەم جارێکـی دیکـە ئـەم جـۆرە تەعامانـە لەسـەر سفرەمەوە ببینـم بە خۆتانـەوە فرکی ئەدەمـە مـاڵ کفـر ئەحمـەد! جا بـۆ خۆت ئەزانی کاتـێ بڵێـم بـە ڕۆحیانەتـی بابـم چـی؟

کفـر ئەحمـەد قورقێنەیەکـی زل بـەر ئـەدا و بـە دەنگـی بـەرز ئەڵـێ: خوایـە لـە نـان و تەعـام و نەعەماتـێ کـە پێمـت داوە، بەزیـاد بـێ و هـەزار جـار شـوکرت.

حەمەخان: چیم وت؟

نۆکەر: فەرمووت بە ڕۆحیانەتی بابم

(قورقێنەی دووەمی کفر ئەحمەد قسەی لێ ئەبڕێ!)

حەمەخـان: ئـەرێ هەر ئـەوە! بە خۆتانەوە حەوانچەی مـاڵ کفرئەحمەدتان ئەکەم.

کفـر ئەحمـەد نـان و دۆکـەی جـەم ئەکاتـەوە و لای ئەبـا و بەرانبـەر پەنجـەرەی مـاڵ حەمەخـان ڕائەوێسـتێ و بانگـی حەمەخـان ئـەکا.

کفر ئەحمەد: حەمەخان! حەمەخان! ئەهاو هاو هاو حەمەخان!

حەمەخان دێتە بەر پەنجەرەکەوە.

حەمەخان: ها بەڵێ؟

کفر ئەحمـەد: مانـدوو نەبـی؟! ببـوورە حەمەخـان هەموو خەڵکـی ئاوایی ئـاگاداری وەزع و حاڵـی مـن هـەن وا ئەزانن پیاوێکـی هـەژار و دامـاو

و فەقیـر وەكـوو مـن كـە تەنانەت جەژنەكانــی بـە نـان و دۆ ئەگـرێ و نـەورۆز بـە نەورۆز هێلكـە ئەخـوا و ئەوەنـدەی نییـە كـە بۆنـی تەعـام و خـورد و خۆراكـێ لـە حـەوش و ماڵـی بـەرزەوە بـێ! ئـەو نۆكەرە كەرانـەت هەمـوو رۆژێ جاروبـار یـەك كاسـە و جاروبـار سـێ تـا چـوار كاسـە تەعـام بـە بایـە و دەورییـەوە فڕێ ئـەدەن و ئەیشـكێن بەسـەر ماڵەكـەی منـدا! ئەمـە خـوا هەڵناگرێ، چـون هـەم خـوا غەزەبـم لـێ ئەگرێ و بە گوناحـی كفـری نیعمـەت نـاوم بـۆ جەحانـم ئەنووسـێ، هەم خەڵكەكـەم لـێ ئەبـن بـە دوژمـن!

حەمەخـان: باشـە باشـە، ئەڵێـم بێـن حەوشـەكەت بۆ تەمیـس كـەن و ئیـدی شـت فـڕێ نەدەنـە مـاڵ تـۆ! بـەڵام خەڵكـت بـۆ لـێ ئەبـن بـە دوژمـن؟!

كفر ئەحمەد: بە خۆتا مەڕوانە پیاوێكی گەورە و بەرچاوتێری حەمەخان، بەوەڵا چەڵەمـەی سـینگی مریشـكێ لە مـاڵ منـەوە بكەوێتـە دەرەو، ئـەم خەڵكـە بەرچاوتەنگـە چـاوم دەردێنـن و هەركـەس هەرچـێ لـە مـاڵ نەمابێ ئەنێتـە مـل مـن و هـەزار جـۆر قسـە و تۆمەتـی نـاڕەوام بۆ سـاز ئەكـەن! تـۆ خـۆت ئـەم خەڵكە ناناسـێ؟

حەمەخان: وایە بەڵام بە یەك شەرت؟

كفر ئەحمەد: چی بە یەك شەرت؟

حەمەخـان: بـەو شـەرتەی قورقێنەكانـت جەمـەوە نەكـەی هـەر كاتـێ نـاوی باوكـی مـن ئەبیسـی بـەری بەیتـەوە، منیـش بـە نۆكەرەكانـم ئەڵێـم، شـت فـڕێ نەدەنـە مـاڵ تـۆ!

كفـر ئەحمـەد: ئەگەرچـی لـە قەسـت كاری وام نەكـردووە و خۆی هاتووە، بـەڵام بـان چـاو ئیتـر قورقێنە بـێ قورقێنە!

حەمەخان: پرسیارێکی دیکەشم لێتە کە پێم خۆشە بەجوانی جوابم پێ بەیتەوە؟

کفر ئەحمەد: ئەویش بەسەرچاو، فەرموو بپرسە؟

حەمەخان: خۆت چاک ئەزانی، من هەموو رۆژێ دەیان جۆر تەعام و خورد و خۆراکم بۆ تەبخ ئەکرێ و دەیان جار بیستووتە من لەگەڵ نۆکەر و ئاشەوان و ژن و منداڵ چۆن کردەوە و رەئی و رەفتارێکم هەیە!

کفر ئەحمەد: وایە.

حەمەخان: تۆ تا ئێستا دیوتە یا خۆ بیستووتە من یەک جار، تەنیا بۆ یەک جار وەکوو تۆ لە کانگای دڵەوە شوکرانەبژێریی نیعمەت بکەم؟!

کفر ئەحمەد: نەوەڵا قەد نەمبیستووە!

حەمەخان: دە باشە کاکە پرسیاری من ئەمەیە: ئایا خواردنی رێزەوڵ و دۆ بە شۆنیا هەڵقوڕان، ئاوا شوکرانەبژێرییێکی بۆ واجبە؟!

کفر ئەحمەد: نە!

حەمەخان: ئەی چۆن تۆ بە هەموو ئاووتاوەوە ئەچیتە ژێری و بە دەنگی بەرز شوکرانەبژێریی نیعمەتی نان و دۆ ئەکەی؟!

کفر ئەحمەد: راستە حەمەخان وایە و هەموو جارێک لە دوای بەهانەگرتن و ئاش فرەدانەکەی تۆ ئەو شوکرانەبژێرییە بەجێ دێنم!

حەمەخان: بۆ؟

کفر ئەحمەد: عەڵبەت وا تێ مەگە حەمەخان! بۆ ئەوەی لەو کاتا خوا چاوی لە تۆوە کە بەو هەموو نیعمەتەوە کە پێتی عەنایەت

کردووە، چی دەکەی. گۆشە چاوێکێشی بە منەوە هەیە کە لەژێر پێی تۆدا خەریکی خواردنی نان و دۆم و ئەو شوکرانەی منە لە هەزار کفری نیعمەت و تان و تەشەر بۆی خراپترە، حەمەخان وا تێ مەگە ئەوە شوکرانەیە!

حەمەخان مات ئەوێ بە دەم ئەحمەدا و زەردەی کەنینێ، سەرلێوی نۆکەرەکەی ئەپۆشێ!

# سەگباب

پرسۆناژ:

- ڕەحمان
- خاوەن کار
- دوو کرێکاری دیکە
- قاوەچی و پیاوی چایی خۆر
- ژنی ڕەحمان
- حاجی ئیبرایم
- ژنی حاجی ئیبرایم

کابرای کرێکار خەریکی درەوکردنی گەنمە، خۆرەکە لە سەری ئەدا و بەرچاوی ڕەمل دەکا و داس دائەوەشێنێ و شاخەکان سەربڕ ئەکا یا جێ ئەهێڵێ.

خاوەن کارەکە لەژێر کەپرا خەریک ئاو خواردنەوە و قلیان کێشانە، کە چاوی بە ئیشی کابرا ئەکەوێ و بەتووڕەیی هەڵئەستێ.

دوو کەسی دیکەش خەریکی درەون.

خاوەن کار: (تووڕە) ئەوە چی ئەکەی سەگباب؟! مەگەر

نازانی دوایی ئەبێ کا لەو گەنمە جیا بکرێتەو؟!

دوو کرێکارەکەی دیکە، بۆ تماشا کەمەر راست ئەوێستن..

ببووره قوربان لە بەیانییەوە کۆمەوە بوومەتەو، خۆرەکە لە سەرم ئەدا.، گێجم، بەرچاوم لێڵە!

خاوەن کار: ئەی بۆ وەرگرتنی پارەکەی چۆن بەرچاوت لێڵ نییە؟! (روو لە دوو کرێکارەکەی دیکە) ئێوە بۆ وێستاون تماشای من ئەکەن؟ کارەکەتان بکەن ئیدی!

هەردوو بە تەعجیل مەشغووڵ ئەبنەوە.

کرێکارەکەش مەشغووڵ ئەبێت.

خاوەن کار: فێری کارکوژی و کات تۆپانن بوون، دەستی زۆرتان لە

بان سەرەوە نەبێ، خودای خۆتان بە حەق ناناسن!

کرێکار زیاتر گێج و بەرچاو لێڵ ئەبێ و دیسان سەرنجی خاوەن کار بەرەو لای خۆی رادەکێشێ.

خاوەن کار: مەگەر لەگەڵ تۆ نیم سەگباب؟ ساقەکان بۆ لە بنەوە لا لێ نادەی؟

کریکار: (رووی تێ ئەکا) ئەرێ سەگباب خۆتی قورمساق، من چەند جار بە تۆ جنێوم داوە وا تۆ چەپ و راست جنێو ئەدەی؟! ها ئەویش داسەکەت بینێ سەر قەبری بابت، من ئەم نانە ناخۆم!

خاوەن کار: باشە برۆ گۆرت گوم کە، منیش ئەم نانە بە تۆ نادەم، باکوو خۆت و ژن و منداڵت لەبرسا بمرن.

کرێکار: حەقی ئەم نیوە رۆژەم بۆ نەنێری شەو لە دیوارماڵەکەتەوە دێمە بان و ئەوخنکێنم! تۆش کە نەبێ نان بە ژن و منداڵی من بگەیەنی، خودا هەیە ناهێڵێ لەبرسان بمرن.

بەتوندی رێ ئەکەوێ.

کرێکاری هەوەڵ: راوێستە رەحمان.

کرێکار دووەم: بێ، مەرۆ رەحمان.

خاوەن کار: ئێوە کارتان نەبێ و ئیشی خۆتان بکەن! تا ئێستا هەزار جنێوم دابێ کەس جورئەتی ئەوەی نەبووە بە من جنێو بدا! ئێسە کە جنێوی داوە ئەبێ عاقیبەتی کاری خۆی ببینێ و لەبرسا بمرێ!

دوو کریکاری دیکە مەشغووڵی کاری خۆیان ئەبن.

## (ماڵی کرێکار)

ژنـی کابـرای کرێـکار جامـێ ئـاو بـەرەو مێردەکـەی کـە لـە گۆشـەی حەوشـەی ماڵەکەیـدا سـەری ناوەتـە سـەر زرانـی، ئەبـا.

ژن: ئـازاری ڕۆحـی خـۆت مـەدە، هـا نەختـێ ناخـی خـۆت فێنکـەو کـە، خـوا گەورەیـە!

ڕەحمـان: ئـەم سـەگبابە زۆر دەمپیـس و ناحەقـە! ئاخـر کاتـێ سـەرم گێـج ئەخـوا و بەرچـاوی خـۆم نابینـم، ئەبـێ چـی بکـەم کـە ئـەوم لـێ ڕازی بـێ؟! مـن خەریکـی ئیشـی خـۆم بـووم! دوو سـاعەتە بەرچـاوی خـۆم نابینـم، زاتـی ئـەوەم نەبـوو داسـەکە دانێـم و نەختـێ ئـاو بەسـەری خۆمـا بکـەم، وەک شـمر بـان سـەر لـە کرێـکاری هـەژار ئەگرێ و ئەشـێ هەمـوو شـتێ هـەر ئـەوە بـێ کـە ئـەو ئەڵـێ!

ژن: باشە ئاوەکەت بخوەوە.

ڕەحمان خەریکی ئاو خواردنەوە ئەبێ.

ژن: تـۆ نەمەشـیا جنێـوت بـە ئـەو بـدای، قـەی چـی ئـەکا ئەگـەر ئـاوی ڕووبـار بـە دەم سـەگ پیـس بـێ، جنێوەکـەی ئەویـش کارییـە، بـەڵام مـردوو لـە جێگەیـەکا نییـە بـە جنێـوی ئـەم و ئـەو دەربـێ! دوای ئەمـە دەمپیـس چـەی پـێ ئەکـەی؟! ئـەو ئێسـتا ئەگـەر ئیـش نەکـەی، بـەوەڵا نـان بەیانیمـان نییـە!

ڕەحمـان: نەختـێ پاشـەنازم لـە لای مامـەم هەیـە، ئەمڕۆ لێـی ئەسـێنم بۆتانـی دائەنێـم، دوو سـێ مانـگ لـەم وێرانـە دوور ئەکەومـەوە، بەڵکـوو لـەم چەنـد ئاوایـی دەوروبـەرەدا کارێ بـۆ خـۆم پەیـدا کـەم.

ژن: کام ئاوایی؟

ڕەحمان: چووزانم ئاواییەک کاری تێدابێ.

ژن: باشە بڕۆ بەڵام لەبەر خاتری خوا و ئەو منداڵانەمان تووڕەیی بە تووڕەیی جواو مەدەوە! خاوەن کار هەر خراپەی دێ بە زوباندا و هەر جنێو ئەدا، خۆت بە لە کەری و وەبزانە نەتبیستووە.

ڕەحمان: باشە ژنەکە باشە، هەر وای لێ ئەکەم.

ژن جامەکەی لە دەست ئەسێنێ و ئەیبا.

ڕەحمان: (ئەچێتە فیکرەوە) وا ناکرێ، ئەبێ چون ژن و منداڵدارم، جۆرێ ئیش بکەم کە جنێو و قسەی نامەربووت کارم تێ نەکا و جواوجێ نەکەم. کاتێ ڕۆژگار ئەمەیە کە یەکێ هەیەتی و جنێو ئەفرۆشێ و یەکێ نیەتی و ناچارە بۆ هەر نامەربووتێ سەر دانەوێنێ، چاکە ئەمن کفتەی بەرکوڵ نەبم و سەر دانەوێنم، وا ناکرێ...

شەوی ئاوایی پیشان ئەدرێ و ڕۆژ ئاوا ئەبێ و هەتاو لەپشت کێوان دێتە دەر. ڕەحمان بێڵ و قوڵنگە و داسێکی بۆ خۆی هەڵگرتووە و لە ئاوایی دێتە دەر و لەسەر ڕێگەی ڕێ ئەکەوێ.

ڕەحمان لە سێ پلاندا بە (ریزاڵو) ئەپێوێ و ئەچێتە ئاواییەکەوە. ڕوو لە هەر جێگایەک ئەکا و حەواڵی کار ئەپرسێ، ڕووی بۆ هەڵدەخەن و جوابی ڕەدی پێ ئەدەنەوە.

ڕەحمان دیسان لەنێو ڕێگایە و ئەچێ.

ئەگاتە بەر چایخانەیەک لە نزیک ئاواییەکەوە، ئەچێت بەرەو چەند کەس لە بەر چایخانەکە دانیشتوون و خەریکی چای خواردنەوە و گەپ لێدانن.

ڕەحمان: ماندوو نەبن کاکە.

قاوەچی: خۆت ماندووو نەبی، فەرموو دانیشە.

رەحمان: زۆر سوپاس کاکم پرسیارێکم هەبوو؟

یەکێ لە چایخۆرەکان تماشای ئەکا.

قاوەچی: لە خزمەتدام بپرسە؟

رەحمان: شوێنی کار ئەگەرێم.

قاوەچی: کاری چی؟

رەحمان: خەڵکی لادێ یان کرێکارە یان شوانی ئاژەڵە، یان زارع و درەوگەرە، هەر کارێ بێ من ئەیکەم.

قاوەچی: بەوەڵا شک نابەم برا.

رەحمان: زۆر مەمنوون.

خەریک ئەبێ بچێ کابرای چایخۆر بانگی ئەکا.

چایخۆر: راوێستە کاکە، راوێستە.

رەحمان ئەوێستێ.

چایخۆر: بەرانبەری خۆت تماشا کە.

رەحمان لا ئەکاتەو بۆ نێو ئاوایی.

چایخۆر: ئەو ئاخرین ماڵە ئەبینی حەسارەکەی بە چلوچێو پەرچین کراوە؟

رەحمان: بەڵێ وەڵا.

چایخۆر: ئەوە ماڵی پیاوێکە بە نێو حاجی ئیبرایم. زەویوزارێکی زۆری هەیە و تا دوو سێ رۆژ لەمەوبەر بە شوێن کرێکارەوە بوو، ئیدی نازانم گرتوویە یان نە. بچۆ ئەوێ بپرسە حاجی ئیبرایم،

پیاوێکـی زۆر چـاک و باخودایـە، ئیشـی هەبـێ لێـت درێغـی نـاکا، بـڕۆ خـودا رۆزیـت بـدا.

ڕەحمـان: زۆر مەمنـوون سوپاسـی یارمەتیـت ئەکـەم، بڵێـم حاجـی ئیبرایـم؟

چایخۆر: ئەرێ ئەرێ بڕۆ.

ڕەحمان رێ ئەکەوێ.

## (حەوشی ماڵی حاجی)

حاجـی لەژێـر کەپـری حەسـاری ماڵەکەیـەوە دانیشـتووە و خەریکـی قلیـان کێشـانە و ژنەکـەی چـای بـۆ دادەکا.

ژن: بـۆ داوا لـە خەڵکـی ئاوایـی ناکـەی چـوار پەنـج رۆژێ بـۆت گـەل کـەن گەنمەکـەت بۆ خەرمانکـەن؟ خـۆت ئەزانـی یـەک بـاران بـا بـە ملیـا هەمـوو ژەنـگ لـێ ئـەدا و ئەفەوتـێ!

حاجـی: تـۆ ئەزانـی داوای یارمەتـی و گەلـم لـە خەڵکـی ئاوایـی نەکردووە؟ هەمـوو قەولـی ردوای هەڵگرتنـی کار و ئیشـی خـۆی کردووە، کرێـکاری بـاش نییـە مەجبـوورم سـەبر کـەم تـا ئیـش و کاری خۆیـان دوایـی بێنـن و بـۆ مـن گـەل کـەن.

ڕەحمان ئەگاتە بەردەرگای حەسارەکە.

ڕەحمان: ببوورن قوربان ماڵی حاجی ئیبرایم ئەمەیە؟

حاجی: بەڵێ حاجی ئیبرایم خۆمم.

ڕەحمـان: شـوێنی کار ئەگەڕێـم گـەورەم، ناوونیشـانی جەنابتیـان پـێ دام.

حاجی: وەرە پێشەوە بزانم.

ڕەحمان: بەڵێ سەرچاو.

ئەچێتە بەرەو.

حاجی: درەوگەری؟

ڕەحمان: لە هەڵگرتنەوە تا چانخستن و جواڵکردن، نۆکەریت ئەکەم.

حاجی: بەڵێ وایە لە پیاوێکی ئازا و لێهاتوو ئەچی، بەڵام ئەگەر تەنیا بی بۆ پیاوی تەنیا ناکرێ، ڕەفیقت نییە؟

ڕەحمان: نەوەڵا تەنیام.

حاجی: بەداخەوە!

ڕەحمان: بۆ بەداخەوە گەورەم؟ مەزرەعەکەت کامەیە؟

حاجی: ئەوەتە لە بەرانبەری خۆتەوە ئەیبینی؟

ڕەحمان لا لە مەزرەعەکەی ئەکاتەوە.

ڕەحمان: ئیلا ماشاڵا، زۆرە!

حاجی: عەرزم کردی بۆ یەک کەس ناکرێ.

ڕەحمان: داس کەرەمتووتان هەیە؟

حاجی: بەڵێ وەڵا زۆرە!

ڕەحمان: دە باشە بەقوربان بیدە بە دەسمەوە، ئەمڕۆ تاکو ئێوارە بۆت کار ئەکەم، ئەگەر بەقەد سێ نەفەر باقەم بۆت دانەخست، ئەوجا بڵێ بەداخەوە!

حاجی: جا ئەگەر تۆ بتوانی کاری وا بۆ من بکەی، منیش هەر

بەقــەد ســێ کــەس حەقــت ئەدەمــێ، بــە قەوڵــی ئەعــراب هــازا گــووی و هــازا مەیــدان! ئــەوە داس کەرەمتــوو، ئــەوە قورچکــەی فێنکــی ســەر، ئــەوە ئــاو و تونــگ و هەرچییەکــت کــە پێویســتە، جــا بــڕۆ بزانــم چــی دەکــەی!

ڕەحمان باروبنەی خۆی دادەنێ، کەرەمتوو هەڵدەگرێ.

ڕەحمان: خودایا بە ئۆمێدی خۆت.

روو ئــەکا لــە مەزرەعــە و بــە شــێوەیەکی ڕێکوپێــک قورچکــە ئەکاتــە ســەر و داس رادەوەشــێنێ و لــە بەرچــاوی حەســرەتباری حاجییــەوە بەجوانــی ئیــش دەکا و باقــە بــە شــوێن خۆیــا دادەنــێ.

شێوەکاری ڕەحمان بۆ نیشاندانی عبووری زەمان چەند جار (ریزالو) ئەکرێ.

حاجــی: بەخۆشــحاڵییەوە تماشــای ئــەکا و ژنەکــەی ســەری تەئیــدی بــۆ دائەتەکێنــێ.

خــۆر ئەنیشــێ و ڕەحمــان کەرەمتووەکــەی بــە باقەیەکــەوە پــاڵ ئەداتــەوە و ئەچــێ بــەرەو لای حاجــی.

حاجــی: مەرحەبــا کــوڕم، ئافەریــن زۆر باشــە هــەر لــە ئێســتاوە ئەیســپێرم بــە خــۆت بــە حەقــی ســێ نەفــەرەوە بــەو شــەرتە یــەک مانــگ بۆمــی هەڵگــری.

ڕەحمان: نۆکەریت ئەکەم، خوا هەزار جار شوکرت!

حاجی: جا ئێستا بڵێ بزانم نێوت چییە؟

ڕەحمان: نێوم؟

حاجی: ئەرێ لە ماڵا چی بانگت دەکەن.

ڕەحمان: (لە دڵی خۆیدا) چی بڵێم خوایە؟

حاجی: ئەوەک ناوت نەبێ؟!

ڕەحمان: هەمە گەورەم.

حاجی: دە بڵێ ماتڵی چیت؟!

ڕەحمان: نیوم، نێوم، نێوم سەگبابە قوربان.

حاجی: چی؟!

ڕەحمان: سەگباب.

حاجی و ژنەکەی تماشای یەک ئەکەن.

حاجی: ئەمە ئیدی چۆن ناوێکە؟! (ڕوو لە ژن) تۆ شتی وات بیستووە؟! کێ ئەم ناوەی پێتەوە ناوە؟

ڕەحمان: چی بڵێم قوربان، بابم ئەم ناوەی پێم داوە!

حاجی: سەیرە بەخودا!

ژن: تۆ ئیش و کاری ئەوت پێویستە یان نێو؟ تۆ کارت چییە سەگبابە با سەگباب بێ!

حاجی: باشە سەگباب گیان لە بەیانییەوە ئیشی خۆت بکە و هەرچییەکت پێویستە بە من بڵێ، تا بۆتی جێبەجێ کەم.

ڕەخمان: زۆر مەمنوون.

حاجی: دە باشە سەگباب گیان تا بتبەم ژووری ژیان و خەو و ئیسراحەتی شەوانت پێ نیشان دەم، وەرە.

ئەکەونە ڕێ ئەچن.

ژنەکە ئەچێتە نێو فکرەوە!

ژن: (بۆ خۆی) سەگباب حەیف نەبێ ئاوا پیاوێ سەگباب بێ؟!
لایلاهە ئیڵەلا، ئەمەشمان بیست!

## (ڕۆژێکی تر)

ڕەحمان بە سورعەت خەریکی کارە، ژنی حاجی سفرە لەژێر کەپرەکەدا دادەخا.

ژن: وا نیوەڕۆە حاجی، بانگی ئەو پیاوە بکە بێت نیوەڕوانەکەی بخوا.

حاجی دێتە دەرەوەی کەپرەکە دەست ئەنێتە لای دەمی (بناگوێ) و بانگی ڕەحمان ئەکا

حاجی: ئاهاو هاو هاو سەگباب؟

ڕەحمان لای بۆ ئەکاتەوە.

حاجی: وەرە کوڕم، وەرە نیوەڕوانەکەت بخۆ.

ڕەحمان: سەرچاو ئێستا دێم.

ڕەحمان تەعام دەخوات

ڕەحمان ئیش دەکات

حاجی: ئاهای سەگباب کۆتایی بێنە شەوە!

ڕەحمان نووستووە.

ڕەحمان ئیش دەکا.

ڕەحمان نان دەخوات.

حاجی: چۆنی سەگباب؟ (ریزاڵو) باشی سەگباب؟ ریزالو ماندوو

نەبــی ســەگباب: ئــا هــاو هــاو ســەگباب؟ (ریزاڵــو) ســەگباب (ریزاڵــو) ســەگباب ســەگباب.

## (یەك مانگ دوا تر)

خەرمان هەڵەوە دراوە و زەوین کامڵ درەو کراوە و پاکەوە بووە.

## (شەو.. ژووری ڕەحمان)

ڕەحمان نووستووە.

## (دوا ڕۆژ)

ڕەحمــان لەژێــر کەپــرەکا ڕوو بــە حاجــی دانیشــتووە و حاجــی پــارەی بــۆ ئەژمێــرێ.

حاجــی: هــا کــوڕم کاری باشــت بــۆم کــردووە، حەقــی خۆتــە پــارەی باشــیش وەربگــری! حەقــی یــەک مانگــی یــەک کرێــکار ڕۆژێ ســێ ســکەیە ئەبــێ بــە نــەوەد ســکە. ســێ کرێــکار ئەبــێ بــە دووســەدوحەفتا ســکە. نۆشــی گیانــت ســەگباب گیــان، ئەوەتــە بیژمێــرەوە.

ڕەحمــان: دەســتت خــۆش بێــت تــۆ ژماردووتــە تــەواوە خــودا زیاتــرت پــێ بــدا ماڵــت ئاوابێ.

حاجی: ئیدی خۆ هیچ حیسابێکمان نییە؟

ڕەحمان: نەوەڵا دەستت خۆش بێ.

حاجی: باشە کوڕم نۆشی گیانی خۆت و ژن و منداڵت بێ.

ڕەحمان: مەمنوونم قوربان جا ئێستا ئەگەر ئیزنم بدەی ڕێگاکەم دوورە و ئەبێ بڕۆم.

حاجی: سەر هەردوو چاوانم.

ڕەحمان هەڵئەستێ و ڕێ ئەکەوێ.

ڕەحمان: خوداحافیز

حاجی: خودات لەگەڵ.

ئەختێ دوور ئەبێتەوە.

حاجی: هەی سەگباب، هەی سەگباب؟

ڕەحمان لا ئەکاتەوە.

ڕەحمان: لەگەڵ منت بوو؟

حاجی: ئەی سەگبابی ترمان جگا لە تۆ هەیە؟!

ڕەحمان ببووورە گەورەم ڕێز و حورمەتم ئەگەر بۆت نەبوای، ئەگەر پیاوەتی و ئینسانیەت و شەرەفم پێتەوە نەدیای ئەمگوت سەگباب خۆتی و ئەمن ڕەحمانم ناوە!

حاجی ئەی چۆن بە منت وت سەگبابت ناوە؟

ڕەحمان: بەرلەوەی بە خزمەتی تۆ بگەم و پێم بسەلمێنی پیاوەتی و ئینسانیەت نەمردووە، بۆ چەند سەگباب ئیشم کردووە، ئەوەندە لەو سەگبابانە جنێوم پێ درا و بەشەڕ هاتم بوو بە زیانی ژیانم، بە خۆمم وت لەمەولا خۆم بە ناو سەگباب بناسێنم تا ئەگەر ڕۆژێ جنێوم پێ درا، پێم ناخۆش نەبێ و توورە نەبم. جەنابتم نەناسی و خۆمم بە سەگباب بە تۆ ناساند و تا ئیشم بۆ تۆ هەبوو و تۆ ئەربابی من بووی، سەگباب بووم، بەڵام ئێستا کە ئیشم تەواو بووە

و پیاوی خۆمم، ئیدی سەگباب نیم و ڕەحمانم.

حاجی: تێگەیشتم کوڕم تۆ کرێکارێکی بەنرخی، بانگم کردی ئەمەت پێ بڵێم کە هەر کات بە نیازی کار بووی، من بۆ تۆ کارم هەیە، درەوی هەموو ساڵێکیشم تاکوو ماوم بۆ تۆ دادەنێم، بڕۆ قەدەمت سەرچاو. ئەمەیش بزانە ڕەحمان گیان تا کەسێ خۆی سەگباب نەبێ باوکی ئەم و ئەو بە سەگ نازانێ.

ڕەحمان: ڕۆژ باش مامە حاجی، دیسانەوە دێمەوە بۆ لات، خوداحافیز.

حاجی: سەرچاو.

ڕەحمان ئەڕوا.

حاجی ڕۆیشتنی تماشا ئەکا.

# زێڕ و بەرد

پرسۆناژ:

- پیاوی تاجر، مامناوەندی.
- دز، جەوان و بێ تەجرەبە
- ئەسپی تاجر

لوكەیشن- بەڕ و بیابانی وشک و لەم یەزرەع و کەویری.

کابرای تاجر بە سواری ئەسپ لەنێو دەشتێکی لەم یەزرەعدا، لە حەرەکەتدایە.

وردە وردە ئەسپەکەی لەکار ئەکەوێ و ئەکەوێتە لەرزین.

دێتە خوارێ و چارواکە بە شوێن خۆیدا ئەکێشێ.

هەتاو زۆر تیژ و سووزان ئەنوێنێ.

ئەسپەکە ئەوێستێ و ئیدی مل نادا.

تاجر دەست ئەکوتێ و مەشکە ئاوی تەرکی چارواکە دێنێتە خوارێ.

کابرایەکی دز کە لەپشت تەپۆڵکەیەکەوە خۆی شاردووەتەوە، بە سەروچاوی پۆشراو، تماشای تاجرەکە ئەکا.

تاجر مەشکە خاڵییەکە ئەجوێنێ.

ئاوی تێدا نییە.

شۆڕی ئەکاتەو سەر دەستی خۆی، نەختێ ئاو ئەچێتە نێو مشتی. ئاوەکە ئەنێتە بەر پووزەی چارواکەوە.

چارواکە پووزە ئەکوتێ بەسەر دەست کابرا و ئاوەکە ئەڕژێنێ.

پیاوی تاجر دەستە تەڕەکەی بە لێوی خۆیا ئەساوێ.

تاجـر: زۆر شـەرمەزاری تـۆم حەیـوان، ئـاگام لـەم ڕێگـە نەبـوو کـە ئەوەنـدە وشـک و بـێ ئـاوە، خۆیشم زۆر تینـووم، دەوام بێنـە بەڵکـوو بـە ئـاو و ئاوەدانییـەک بگەیـن.

چاروا بە شوێن خۆیا ئەکێشێ...

دوای چەند قەدەم چارواکە ئەکەوێ و لە هۆشی خۆی ئەچێ.

سـەندووقچەی پـڕ لـە زێـڕ و زیـو لـە تەرکـی ئەسـپەکە ئەکەوێتـە خـوارێ و لـە فشـاری لەشـی ئەسـپەکە دەرکەکـەی ئەکرێتـەوە و تـەڵا و جەواهێراتەکـە ئەکەوێتـە سـەر عـەرز.

تاجـر زۆر بـە تەعجیـل کۆیـان ئەکاتـەوە و گۆشـەی چـاوی بـە سـەر کێوەکـە ئەکـەوێ و بەدەقیـق تماشـا ئـەکا.

کابرای دز سەری خۆی ئەدزێتەوە.

تاجـر سـەندووقچەکە هەڵدەگرێ و دەس بـە شمشـێرەکەیەوە ئەگـرێ و ئەسـپەکە بەجـێ ئەهێڵـێ و ئەچـێ.

دزەکـە خەنجـەر بەدەسـت لـە حاڵێکدا کـە مەشـکی پـڕ لـە ئـاوی لـە کۆڵدایـە بـە جۆرێکـی ون و شـاراوە بـە دیوێکـی تـری تەپۆڵکەکـەوە، بـە شـوێنیدا ئەچـێ.

کابـرای تاجـر مانـدوو ئەبـێ و لـە سـێبەری لاشـەبەردێکدا، ئەوێسـێ ماندوویـی دەرئـەکا.

دزەکەش لە سەرەو ڕائەوێستێ و ئەچێتە نێو خەیاڵەوە.

دز: (لەگـەڵ خـۆی) پێموابـێ ئـەو سـەندووقچەی ژێـر باڵییـە پـڕ بـێ لـە زێـڕ و زیـو! بـەڵام شمشـێرێکی زۆر قـورس و درێـژی پێیـە کـە لـە بەرانبەریدا لـەم خەنجـەرە کورتـەی مـن کارێـک بـەر نایـێ! چاکـە ئەوەنـدە

چـاوی لـێ دانەخـەم تاکـو لـە تینوویيـدا هـەلاک دەبـێ، ئەوجـا ئەچمـە پێشـەوە و ئەبـم بـە سـاحیبی سـەندووقچەکەی! وا چاکتـرە.

دزەکـە بەئەسـپایی سـەری لەپشـت تەپۆڵکەکـەوە بـەرز ئەکاتــەوە و ئەبینـێ کابـرای تاجـر رێ کەوتــووە و خەریکـە دوور ئەکەوێتــەو!

دز: نەخێر لەوە ناچێ لە حاڵی مردندا بێ!

کابرای تاجر بەدەم رێگە رۆینەوە، لەگەڵ خۆی قسە دەکا.

تاجـر: چاکـە نەزانـێ لـە زەعـف و زەبوونیـدام! بێتـو بزانـێ وەکـوو داڵـە کەرخـۆرە تاکـوو نەمـرم دەسـتم لەسـەر هەڵناگـرێ!

حاڵەتی سەرگێجەی هەیە.

زۆر تینــووم (تماشــای ســەندووقەکەی ئــەکا) ئەمەیــە وتوویانــە: بــەرد بەرانبــەر زەڕ، زەڕ بەرانبــەر بــەرد!

ئـا لـەم وەخـت و کاتـەدا ئـەم هەمـوو زێـڕ و زیـوە، بایەخـی یـەک قـوم ئـاوی نییـە!

ڕائەچڵەکێ و ئەچێتە نێو فکرەوە.

بـەرد بەرانبـەر زەڕ، زەڕ بەرانبـەر بـەرد! ئـەرێ بیروڕایەکـی خـراپ نییـە، چاکـە لەگـەڵ ئـەم کابـرا بکەومـە موعاملـەوە! بـەم شـێوە هـەم خـۆم لەبەین ئەچـم هـەم تـەواو سـەرمایەی ژیانـم لەدەسـت ئـەدەم! بـەڵام ئەگەر ئـاوا دەربـێ کـە بیـرم لـێ کردووەتـەو، هیـچ کامـی لەدەسـت نـادەم.

ئـەم کابرایـە هەرکـەس هـەس پیلوێکـی تـازەکار و ترسـەنۆکە، ئەگینـا تا ئێسـتا سـەد جار هێرشـی هێنابووە سـەرم.

بەرەو دوا لا ئەکاتەوە.

کابرای دز سەری خۆی ئەدزێتەوە.

تاجر: ئەهای ئەزانم های بە شوێنمەوە و لەسەر ئەو تەپۆڵکەی! خۆتم لێ مەشارەوە من پیاوێکی زۆر دارام کە ئەتوانم ئەگەر تۆ یارمەتیم بدەی، یارمەتییەکی چاکت بدەم.

هەستە هەستە چاوم لێتە!

کابرای دز سەر بەرز ئەکاتەوە.

مەرحەبا، ئافەرین لەوە ئەچێ پیاوێکی عاقڵ و دانابی!

دز: پێوستت بە چە جۆر یارمەتییەکە؟

تاجر: وەرە نزیکەو تا پێت بڵێم.

دز: نا هەر مەبەستێکت هەیە هەر لەوێوە بڵێ.

تاجر: لە من خۆفت نەبێ من ئیستا بە دۆستایەتی زۆر موحتاجترم تاکوو دوژمەنی و شەڕ و بەربەرەکانێ! وەرە پێشەوە مەترسە.

کابرای دز هەڵئەستێ و بە ئیحتیاتێکی زۆرەوە نەختێک دێتە پێشەوە و ئەوێستێ.

دز: لەمە زیاتر نایێمە بەرەوە.

تاجر: باشە کاکە باشە، من پیاوێکی تاجری زۆر دەوڵەمەندم. بەشی فرەی ژیانم لە سەیروسەفەردا تێپەڕیوە و چەندین جار وەکوو ئەمڕۆ کەوتوومەتە مەترسیی بێ ئاو و نانییەوە و جار وا بووە کە حەوت شەو و ڕۆژ بە لچی تینوو و زکی برسییەوە ڕێگام تەی کردووە و خۆمم بە مەقسەد گەیاندووە! چاکە بۆت ڕوون کەمەوە کە برسیەتی و تینوویی من لە پا دەرناهێنێ و هەموو ڕەنجێکت بە شوێن مندا، بەهەدەر ئەڕوا، بەڵام (ئەگەر) یارمەتیم بدەی، بەبێ دەردی سەر ئەبی بە ساحیبی گەنجێکی پڕبایەخ و حەڵاڵ.

دز: پێم بڵێ بزانم چیت ئەوێ؟

تاجر: (لەگەڵ خۆی) چاکە ئەوەڵ شتێکی تری لێ بپرسم. (بە دەنگی بەرز) هەر ئاوا بەم ڕێگەدا بڕۆم، کەی بە ئەوەڵین ئاوایی ئەگەم؟

دز: (لەگەڵ خۆی) ئەگەرچی کەمتر لە نیوەڕۆژێکی دیکە ئەوەڵین بە ئاوایی ئەگات. بەڵام چون لەو ئاواییەدا شوێنی من ئەگەڕێن کە بمگرن و لە بەینم بەرن، چاکە درۆی لەگەڵ بکەم و من لەو بپرسم، چەند ڕۆژە کە لە ئەوەڵین ئاوایی پشت سەری جیا بووەتەو.

دز: (بە دەنگی بەرز) تۆ ئەگەر هەر وا ڕێ کەوی، سێ ڕۆژی دیکە بە ئەوەڵین ئاوایی ئەگەی، ئیستە تۆ بە من بڵێ، کەی ئەوەڵین ئاواییت بەجێ هێشتووە؟

تاجر: (لەگەڵ خۆی) ئەگەر ڕاستی پێ بڵێم لە ڕێگەکە ئەترسێ. ئەگەرچی سێ ڕۆژ لەمەوپێش بەجێم هێشتووە، بەڵام چاکە شتێکی ڕێک بڵێم. (دەنگی بەرز) یەک نیوە ڕۆژ لەمەوپێش ئەوەڵین ئاواییم بەجێ هێشتووە.

دز: (لەگەڵ خۆی) چاکە زۆر دوور نییە. (دەنگی بەرز) ئەمەیە هەموو ئیش و کارت؟

تاجر: نە بەقوربان من ناتوانم بەرەو دوا بگەڕێمەوە، مەگەر ئەوەی موعامەلەیەک لە کاردا نەبێ و ناچار بە گەڕانەوە بم.

دز: موعامەلەی چی؟

تاجر: موعامەلە لەگەڵ تۆ.

دز: چ موعامەلەیێ؟

تاجر: ئەم سەندووقچەی منە ئەبینی؟ پڕیە لە زێڕ و زیو، من چوار ئەوەندەی ترم لە ماڵی خۆمدا هەیە. لەدەستدانی ئەو سامانە، من ناخاتە فەقر و فەلاکەتەوە. بەڵام پیاوێکی وەک تۆ بە هەموو جێگایەک ئەگەیەنێ و تا ئاخری عومر ئەتوانی لە ناز و نیعمەتدا بژیت، وا نییە؟

دز: بڵێ بزانم چیت ئەوێ؟

تاجر: من ئەم سەندووقچە زێڕ و زیوە ئەدەم بە تۆ، تۆش ئەو مەشکە ئاوەی کۆڵت بە من دە!

دز: یەک سەندووقچە زێڕ و زیو لەباتی مەشکێ ئاو؟!

تاجر: پێتم وت، من پیاوێکی زۆر دارام و بە لەدەستدانی ئەم سەندووقچە گەدا نابم.

دز: (بەخۆشحاڵییەوە) باشە باشە ئەیدەم (مەشکەکەی لە کۆڵ ئەکاتەوە) بەڵام.. بەڵام ئەی خۆم چی بکەم؟

تاجر: بەشی نیوە ڕۆژێکت پێ ئەدەم لە تینوویا نەمری، بەڵام بەو جۆرەی تۆ وتت، من تا ئەوەڵین ئاوایی سێ ڕۆژ ئەبێ بەڕێوە بم..

دزەکە ئەچێتە ناو فکرەوە.

تاجر: وایش ناکەی وەرە تا پێکەوە بڕۆین و لە هەردووکیا شەریک بین.

دز: نانا من بەرەو ئەو ئاواییە نایێمەوە، من ئەبێ بەملا بڕۆم.

تاجر: هەروا کە من ئەبێ بەرەو ئەملا بڕۆم.

دز: باشە باشە بەشی نیوە ڕۆژێ ئاوم پێ بدە و سەندووقچەکەت پێ ئەدەم.

تاجر: مەشکەکە بۆ من دانێ تا منیش سەندووقچەکە بۆ تۆ دانێم،

جا تۆ سەندووقچەکە ببە و لەوێدا چارواکەم سەقەت بووە، مەشکێ خاڵی داکەوتووە، هەڵی گرە و بیهێنە تا بەشی نیوە ڕۆژێکت پێ دەم.

دز: باشە ها ئەمە مەشکەکەی من (دای دەنێ).

تاجر: (سەندووقچەکەی دادەنێ) ئەمەش هی من.

هەردوو بە شێوەیەکی دایرەیی (بازنەیی) بەرەو مەشک و سندووقچەکە ئەڕۆن و هەردوو پێکەوە هەڵی دەگرن.

پیاوی تاجر بە تەعجیل دەم ئەنێ لە مەشکەکە.

کابرای دز دەرکی سەندووقچەکە ئەکاتەوە، چاوی بە زێڕ و زیوەکە ئەکەوێ و شادمانە بەرەو مەحەلی ئەسپەکە دەردەچێ و لە نزیک ئەسپەکەوە چاو بە شوێنی مەشکەکا ئەگێڕێ.

تاجر دەم لە مەشکەکە لائەبا.

تاجر: ئۆخەی! بەوەڵا لە ئاوا کاتێکدا لە هەر زێڕ و زیو و جەواهیراتێ بەقیمەتتری! (ئەچێتە نێو فکرەوە) هێ! نەختێ عەقڵت بایێ ئاوا معامەلەیەکت نەدەکرد، دزی بە دزاتی تەماعکار! تۆ نە تەنیا هیچت بە دەس نەهێناوە، بەڵکوو بەم معامەلەوە هەموو شتێکت لەدەست دا، تەنانەت گیانت.

کابرای دز مەشکەکە ئەدۆزێتەوە و هەڵی دەگرێ.

تاجر بەتوندی خۆی ئەخاتە پشت بەردێکەوە و خۆی ئەشارێتەوە.

دزەکە بەرەو جێگاکەی ئەو ئەکەوێتە ڕێ.

دوای چەند هەنگاو ڕائەوێستێ و ئەچێتە ناو فکرەوە.

دز: ئەی داد و بێ داد ئێستە حەسابی تینوویی شکاوە و قوەتی حەسابی گرتووە و ئیمکانی هەیە لە کردەوەی خۆی پەشیمانەوە بووبێ

و بەو شمشێرە درێژ و تیژەی هێرش کاتە سەرم و سەندووقچەکەم لێ بسێنێتەوە! یەک نیوە رۆژ هیچ نییە. ئەتوانم بەبێ ئاو دەوام بێنم بەتایبەت کە بەرەو شەو دەچین و شەو رێگا فێنکە و پێویست بە ئاو نابێ! چاکترین کار ئەوەیە رێ کەوم و بڕۆم.

کابرای دز ئەکەوێتە رێ و ئەچێ.

تاجر: (سەر لەپشت بەردەکە دەردێنێ و تماشای دوورەوەکەوتنی دزەکە ئەکات) هن! ڕاستە کە وتوویانە، عەقڵ ئەگەر نەبێ گیان لە عەزابدایە!

سەری لە حەماقەتی دزەکە ئەلەقێنێ.

دزەکە بە سورعەت دوورەوە ئەبێ و جارجار لایەک لە پشت سەر ئەکاتەوە.

هەتاو ئێوارە ئەکا و هەوا تاریک ئەبێ.

کابرای دز باوەشی کردووە بە سەندووقچەکەدا و هەنە هەن تاریکیی شەو ئەپێوێ.

لە چەند (پلان) عبوور دەکا.

کابرای تاجر مەشکە ئاوەکەی ناوەتە ژێر سەری و لەسەر تاشەبەردێکی گەورە نووستوە.

هەتاو لە شەرقەوە هەڵدێ.

ڕۆشنایی ڕۆژ هەردوو بەرد دادەگرێ.

کابرای دز خەسە و ماندوو رێ ئەپێوی و مەشکە خاڵییەکە بە دەمی

خۆیا ئەساوێ. هەتاو زۆر تیژە و تیشکی بەسەر عەرزا خستووە، کابرای دز رێ ئەپێوێ و بەرچاوی رمڵ دەکا و سەری گێج ئەبێ و هەموو شتێ بە دەوری سەریدا خول ئەخواتەوە.

تاجر زۆر بەئاسایی رێ ئەپێوێ و جاروبار نەختێ ئاو بە دەموچاوی خۆیدا ئەپژێنێ.

دزەکە خەریکە لە پێ بکەوێ.

نەختێ تماشای سەندووقچەکەی ژێر باڵی ئەکا و چاو بە دەوروبەردا ئەگەرێنێ.

دز: ئەو کابرا بە منی وت: یەک نیوە رۆژ رێگایە! ئەلعان زیاتر لە یەک شەو و رۆژ رێم بڕیوە! ئەی لە کوێیە ئەم ئاواییە؟!

نەختێ تر ئەچێتە پێشەوە.

دنیا روو بە تاریکانە.

تماشای دەشتی بەرانبەری خۆی دەکا، دەیان ئێسکی وشکی حەیوانات کە لە تینوویا مردوون، لەسەر عەرز پەڕاکەندەیە!

گێج ئەبێت و ئەکەوێ.

سەندووقچەکە لە دەستی دائەکەوێ.

خۆی بەسەر عەرزەکەدا ڕائەکێشێ و سەندووقچەکە ئەکێشێتە ژێر سینگی خۆی.

شەوە

کابرای تاجر لەژێر نووری مانگەشەوا ڕێگا ئەپێوێ و پێش ئەچێ.

هەتاو لەژێر عەرزی مەشرقەوە دێتە بان.

تاجر ڕێگە ئەپێوێ.

دوای چەند (پلان) ڕێپێوان، ئەگەیێ بە مەحەلی کەوتنی دزەکە و ئێسکە وشکەکان.

لە دوورەوە ئەوێستێ و چاو لە جەسەدی کەوتووی دزەکە ئەبڕێ.

تاجر: هن! زەڕ بەرانبەر بەرد، بەرد بەرانبەر زەڕ! پیاوی عاقڵ ئەبێ بزانێ لە ئاوا حاڵێکدا بەرد و زەڕ بە یەک قیمەتن! حەیاتی خۆی و سەرچاوەکەی حەیاتی خۆی لەگەڵ بەرددا موعامەلە ناکا!

ئەچێتە پێشەوە..

سەندووقچەکە لەژێر سینگی دزەکە دەردێنێ.

تاجر: زۆر مەمنوونی تەماعکاری و کەللەی بێ عەقڵی تۆم کە بوون بە هۆی نەجاتی گیانم. من لەگەڵ تۆ درۆم کرد، ئەم سەندووقچەیە هەموو سەروەتی منە، بەڵام بێ ئاو وەکوو هیچ وابوو. من درۆم لەگەڵ تۆدا کرد کە دوای نیوە ڕۆژێ بە ئاوایی ئەگەی، شەووڕۆژێکی دیکە ئەبێ ڕێ بپێوی تا پێی بگەی!

هەڵئەستێ بڕوات چاوی بە جووڵانەوەی دەستی دزەکە ئەکەوێ.

تاجر: وا دیارە نەختە گیانێکت تیا مابێ! چون باعیسی ئازارم نەبووی، منیش بە مەرگی تۆ ڕازی نابم.

مەشکە خاڵییەکە لە کۆڵ کابرا دەردێنێ، لە مەشکە ئاوەکەی خۆی بۆ خاڵی دەکا.

مەشـکەکە ئەنێتـە لای دەس دزەکـەوە و خـۆی ئـارام ئـەڕوا و لـە لەشـی کابـرا کـە تـەلاش دەکا مەشـکە ئاوەکـە بگـرێ و بـەرەو خـۆی بیکێشـێ، دوور ئەکەوێتـەوە.

**ئەوەی خوا بە تۆی داوە**

کابـرا دێتــە بــەر پەنجــەرەی ماڵەکــەی و تماشــای حەوشــی ماڵــی ئــا تەقیــی هاوسـێی ماڵــی خــۆی ئــەکا.

ئـا تەقـی لەنێـو حەوشـدا خەریـک شـۆردن و ئاوکێشـان و وشـکەوکردن کەرەکەیـە، کابـرا هەناسـەیەک هەڵدەکێشـێ و لەژێـر لچـەوە:

کابرا: خوزگەم بە خۆی!

ژن کابرا دێتە پشت سەر کابرا وا تماشای حەوشی هاوسێ ئەکا.

ژن: خوزگەم بە کێ؟ بە ئا تەقی؟

کابـرا: کـورە نـەوەڵا! هـەزار خوزگـەم بـە کەرەکەی! هـەزار خوزگە منیش کـەر بایـام، بـەڵام بـەو شـەرتەی کـەری ئـا تەقـی بایـام! تـۆ تماشـای ئـەم شـارە بکـە، لـە هەرکـەس فکـر ئەکەیتـەوە، فکـر بکـەوە بزانـە ئـەو کەسـە خۆشـبەختە یـا کەرەکـەی ئـا تەقـی؟ کۆپانـی تـازە، گیزوگولەنگی نـوێ! هەوسـار و ملوانکـەی جـوان و رەنگیـن! هەمـوو رۆژێ بـاری کـەم و یاریـی زۆر! تەویلـەی پـاک و چـاک! تــەواو ئــەم شــارە بگــەڕە مــاڵ بــە مــاڵ، بزانـە کێیـە کـە لـەو کـەرە خۆشـبەختتر و راحەتتـر بـێ؟ تەنانـەت ئاغـە و ئاغـەوات! کێیـە؟! قەیدی نییـە ئینسـان کـەر بـێ! تەنیـا بـەو شـەرت و مەرجـەی کـەری ئـا تەقـی بـێ!

ژنەکە تماشایەک کابرا ئەکا و ئەچێ.

کابرا غەرقی تماشای کەرەکە و ئا تەقی ئەبێ.

ئا تەقی خەریک وشکەوکردن کەرەکە و شانەلێدانی یاڵی کەرەکەیە.

ژنەکــە ســفرەیەکی جــوان بــۆ شــووەکەی ئەڕازێنێتــەوە و لــە هەمــوو جـۆرێ خوردوخـوراک دادەنـێ و تەنانـەت دەوروبـەری سـفرەکە بـە گـوڵ و گیـا ئەڕازێنێتـەوە و خـۆی بـە حـەوت رەنـگ ئارایـش ئـەکا عەتـر و گـوڵاو لـە خـۆی ئـەدا و تـێ بـە لای سـفرەکەوە دادەنیشـێ و بانگـی شـووەکەی ئـەکا.

شووەکەی هەر خەریک تماشای حەوشی ماڵی ئا تەقییە.

ژن: وەرە پیاوەکە، وەرە نانەکەت بخۆ!

کابـرا: (بـێ ئـەوەی لا بکاتـەوە) تـۆ بمهێڵـە بـا بەدڵـی خـۆم تماشـا بکـەم ژنەکـە!

ژن: باشــە خــۆ لــە دەس دەرناچــێ ئــەوە کاری هەمــوو رۆژێکــی ئــا تەقییـە! بەیانـی، دووبەیانـی، سـێ بەیانـی، هەتـا هەتایە، ئـەو بەرجەوەندە هـەر ئەوەیـە و هەیـە! وەرە نانەکـەت بخـۆ!

کابرا قەد گوێ نادا و تەنانەت لا ناکاتەوە.

ژن: ئا تۆ لایەکیش بەرەو ئەملا بکەوە!

کابـرا: تـۆ خـوا بمهێڵـە بـا تـا تەواوبـوون تماشـای کـەم لـەزەت بـەرم لـەو هەمـوو خۆشبەختییە!

ژن: ئـا تـۆ گۆشـەچاوێکیش تماشـای پشـت سـەر خـۆت بکـە پیاوەکـە! بـەوەڵا، بـەوەڵا، بـەوەڵا! ئـەوەی بـۆ تـۆ ئەمـڕۆ هاتـووە بـۆ کەرەکـەی ئـا تەقیـش نەهاتـووە! ئـا تـۆ لایـەک بکـەوە!

کابـرا: بەئارامـی لا ئەکاتـەوە و لـە دیتنـی سـفرە و خوانـە جوانەکـەی

پشت سەری خۆی دووچاری حەیرەت ئەبێ!

ژن: (بە پێکەنینەوە) جا ئێستا بە من بڵێ، بزانم تۆ خۆشبەختی یان کەرەکەی ئا تەقی؟!

# شەوی قاتڵ

پرسۆناژ:

- ئەحمەد، جەوانی ٣٠ ساڵە
- رەمەزان، مامناوەندی شاگردی حوجرە
- حاجی کەماڵ، پیر و نەخۆش
- نایب حەسەن، کاربەدەستی حکوومەت، قاچاخ
- حاجی ساڵح، (حاجی حەمەکەریم) پیر
- سابیر، جەوان و لات
- نەعیم، جەوان و لات
- رەفیق، جەوان و لات
- کوڕی حاجی ساڵح ٢٥ ساڵ
- شامرا، پیاوی حکوومەت، رەقەڵە
- چوار پیاوی تری حکوومەت

## (نێو ماڵ)

حاجـی لەنــاو جێیــە و زۆر نەخۆشــە، رەمــەزان دەســتی ناوەتــە نــاو دەســتی لــە لایــەو دانیشــتووە.

حاجـی: چـاک گـوێ بـۆ قسـەکانم راگـرە رەمـەزان، منداڵێکـی حـەوت هەشـت ســاڵان بــووی کــە دایکــت هێناتییــەوە بــەر دەرگای حوجــرە و دەستی تـۆی نایـە نێـو دەسـتم. خـۆت چـاک دەزانـی، تـۆ بـۆ مـن قـەد شـاگرد نەبـووی و وەکـوو کـوڕی خـۆم بەخێوتـم کـرد و دوای چەنـد سـاڵ کـە چەمـی و خەمـی کار فێـر بـووی، کلیـل و فەراشـەی حوجـرەم دایـە دەسـت خۆتـەوە و ئەوەنـدەش لێـت رازیـم کـە لـە خـودا ئەپاڕێمـەوە لێـت رازی بـێ.

کاتــێ کــە تــۆ بــۆ مــن کــوڕ و ئــەولادی، کــوڕ و کچەکانیشــم بــۆت ئەبــن بــە خوشــک و بــرا.

رەمەزان: بەڵـێ وەڵا وایە.

حاجـی: کەوابـوو دوای مەرگـی مـن، هــەم هـۆش ئــەو دوو خوشــکانەت بـێ، هـەم هـۆش ئەحمـەد. زۆر بـە دەسـتیەوە ناڕەحەتـم، زۆر بـە رەفتـار و کـردار ئـازاری داوم، بـەڵام چـی بکـەم جگەرگۆشـەیە و ناتوانـم دڵـی لـێ بگەنـم و ناچـارم پێـت بڵێـم وەکـوو برایەکـی خـاس لەژێـر چاوەدێریتـا بێـت و نەهێڵـی بـە رەفیـق بـازی و هــەرزەکاری سـەرمایەی ژیانـی خـۆی

و ئــەو دوو خوشــکەی لەنێــو بــەرێ، بەشــی تــۆم جیــا کردووەتــەو، زەحمەتــی زۆرت بــۆ کێشاوم، پــارەم داوەتــە دەس حاجــی ســاڵح لــە دوای مەرگــم پێتــی بدات، لــە حــەق خۆتــم بــۆت کــۆ کردووەتــەو، بــەڵام باکــوو ئەحمــەد نەزانــێ.

رەمــەزان: خــودا تۆمــان بــۆ خــۆش کا، مــن هیچــی تــرم نــاوێ. ئــەوەی نیــازی هەموومانــە ئەوەیــە کــە ســایەت تــا ماویــن لــە ســەرمان بــێ!

حاجــی: شــتێ وا نابــێ کــورم، هەمــوو ئەبــێ رۆژێ بڕۆیــن، نەوبەتــی منیــش گەیشــتووە. دوای مــن هۆشــت نەبــێ، ئەحمــەد زەحەماتــی ٥٠ ســاڵەم بــە ٥٠ رۆژ لەبەیــن ئەبــا.

رەمــەزان: تــا ئــەو جێگــە لــە دەس مــن بــێ لــە یارمەتیدانــی کۆتایــی ناکــەم، ئەبــم بــە بــرای هاوپشــتی و دەســتی لــێ هەڵناگــرم.

حاجی: خەیاڵم راحەت بوو کورم، خەیاڵم راحەت بوو.

لەم کاتەدا یەکێ بەتوندی دەرگای حەوش ئەکوتێ.

حاجــی: ئەوەتــە! بــە دەرگا کوتانەکەیــا دیــارە دیســانەوە ژەحــری مــاری خــواردووە و مەســتە!

رەمەزان: بڕۆم بیکەمەوە.

حاجی: نە نە خوشکەکانی بۆی ئەکەنەو.

دەنگی کوتانی دەرگاکە هەر زیاتر ئەبێ.

دەنگی کچ: کێیە ئەوە؟

دەنگی ئەحمەد: ئەوە کەری یەک ساعەتە لە دەرگا ئەدەم؟!بیکەوە!

کچ: تەنیای؟

ئەحمەد: ئەرێ تەنیام کەسم لەگەڵ نییە، بیکەوە.

سەروسەدای کردنەوەی دەرگا دەردێ، دەنگی قیژەی کچ بەرزەوە ئەبێ.

کچ: (هەراسان) راوەستن راوەستن، سەرم رووتە.

ئەحمەد: دە باشە بڕۆ، ئەمانیش هەروەکوو بران بۆ تۆ نەفام! (مەستانە) وەرن وەرن وەرنە ماڵەوە!

دەنگی پێکەنین چەند کەس کە دێنە ماڵەوە، دەردێ.

حاجی: گوێت لێیە رەمەزان؟! تماشای بێشەرەفیی ئەو کوڕی منە ئەکەی؟

رەمەزان: لەوە ئەچێ مەست بن! رۆژ و شەو! تەنیا مەگەر خودا بە دادی ئەو دوو کچە مەزڵوومە بگات بە دەس ئاوا برایەکەوە!

حاجی: های ماڵی وێرانم.

رەمەزان: قەیدی نییە حاجی عەزابی خۆتان مەدەن.

حاجی: چۆن قەیدی نییە؟ چەپ و راست پارەم لێ وەرئەگرێ و ئەیوا ئەیکا بە خەرجیی ئەو لاتولووتەی رەفیقی؟! چۆن قەیدی نییە کە ئەبێ بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی گیان بە دەس عزرائیلەوە بدەم؟ چۆن قەیدی نییە؟ چۆن قەیدی نییە چۆن؟

دەستی حاجی لەسەر دەستی رەمەزان شل ئەبێتەوە و ئەمرێ.

## (دوارۆژ، سەر قەبران)

سەر قەبری حاجی قەرەباڵغە، دەنگی قورعان خوێندنەوە و شیوەن و واوەیلای چنان تێکەڵ بووە. ئەحمەد لەگەڵ سێ رەفیقی لەسەر قەبر راوەستاون. رەمەزان رووبەڕووی وەستاوە و تماشای ئەحمەد

ئـەکا. یەکـێ لـە رەفیقەکانـی دەم ئەنێتـە لای گوێـی ئەحمـەدەوە و شـتێک بەئەسـپایی ئەڵـێ لەگـەڵ ئـەو دوو رەفیقـەی دیکـەی، لـە خەڵکەکـە جیـا ئەبنـەوە و ئـەڕۆن. ئەحمـەد لەژێـر نـەزەر و چاوەدێریـی رەمەزاندایـە.

ئەوەنـدەی پـێ ناچـێ، ئەحمـەد هێواشـی خـۆی ئەدزێتـەوە و بـە شـوێن رەفیقەکانیـدا خـۆی گـوم ئـەکا، رەمـەزان سـەرێ بـە حەیـرەت ئەلەقێنـێ.

نایب: ئەوە دیسان خۆی دزییەوە؟!

رەمـەزان: نایهێڵـن نایـب حەسـەن، نایهێڵـن! ئەمـڕۆ دواییـن رۆژی پرسـەی باوکییـە، سـێ رۆژە دێ وەکـوو مێردەزمـە خـۆی پیشـان ئـەدا و دوای کاتـێ مەحـو ئەبێتـەوە! ئەوەنـدە عەقڵـی نییـە ئـەم خەڵکـە ئەبـێ لـە کـێ سەرەخۆشـی بکـەن؟!

نایب: زۆر بێ عەقڵ و کەماڵە! خودا عاقیبەتی بەخەیر بکا!

## (دەشتودەر)

ئەحمـەد لەگـەڵ رەفیقانـی لـە کەنـار جۆبارێکـەوە خەریکـی خواردنـەوەی مەشـرووباتن. ئەحمـەد نەختـێ پەرێشـانە.

سـابیر: ئـەو رێـگا رێگایەکـە کـە ئەبـێ هەمـوو پێیـدا بچیـن ئەحمـەد. بـە غـەم و پـەژارە حـەل نابـێ ئـەوی چـووە ئیـدی نایەتـەوە! بەسـەلامەتیی ئـەم کاتـە و داهاتـووی خۆشـمان پیاڵەکـەت بێنـە سـەر و تاکـوو پێکـەوە بچیـن بـۆ ئـەوێ وا کـوو غەمـی تێـدا نییـە!

ئەحمـەد: بەسـەلامەتی. (پیاڵەکـە سـەر ئەکێشـێ، پیاڵەکـە هەڵئـەدا)

نەعیم: (بە چەپڵەڕێزان) بای دەدە و بای دەدە... گێلگێلەکەی با دەدە... بای مەدە و بای مەدە، دەشێویٚ دەسڕ و شەدە.

ئەحمەدیش لەگەڵ ئەوان ئەیکا بە چەپڵەکوتان و چەپڵەڕێزان و هاودەنگی.

## (یەك ساڵ دواتر، نێو حوجرە)

رەمەزان لەنێو حوجرەی نیوەخاڵی دانیشتووە و خەریک چورتکە داخستنی حەساباتە. سابیر دێتە نێو حوجرەوە.

سابیر: سەلامون عەلەیک مامە ڕەمەزان.

رەمەزان: عەلەیکەسەلام.

سابیر: کاکە ئەحمەد ناردمی وتی نەختیٚ پارەم بۆ بنێریٚ.

رەمەزان: پێی بڵیٚ، ئەمڕۆ هیچ کار و کاسبییەکمان نەبووە و هیچمان لە هەمارا نەماوە.

سابیر: حەی چۆن نەماوە؟!

رەمەزان: خۆی باش ئەزانیٚ بەقوربان، بڕۆ پێی بڵیٚ چەند کەسیش کە معاملاتی کۆنیان لەگەڵ حاجی بووە، بۆ وەرگرتنی پارە و پووڵی خۆیان هاتوونەتە حوجرە و من نازانم چی بکەم!

سابیر: باشە خۆشی دوور نییە ئەلعان ئەڵێم بێت. (سابیر بەخێرایی ئەڕوا)

رەمەزان: (لەژێر لچەو) کابرای لاشعووری بیٚ غیرەت، لەوەڕگەی موفتی دۆزیوەتەو، دەستەهەڵگیر نابیٚ!

## (دەشتودەر)

ئەحمـەد و رەفیقەکانـی لـە سـێبەری دارێـکا دانیشـتوون و خەریـک خواردنـەوە و چەپڵـە و گۆرانیـن. سـابیر خـۆی پێیـان ئەگەیەنـێ.

نەعیم: باوەڕ ئەکەی دەستت خاڵییە سابیر؟!

سابیر: چی بڵێم وەڵا رەمەزان پارەی پێ نەدام.

ئەحمەد: چۆن؟

سـابیر: ئەیگـوت هیچمـان بـۆ فرۆشـتن نەمـاوە و فرۆشـمان نەبـووە قەرزاریـش تەڵـەوی گرتوویـن!

ئەحمەد: هیچمان نەماوە؟! شتی وا چۆن ئەبێ؟!

سابیر: ئەوەتە بووە!

نەعیـم: کـورە درۆ ئـەکا، سـەد جـار وتـم ئـەم کابـرا لـە پیاوێکـی بـاش ناچـێ، بیکـە دەرەو خـۆم وەکـوو گـوڵ حوجرەکـەت بـۆ ئەگەڕێنـم و ناهێڵـم دووچـار موشـکیل بـێ، خـۆ ئەوەتـە بـە قـەوڵ ئینسـان ناکـەی؟

ئەحمـەد: ئـەوە ناکـرێ کاکـە رەمـەزان لەبـەر ئیعتیمـادی باوکـم بـوو هەتـا ئەمـڕۆ سـەد جـار ئەمـەی بـە مـن گـوت، هۆشـی رەمەزانـت بـێ و بـە قسـەی بکـە.

نەعیـم: باوکـت خـوا عەفـووی کا یـەک سـاڵە فەوتـی کـردووە و بـە یـەک سـاڵ هەمـوو شـتێکی داوەتـە بـا! هیچـی بـۆت نەهێشـتووە! بـڕۆ پێـی بڵـێ، مانـگا مـرد و بڕیـا دۆ! بیکـە دەرەو یاخـۆ ماڵـە بفرۆشـە بیکـە سـەرمایە، خـۆم ئەچمـە سـەر حوجرەکـە و بـە یـەک سـاڵ ئەتکەمـە ساحیب مـاڵ و باغـی گەورەتـر!

سـابیر: زۆر خـۆم خـۆم ئەکـەی، نەعیـم، عەڵبـەت مـن کۆچـم نەتوانـم

بچمە سەر حوجرەکەی!

نەعیم: ئێستا تۆ یان من فەرقمان چییە؟ هەدەف کۆمەک و یارمەتیدان بە ئازیزترین دۆست و رەفیق و هاوڕێمانە!

رەفیقی سێیەم: ئەی ئەوە ناوی من بۆ نابەن؟! بۆ کاکە من خراپ لەسەر حوجرە ئیش دەکەم؟! تاکوو ئێستا دەرفەتم بۆ نەبووە لەسەر حوجرە ئیش کەم، دەرفەتم بدرێ بزانە چۆن ئیش دەکەم!

ئەحمەد: چی بکەین ئێستا هیچمان نەماوە پیاڵەیەک تر بخۆم؟

نەعیم: نەوەڵا، ئەوەتە گۆزەکە خاڵییە.

ئەحمەد: دەی نابێ ئەمڕۆ یەکێ تر لە ئێوە خواردنەوە بکڕێ و بیدا پێمان.

هەموو تەواشای یەک ئەکەن.

ئەحمەد: دوو ساڵە نەمهێشتووە یەک لە ئێوە دەس بە گیرفانا بکا!

سابیر: خۆت باش دەزانی باوکم هێشتا باخ و موڵکەکەی نەفرۆشتووە، خۆ دەیان جار وتوومە بیفرۆشێ پارەم دەس کەوێ، هەتا هەتایە ناهێڵم دەس بە کیسەتا بکەی! خۆم هەمووی بۆت قەرەوی ئەکەمەوە!

رەفیق: خۆت چاک دەزانی من رووت و قووت و سوبحانەڵا لە بنەو عەرەب!

نەعیم: بمنە سەر حوجرەکەو ئەو کابرا بکە دەرەو، من دەردێنم تۆ خەرج بکە!

ئەحمەد: بەڵێ وایە! بەڵام ئێستا ئەم کاتە چی بکەین؟ من

سـەرم دێشـێ!

رەفیـق: بەقـەد خواردنـەوەی ئەمـڕۆ مـن ئەتوانـم جێبەجـێ کـەم، بـەڵام تەنیـا بەخاتـر خۆشەویسـتیی کاک ئەحمـەد. دانیشـن تـا بـڕۆم و زوو بێمـەوە!

## (دەم ئێوارە، ماڵ حاجی)

ئەحمـەد لەنێو حەسار دانیشـتووە و رەمـەزان پاڵـی داوە بـە دیـوارەوە و لەگـەڵ یـەک وتووێژیانـە!

ئەحمـەد: مەگـەر مـن لـەم یـەک سـاڵەدا چەنـد پـارەم لـە حوجـرە بـردووە کـە ئێسـتا هیچمـان نەمـاوە؟!

رەمـەزان: مـن نازانـم ئەبـێ خـۆت حەسابت بـە دەسـتەوە بـێ، چەنـدت بـردووە؟ ئەوەنـدەی لێـی دەزانـم ڕۆژ بـووە یـەک جـار ڕۆژ بـووە دوو جـار هاتـووی چنگـت کوتـاوە بەنێـو دەخڵـدا و پـڕ بـە مشـت پـارەت بـردووە! ئێمـە سـەرمایەیەکی وامـان نەبـووە، تەنانـەت دەورانـی حاجیـی خـودا بیامـرز (خوالێخۆشـبوو) لـەم شـار و لەوشـار شـتیان بۆمـان دەهەنـارد و ئەمانفرۆشـت و ئاخـری سـاڵ، حـەق و حەسـابی خۆمـان، مەتڵەبمـان ئـەدا و خەیرەکـەی ئەکرا بـە خەرجیـی مـاڵ و منـاڵ. بـەڵام ئەمسـاڵ بـە چنگـی خـۆت خەیـر و مایـەت لـە حوجـرە کێشـا دەرێ و خەرجیـی ئـەو رەفیقانـەت کـرد! ئـی! تـا خـاوەن قەرزیـش زۆری هێنـاوە چـەپ و راسـت دێتـە تەڵـەو مـن. مـن چیـم پـێ ئەکـرێ، بـەوەڵا، ئەگـەر لەبـەر دڵـی حاجـی و وەسـیەتی حاجـی نەبوایـا، هـەر ئـەو ڕۆژانـە مـن فەڕاشـەی حوجرەم ئـەدا بـە دەسـت خۆتـەوە! ئەمـە ڕێگـای کاروکاسـبی نییـە کاکـی مـن! پـارە ئەبـێ پـارە بێنـێ، ئەگینـا ئەگـەر بەقـەد کێـوێ پـارەت بـێ

و هەر لێی خەرج کەی ئاخری لەبن دێ!

ئەحمەد: حاجی ساڵح چی؟ باوکم پارەی نەداوەتە دەس ئەو؟

رەمەزان: تا ئەو جێگەیە من بزانم نە، بە تەنیا خەرجیی زەماوەند و جیهازی ئەو دوو خوشکەتی داوەتە دەس حاجی ساڵح و وەسیەتی کردووە حاجی ساڵح بۆ بەشوودانی ئەو دوو کچە وەکیلی ئەو بێ و خوازبێنیکەر ئەبێ مەوردی تەئیدی ئەو بێ.

ئەحمەد: نازانی چەندی داوەتە دەستی.

رەمەزان: نەوەڵا، هیچ.

ئەحمەد: هممم! شا ئەو بابە! لەباتی ئەوەی لە بیری مندا بێ، لە بیری کچەکانیا بووە!

رەمەزان: بۆ لە بیری تۆدا نەبووە؟ ئەوەی من بزانم زیاتر لە بیری تۆدا بوو و تۆش لە بیری ئەو سێ چوار رەفیقەت کە تەڵخیان لێ نەچێ! هەزار هەزار جار هاواری لێت کرد، وتی، رۆڵە ئەمانە رەفیقی کیسە و پارەن! ئەمانە لە تەنگانەدا فەریادرەسی تۆ نابن! بەڵام گوێت نەدا، ئێستا برۆ بزانە یەک دانە لەو رەفیقانەت کە دوو ساڵە خەریکی غارەتی تۆن، ئەتوانن دوو حەفتە بوژێنن؟ گوێت پێ نەدا! چی بکردایێ هەژار؟!

ئەحمەد: تۆ کارت بە رەفیقی منەوە نەبێ، مامە رەمەزان، لەباتی ئەم قسە و باسانە، موشتەرییەک پەیدا کە بۆ ئەم ماڵە و باخەکە، ئەیانفرۆشم و خۆم دەس بەکار ئەبم، ئەمە وا ناکرێ.

رەمەزان: بە کوێریان وت چی باشە؟ وتی، دوو چاو بینا. خوا ئەیکا خۆت دەس بەکار ئەبی و ئەکەویتە سەر رێگای راسە، باشە

سەر چاو هەرچی تۆ بڵێی وا ئەکەین، خوشکەکانت لە کوێن بۆ دیاریان نییە؟

ئەحمەد: نازانم کاتێ من ئەبینن ئەڵێی چاویان بە جن کەوتووە، هەڵدێن! پێم وایە چوونەتە ماڵ پوورم.

رەمەزان: ماڵ نایب حەسەن؟

ئەحمەد: بەڵێ، ماڵ نایب حەسەن، ئەویش ئەمبینێ سڵم لێ دەکا! ئەڵێی باوکیم کوشتووە! جواب سڵامەکەم بەزۆر ئەداتەوە.

رەمەزان: وایە کاکە گیان هەر لە پارەوە کە لەنێو پرسەکەی باوکت چەند جار خۆت دزییەوە، رقی لێت هەستا و چەند جار بە منی وت!

ئەحمەد: پرسە پرسەی باوکی من بووە تێیدا دانەنیشتووم، بەو چ رەبتێکی هەیە؟!

رەمەزان: وا نییە باوکم، ئەو شتانە رەسم و یاسای مرۆڤایەتییە و پێوەندیی بە هەموانەوەیە! ئەویش دڵنگەرانی ئەوەیە یەک رۆژێ کورەکەی لە تۆوە فێر بێ و بۆ جواودانەوە بە سەرخۆشی خەڵک نەیتە نێو پرسەکەی! لە چاوی نایب حەسەن تۆ بێحورمەتیت بە باوکی خۆت کردووە و نابێ کەس رێز و حورمەتی تۆ بگرێ.

ئەحمەد: هن! قسەی قۆڕ!

رەمەزان: ئێستا ئەڵێی چی بکەین کاکە گیان؟ من چی بکەم؟ دەرگای حوجرەکە بکەمەوە یان نە؟

ئەحمەد: ئەگەر مەیلت نەماوە ئیدی بۆ ئێمە ئیش بکەی، قەیدی نییە مامە رەمەزان، . فەراشەکەم پێ بدەوە، لە بەیانییەوە یا خۆم

ئەچمە سەر حوجرە، یان یەکێ لە رەفیقەکانم ئەنێمە بانی.

رەمەزان: ئەی بەسەرچاو، ئەمەش فەڕاشەی حوجرە، ئەمەش فەڕاشەی هەمار، بەڵام پێتی نادەم تا خۆت بی، هەموو شتێ تەحویلی خۆت بەم کە بەیانی لێتی نەدزن و بە حەسابی منی دانێن.

ئەحمەد: باشە بەیانی پێکەوە ئەچین و تەحویلیان ئەگرم.

تەقە لە دەروازەوە بەرزەو ئەبێ!

ئەحمەد: کێیە؟

رەمەزان: شایێت خوشکەکانت بن!

ئەحمەد: نە ئەوان وا لە دەرگا نادەن.

رەمەزان: رەفیقەکانت نین؟

ئەحمەد: نا ئەوانیش وا دەرگا ناکوتن.

رەمەزان: بچم بیکەمەوە؟

ئەحمەد هەڵئەستێ.

ئەحمەد: نە خۆم ئەڕۆم.

ئەچێ بەرەو دەروازەکە ئەیکاتەوە، کابرایەکی مامناوەندی لەبەر دەرگایە.

کابرا: ببوورە ئەمەیە ماڵی حاجی ڕەحمان؟

ئەحمەد: بەڵێ ئەمەیە.

کابرا: ببوورە واریسی حاجی ڕەحمان کێیە؟ ئەوم بۆ بانگ کە.

ئەحمەد: بۆچی؟

کابـرا: مـن و کورەکـەم، پەنـج شـەو و پەنـج ڕۆژ بەڕێـوە بوویـن تاکـو لـە شـارێکی دیکـەوە هاتوویـن بـۆ ئێـرە. زۆر بەزەحمـەت حوجرەکەمـان بـۆ دۆزرایـەوە، بـەڵام کابرایـەک لـەوێ بـوو هیچـی بەدەسـمانەوە نـەدا، بڵـێ واریسـی ئـەو مەرحوومـە کێیـە، باکـوو لەگـەڵ ئـەو قسـە بکـەم.

ئەحمەد: من کوڕی حاجیم، واریسی حاجی منم.

کابـرا: زۆر چاکـە. (دەسـت بـۆ ژێـر قەباکـەی ئەبـا و کاغـەزێ دەردێنـێ) ئێـزن بفەرمـوون بێمـە نێـو داڵانەکـە.

ئەحمـەد کەنـار ئەگـرێ و کابـرا دێتـە ماڵـەوە، تـا چـاوی بـە ڕەمـەزان ئەکـەوێ.

کابـرا: خۆیەتـی، ئـەم کابـرا لەسـەر حوجرەکـە بـوو، بـەڵام ناونیشـانی ئـەم ماڵـەی پـێ نـەدام!

ئەحمـەد: باشـە کاکـە ئێسـتا خـۆ دۆزیوتـەوە! بڵـێ بزانـم مەبەسـتت چییـە؟

ئەحمـەد: کاکـی خـۆم مـن دەوروبـەری دە سـاڵە لەگـەڵ باوکـی تـۆ موعامەلاتمـان هەیـە و تاجـرم. هەمـوو سـاڵێ شـتم بـۆ نـاردوون و سـاڵێ دوو جـار زۆر بـە سـەداقەت و پاکییـەوە، ئـەوەی فرۆشـتوویە پارەکـەی بـۆم نـاردووە، بـەڵام بـۆ دوو سـاڵ ئەچـێ بابـت پـارەی بـۆ نەنـاردووم و ئەحواڵـی نەپرسـیوم، ئەمـەش قەبـز (وەسـڵ)ی ئـەو ئەجناسـەیە کـە بابـت لێـی کڕیـوم و خۆشـی مـۆری کـردووە، سـەجعی مـۆری بابـت خـۆ ئەناسـی؟

ئەحمـەد: (دوای تماشـا) بەڵـێ وەڵا مـۆری باوکمـە، بـەڵام ئێمـە بەرشکسـت (مایەپـووچ) بوویـن و لـە حاڵـی حازردا هیچمـان بـۆ دانـەوە بـە تـۆ نییـە.

کابرا: جا مەگەر ئەبێ؟!

رەمەزان: بۆ نابێ کاکە؟! ها موویەک لەناو ئەم مشتە خاڵییە هەڵکەنە؟ خۆ منیش عەرزم کردی لە حاڵی حازردا هیچمان بۆ نەماوە!

کابرا: جا من ماڵ و سەرمایەی خۆم بکەم بە رزق و رۆزی بۆ خەڵک و بە قەرز بیدەم بە دەسیانەوە و دوای دوو ساڵ ئەو بڵێ هیچم بۆ نەماوە، منیش بڵێم باشە قەیدی نییە، ئیدی هیچ بەسەر هیچەوە نامێنێ و ئەبێ کاسەی گەدایی بە دەسەوە بگرم! هیچتان بۆ نەماوە؟ پەیدی چییە؟! خۆ حوجرەکە ماوە؟ خۆ ئەم خانووە هەیە! خۆ باخ و زەمینتان هەیە! ئەوەتە منیش مەدرەک (بەڵگە)م هەیە! دوو نەفەر ئەم هەموو رێگامانە نەکوتاوە، بێین و بە دەست خاڵی بڕۆینەوە، من لەم ماڵە ناچمە دەروە تا حەقی خۆم وەرنەگرم. ئێوە نەبن قانوون هەیە. ناوونیشانی ئەم ماڵمە داوەتە کوڕەکەم، ئەگەر دوای دوو ساعەت نەڕۆشتمەوە بۆ لای، بە پیاوی قانوون و حکوومەتەوە بێتە شوێنم.

ئەحمەد: ئەمە کە بەلای باوکمەوەیە، چەندە؟

کابرا: پەنج هەزار سکە کاکە گیان! ئەوەتە لێرە نووسراوە.

رەنگ لە ڕووی ئەحمەدەوە زەرد ئەبێ و ئەکوتێ بەسەر خۆیا.

ئەحمەد: پەنج هەزار سکە؟!

کابرا: بەڵێ.

ئەحمەد: وایە مامە رەمەزان؟

رەمەزان: وەڵا چی بڵێم، ئەوەی حاجی مۆری کردووە ئەڵێ وایە.

ئەحمەد: باشە کاکە! ئێستا بەم دەمودەستە چۆن باخ و ماڵ و موڵک بۆ من ئەبێ بە پارە کە قەرزی تۆی پێ بدەمەوە؟

کابرا: من چووزانم کاکی خۆم، من نە تەوانی ئەوەم هەیە تا فرۆشی ئەم شتانە بە دیارتانەوە دانیشم، نە ئەوەی دەستخاڵی بچمەوە! لە خزم و کەسوکار، لە هاوسێ و بەرهاوسێ، لە هاوەڵ و دۆست و رەفیق! لە هەر کەس ئەبێ و ئەکرێ، حەقی من وەربگرن بیدەن بە دەسمەوە، تەواو! من ئیدی کارێکم نییە.

رەمەزان: (ڕوو لە ئەحمەد) ئەڵێم ناکرێ لەگەڵ ئەو رەفیقانەت قسە بکەی؟ چەند بیستوومە، ئەڵێن، حازرن گیان خۆیان فەدای تۆ بکەن! کەمەکەی بەشکەم پانسەد سکەیێ بۆمان رێک خەن و بیدەین و پانسەدەکەی تر دەرفەتێکمان پێ بدا!

ئەحمەد: ئەوانیش هەر وەکوو خۆمان نەقدینەیان بۆ رێک ناکەوێ، مەگەر زەویوزار بفرۆشن!

رەمەزان: بەڕاستە؟ جا بەنیاز بی ئەیفرۆشن؟ ئەڵێم گوایێ ئەوی ئەوان زۆرتر لە ئەوەی خۆمان موشتەریی پەیدا کرد، حازرن بۆتی بفرۆشن؟

ئەحمەد: بەڵێ وەڵا، بۆ حازر نین؟!

رەمەزان: زۆر چاکە. (ڕوو لە کابرا) کاکە گیان بەم دەمودەستە هیچ کارێ بۆ ئێمە ناکرێ، یەک حەفتە فورجەمان پێ بدە، سەرچاو، دۆست و رەفیقی زۆرمان هەیە، ئەڵێن لەگەڵ ئێمە موڵک و ماڵی خۆیان بفرۆشن یان لە گرەوی دانێین کە پارەکەی ئێوە زووتر فەراهەم کەین و بیدەین بە دەستتەوە!

ئەحمەد: فورجەمان پێ ئەدەی؟

کابرا: بەداخەوە بۆم ناکرێ!

ئەحمەد: بۆ ئێمەش ناکرێ!

کابرا: مـن لـەم ماڵـە ناچمـە دەرێ تاکـوو پارەکـەم وەرنەگـرم. ئیـدی خۆتـان ئەزانـن.

ئەحمەد: ئەم ماڵە ژن و منداڵی تێدایە کاکە، خۆ کاروانسەرا نییە!

کابرا: من ئەیکەم بە کاروانسەرا.

ئەحمەد: تۆ بیجا (ناماقووڵی) ئەکەی! تۆ قسەی لابەلا ئەکەی!

کابـرا تـووڕە ئەبـێ و شـەپلاخەی لـە ئەحمـەد ئـەدا. ئەحمـەد کـە مەستە ئەچـێ بـە ناوقـەد کابـرا و لـە حەیـن شـەڕ و داوا کابـرا بـە پشـتا ئەکـەوێ و سـەری ئـەدا لـە دیـوار و بێهـۆش ئەکـەوێ.

ئەحمەد: کابرای کەری ناحاڵی!

ڕەمـەزان، ئەحمـەد ئەکێشـێتە دواوە و باڵـی کابـرا ئەگـرێ هەڵـی بسـتێنێ، کابـرا، پـار مـردووە و ئەمسـاڵ سـاڵییە!

ڕەمـەزان: هـەی کاکـە؟ بـرا؟ ڕەفیـق هەسـتە؟ (گـوێ ئەنێتـە سـەر سـینگی) ئـەی ماڵـی کاولـم! چیـت کـردووە ئەحمـەد؟!

ئەحمـەد: پیـاوی ناحاڵـی، ئەبـێ وا حاڵیـی کـەی؟ مـن هـەر ئەڵێـم نێـرە، ئـەو هـەر ئەڵـێ بیدۆشـە!

ڕەمەزان: مردووە ماڵ کاول! نەفەس ناکێشێ!

ئەحمەد: شتی وا نەڵێی!

ڕەمەزان: ئەوەتە کاکە! نەبزی لێ نادا، نەفەس نادا، مردووە!

ئەحمـەد بـە هـەردوو دەسـت ئەکوتـێ بەسـەر خۆیـا. دەسـت ئـەکا بـە گریان.

ئەحمـەد: جـا بـەوەڵا بـە تەنیـا یـەک شـەو، تاقەتـی بەنـد و زیندانـم نییە !

رەمــەزان: بەنــد و زیندانــی چــی؟ بەدبەخــت رووڕەش ئەمــە قەتڵــی عەمـدە و حوکمـی ئیعدامـە!

ئەحمـەد: دەسـتم بـە دامانـت مـام رەمــەزان خـۆت ئەزانـی مـن بـە عەمد ئـەم کارەم نەکـردووە، بـە ناحـەق تووشـی بـووم، کارێکـم بـۆ بکـە!

رەمەزان: چی بکەم؟ من ئێستا چیم لە دەس دێ؟

ئەحمەد ئەکوتێ بەسەر خۆیا و ئەگری!

ئەحمەد: ئەی خوای گەورە ئەمە چ بەڵایێ بوو بەسەرمدا هات؟!

رەمـەزان: باشـە مەگـری، پێموایـە هەروەهـا کـە خـۆی وتـی، کوڕەکـەی بـە پیـاوی حکوومەتـەوە دێ بـە شـوێن باوکیـا و چاویـان بـەم مەیتـە بکـەوێ، ئیـدی هیچمـان بـۆ ناکـرێ!

ئەحمەد: ئەڵێی چی بکەین؟

رەمـەزان: هیـچ، نەختـێ ئـاو بـە بـە سـەروچاوتەوە و دەس لـە گریـان بـەردە، تاکـوو پێـت بڵێـم هـا دەی.

ئەحمەد: سەرچاو.

ئەحمــەد ئەچــێ بــۆ ســەر چاوانــەی نێــو حەوشــەکە و رەمــەزان بەتونـدی ئەچـێ دەرگای تەویلەکـە ئەکاتـەوە، تـا ئەحمـەد دەموچـاو ئەشـوات، رەمـەزان جەسـەدی کابـرا ئـەدا بەکـۆڵ خۆیـا و ئەیکێشـێتە نـاو گـەوڕەوە، ئەنامـەی گیانـی ئەحمـەد ئەکەوێتـە لەرزیـن، رەمـەزان خەسـتە و مانـدوو لـە گـەوڕ دێتـە دەرێ و چـاوی بـە لەرزینـی ئەحمـەد ئەکـەوێ.

رەمەزان: ئەوە بۆ ئەلەرزی کابرا؟ بێن ئاوا بتبینن، ئەزانن چی قەوماوە! زۆر عادی بە و وەبزانە خەونت دیوە!

ئەحمەد: بۆم ناکرێ بە دەستی خۆم نییە.

رەمەزان: جواڵێکم بۆ ئامادە کە زوو!

ئەحمەد: جواڵی چی، بۆ چیتە؟

رەمەزان: هەی هەی بابا! ئەی ئەو لاشە گۆشتە چۆن لە ماڵ بکێشمە دەر و لە بەینی بەرم. ها دەی تا نەیانداوە لە دەرگا!

ئەحمەد ئەڕوا بەرەو ژێرخوان و رەمەزان ئەڕوا بەرەو مەتبەخ. ئەحمەد بە خورجینێ گەورەوە دێتە دەرێ. رەمەزان بە کاتێکی سەلاخییەوە دێتە دەرێ. چاوی ئەحمەد بە کارتەکە ئەکەوێ ئەتۆقێ!

ئەحمەد: ئەمە بۆ چییە؟

رەمەزان: بیدە بە دەسمەوە!

خورین یا جواڵەکەی لە دەس ئەسێنێ و ئەچێ بەرەو گەوڕ. لەبەر دەرگای گەوڕا لا لە ئەحمەد ئەکاتەو.

رەمەزان: ئەگەر لە دەرگایان دا هەروا دیت ئەلەرزی رەنگت پەڕیوە، جواو مەدەوە، باش!

ئەحمەد: سەرچاو.

رەمەزان شاڵ و قەباکەی دەردێنێ و لە بەر دەرکی تەویلەدا دای دەنێ و بە کارتەکەوە ئەچێتە ناو تەویلە. هەموو ئازای ئەنامی ئەحمەد کەوتووە لەرزین و بە چاوی پڕگریانەوە دەست بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە کە خودا رەحمی پێ بکا. نەختێ دادەنیشێ، دوای کاتێ هەڵدەستێ و ئەکەوێتە هاتوچوونەوە. هاتوچووەکەی چەند

جار بەسەر یەکدا (ریزالو) ئەبێ. ئەوەندەی پێ ناچێ، رەمەزان بە قۆڵ و مەچەکی خوێنین و خوێنبارەوە دێتە دەرێ. ئەحمەد چاوی زاق ئەبێ و بەحەیرەتەوە تماشای ئەکا!

ئەحمەد: چیت کردووە مامە رەمەزان؟!

رەمەزان: چیم کردووە؟! دەستەگوڵەکەی تۆم ئەنجن ئەنج کردووە کە بتوانین لە ماڵ دەری کەین و بیخەینە گۆڕێکەوە! چیم بکردایێ؟!

ئەحمەد: کارێکی زۆر کوێرانەم کرد مامە گیان، ئێستاش دوای خودا هیوام بە تۆیە!

رەمەزان: نە هەر هیوات بە خودا بێ، وەرە وەرە یارمەتیم بدە لاشەکە بکێشینە دەرێ.

ئەحمەد: نابێ نابێ، من نایمە نێو تەویلەوە؟

رەمەزان: بۆ ئەترسی؟!

ئەحمەد: تاکو ئێستا شتی وام نەدیوە! جۆرە حاڵێکم هەیە!

رەمەزان: ئەی بۆ من زۆرم دیوە؟! منیش نەمدیوە، بەڵام لەبەر خاتری قەبری ئەو باوکە هەژارەت یارمەتیت ئەدەم. راوێستە نەختێ دەستومەچەکم لە خوێن پاکەو بکەم، جا پێت ئەڵێم چی بکەین.

رەمەزان ئەچێتە سەر چاوانەکە و خەریکی شۆردنی قۆڵ و مەچەکی ئەبێ. ئەحمەد زۆر نیگەرانە و دەستەپاچەیە. رەمەزان قەباکەی لەبەر ئەکا و شاڵەکەی بەسەریا ئەبەستێ.

رەمەزان: جا ئێستا وەرە بیکێشە دەرێ.

ئەحمەد: تۆ خوا قەیدی نییە مامە رەمەزان هەموو گیانم ئەلەرزێ، خۆت کارێکی لێ بکە.

رەمەزان سەری ئەلەقێنێ و خۆی ئەچێتە نێو تەویلەوە و دوای کاتێ جوالێ خوێنین کە جەسەدەی تێدایە دەردەهێنێ. ئەحمەد بە دیتنی جوالەکە حالی تێک ئەچێ و پال بە دیوارەکەوە ئەدا.

رەمەزان: ئەوە تۆ چیتە؟ کابرات کوشتووە، لە مەیتەکەی ئەترسی؟!

ئەحمەد: بەتەمای چی لێ بکەی؟

رەمەزان: ئەبێ گوم و گۆڕ بکرێ یان نە؟!

ئەحمەد: بۆ نایخەیتە ناو چاوانەکەوە؟!

رەمەزان: بەخوا زۆر عاقلی! ئەوەڵ ئەوە کە چاوانەکە ئاوی خواردنی ئەم مالەیە و رۆژی چەند جار ئاوی لێ هەلئەگۆزرێ! دوای ئەوەش دوو سێ رۆژ لە چاوانەدا بێ، بۆنی لاشی گەنیو تەواو گەڕەکەکە با خەبەر ئەکا!

ئەحمەد: ئەی چی لێ کەین؟

رەمەزان: چارێکمان بۆ نییە، جگە ئەوەی تاکوو تاریکان راوێستین و شەو بیبەینە سەرقەبران و لەوێ بیخەینە چالێکەوە! (جوالەکە هەلدەگرێ) ئەنێمە پشت دەروازەکە کە بۆ تاریکان، لێ نەوین و بیبەین.

رەمەزان ئەڕوا بەرەو دالان، تەقە لە دەروازەکەوە هەلدەستێ.

ئەحمەد: (هەراسان بە تەوق سەر خۆیا ئەکوتێ) کێیە؟!

رەمەزان بە دەرچوون جوالەکە ئەگەڕێنێتەوە بۆ ناو تەویلە.

رەمەزان: (بەدەم رێوە) وەرە وەرە، تۆ جواو مەدەرەوە، وەرە!

ئەحمەد هەراسان بە شوێن رەمەزاندا ئەچێتە نێو تەویلەوە.

رەمەزان جواڵەکە دادەنێ و خۆی دێتە دەرەو. ئەحمەد کە لە جواڵە ترسی هەیە، بە شوێن ئەوا دێتە دەرێ. رەمەزان لێی توورە ئەبێ.

رەمەزان: بۆ کوێ کەوتوویتە شوێنم؟!

ئەحمەد ئەچێتە نێو گەوڕ، بەڵام بە خۆفەوە سەری ئەهێنێتە دەر. رەمەزان ئەچێتە نێو داڵانەوە.

دەنگی نایب: بیکەوە مامە رەمەزان خۆمانین.

ئەحمەد دەنگی نایب ئەناسێ و دوو دەستی ئەدا بەسەر خۆیا و سەری ئەبا ماڵەوە! رەمەزان دەرگاکە ئەکاتەوە.

رەمەزان: سڵام نایب حەسەن.

نایب لەگەڵ کوڕێکی جەواندایە.

نایب: سڵام چۆنی مام رەمەزان؟

رەمەزان: باشم شوکر، ئێوە چۆنن؟

نایب: لە منداڵەکان کێ لە ماڵە؟

رەمەزان: کچەکان چوونەتە ماڵ ئێوە، ئەحمەدیش وەکوو دایم پێموایە لەگەڵ رەفیقەکانی بێ، بەڵام لە کوێ! خودا ئەیزانێ.

نایب: ئەی تۆ چۆن لە ماڵی؟

رەمەزان: بۆ ئاو و ئالدانی ئەو دوو پێ سەر ئاژەڵەی تەویلە هاتووم، خۆ من نەبم کەس پیانا ناگەیێ.

نایب: باوکی ئەم کوڕە نەهاتووە بۆ ئێرە؟!

رەمەزان: باوکی ئەو کوڕە کێیە و بۆ هاتبێ؟

کوڕ: باوکم قەرزی بەلای حاجییەوە بوو، هات بۆ قەرزەکەی و

بە منی وت دوای دوو سەعات ئەگەر نەهاتمەوە، تۆ لەگەڵ پیاوی حکوومەت وەرە شوێنم، چون تا تەواو قەرزەکەم وەرنەگرم، نایمە دەرێ.

ئەحمەد لەناو دەرگای تەویلەکەدا سەری دەرهێناوە و گوێی لە دەنگی ئەوانە.

کوڕ: لە دوورەوە ئەم دەروازەیەی بە من نیشان دا و تا هاتە ئێرە و لە دەرگای دا، من چاوم پێوەی بوو، ئیدی ڕۆیشتم، ئێستا زیاتر لە دوو سەعاتە.

ئەحمەد چەپۆکێ بەسەر خۆیا ئەدا و سەر ئەباتە ناو.

ڕەمەزان: من زیاتر لە دوو ساعەتە وام لێرە و کەسم نەدیوە نایب حەسەن.

کوڕ: من خۆم بینیم لە دەروازەکەی دا!

ڕەمەزان: بەڕاستتە! ئەگەریش وابووبێ، من لەناو تەویلەدا بووم و بەداخەوە نەمبیستووە، حەتمەن وای زانیوە کەس لە ماڵ نییە و هاتووەتەوە بۆ لای تۆ یان ڕۆیشتووە بە شوێن کارێکی دیکەدا.

نایب: وتت نێوی بابت چییە؟

کوڕ: حاجی حەمەکەریم، بۆ لای من نەهاتووەتەوە! کارێکی دیکەشی لەم شارە نەبووە، جگە قەرز سەندنەوە لەم ماڵە.

ڕەمەزان: ئێرە نەهاتووە، ئەگەریش هاتبێ کەس دەرگای بۆ نەکردووەتەوە و ڕۆیشتووە.

کوڕ: شتێ وا نابێ!

ڕەمەزان: ئەی خۆ ئافتاوە (مەسینە) نییە من شاردبێتەمەوە! وەرە

تماشای تەواو ماڵەکە بکە.

ئەحمەد ئەکوتێ بەسەر خۆیا!

نایب: (بە دەنگی بەرز) حاجی حەمەکەریم؟ حاجی حەمەکەریم، حاجی حەمەکەریم؟ نییە کاکی خۆم، ئەگەر لێرە بایا، دەنگی منی ئەبیست، وا نییە؟

کوڕ: وەڵا چی بڵێم نایب؟ بەڵام من چاوم پێوە بوو لەم دەرگایەی دا!

نایب: باشە کاکە گیان لەم دەرگایەی داوە، دابێتی، ئەم ماڵە ماڵی خزمی منە و هەموویان ئەناسم کە ئینسانخۆر نین! تۆ بڕۆرەوە سەر مەسکەن و مەنزڵی خۆت. ئەگەر نەهاتبووەوە، بە من خەبەر بدە تاکوو حەسابی شوینی بگەڕێین، من ئەزانم ئێستا ئەویش بە شوێن تۆدا وەیلانە. ئەگەر نەبوو، وەرەوە لای من قەولی پیاوانەت پێ ئەدەم لەژێر بەردیشا بێ بۆتی پەیدا کەم!

ئەحمەد بە چەپۆک ئەکوتێ بەسەر خۆیا و بەگریانەوە سەر ئەلەقێنێ!

نایب: تۆ لەگەڵ ئێمە نایێی؟

رەمەزان: من نەختێ کارم ماوە نایب گیان، دوایی خۆم دێمەوە سەرێکی بازاڕ ئەدەم.

نایب: باشە کاکە گیان، بەڵام ئەگەر حاجی حەمەکەریم هات بۆ ئێرە، پێی بڵێ، کوڕەکەی دڵنیگەرانی ئەوە.

رەمەزان: بەسەرچاو.

نایب: خوداحافیز (روو لە کوڕەکە) بڕۆین کاکە.

رەمەزان: خودات لەگەڵ.

کوڕ: بەڵام من دیم لە دەرگایەی دا!

نایب: بڕۆین کاکە بڕۆین.

(ئـەڕۆن) رەمـەزان دەرگاکـە ئەبەسـتێ، پشـت ئەنێ بە سـەر کلۆنەکەوە، چـاو ئەقووچێنـێ، نەفەسـێکی راحـەت ئەکێشـێ و جـا ئەکەوێتـە رێ بەرەو لای ئەحمەد.

ئەحمەد: رۆیشتن؟

رەمەزان: بەڵێ وەڵا، رۆیشتن.

ئەحمەد: سەد جار مردم و زیندوو بوومەوە!

رەمـەزان: لـەوە ناچـێ ئـەو کـوڕە دەسـتهەڵگری ئـەم ماڵـە بـێ. ئەبـێ تـا نەهاتووەتـەو شـوێن باوکـی بگـرێ، ئێمـە ئـەم جواڵـە نەعلەتییـە لـەم گـەوڕە دەربکەیـن.

ئەحمـەد: چۆنـی دەرکەیـن؟ ئەگـەر یەکـێ پرسـی، ئـەم جواڵـە چیـی تێدایـە؟

رەمـەزان: مـن ئەڵێـم لاشـی مردارەوبـووە و ئەیبـەم دوور لـە شـار فڕێـی ئـەدەم، بـەڵام تـۆ جوابـی کـەس مـەدەوە، چـون لەرزەلەرز پەتمـان ئەچێتە سـەر ئـاو! هەرکـەس پرسـی تـۆ دوورەو کـەوە.

ئەحمەد: سەرچاو، تۆم نەبوایا مەشیا چی چیم بکردایێ؟!

رەمـەزان: هـەر هـەوا تاریکـی کـرد و کووچەوکـۆڵان چـۆڵ بـوو، تـۆ کـەوە بـەر لەسـەر کۆڵانەکانەکانـەوە لـە چۆنیەتیـی کۆڵانـەکان، خەبـەردارم کـە باش.

ئەحمەد: سەرچاو.

## (کووچەوکۆلانی تاریك، شەو).

ئەحمەد دەرگای حەوشەکە بەهێواشی ئەکاتەوە. دێتە نێو کۆلان. تماشای هەردوو لا ئەکا. هەردوو لا چۆلە.

ئەحمەد: (بەهێواشی) وەرە، کەس نییە، چۆلوهۆل.

رەمەزان جوال لەکۆل، لە مال دێتە دەرێ. ئەحمەد دەرگاکە ئەوەسێ و بەتوندی لە بەرەوە ئەچێ. یەکێ لە بان مالەوە خەریک تماشاکردنی ئەوانە! ئەحمەد ئەگاتە سەر کۆلانەکە. بە دەست عەلامەتی وەستان ئەدا. رەمەزان خۆی ئەخا پالی. دوای کاتێ بە ئیشارەی دەست، ئەلێ وەرە. رەمەزان ئەکەوێتە رێ بە شوێن ئەحمەدا. ئەو کەسە وا لە سەریان بوو، دێتە نێو کۆلانوە، دوو پێ ئەکەونە رێ بە شوێنیاندا. ئەوەی ها بە شوێنیانەوە، بە روومەت نیشان نادرێ. تەنیا دوو پێ نیشان دەدرێن و یان (پی دەبلیو ڤی) دووربین (کامێرا). هەر بەم شێوە لە چەند پلان عبوور دەکەن و دوو پێیەکە هەر بە شوێنیانەوەیە.

ئەحمەد ئەگاتە سەر نەبش (روکن)ی کۆلان. ئەچێتە کۆلانەکەوە لەپڕا دەکشێتەوە لە تاریکیی دیوارەکا خۆی ئەشارێتەو. رەمەزان زۆر بەماندوویی، خۆی دەگەێنێتە لای ئەحمەد.

رەمەزان: (هێواش) ئەوە چی بوو؟ بۆ نەڕۆیشتی؟

ئەحمەد: نابێ مامە رەمەزان!

رەمەزان: بۆ؟

ئەمەد: تماشا کە.

رەمەزان بە هەنکە هەنک، لە گۆشەی دیوارەکەوە تماشا ئەکا و رادەچلەکێ! ئەچێتە دواوە. تماشایەک ئەکا و دیسان سەر ئەباتە بەرەو.

دوو پیاوی حکوومەت لەوسەری کۆڵانەکەوە ئاوریان کردووەتەوە و ڕاوێستاون.

ڕەمەزان: جا ئێستا چی بکەین؟ ڕێگایەکی ترمان نییە، من زۆر ماندووم ئەحمەد گیان.

ئەحمەد: (تماشایەک بەرەو یەکێ لە دەرگا ماڵەکانی کۆڵان ئەکا) ئەمە ئەمە ماڵی سابیرە!

ئەحمەد: سابیر کێیە؟

ئەحمەد: سابیری ڕەفیقم. (فکرێ ئەکاتەوە و ئەچێ بەرەو دەرگاکە)

ڕەمەزان: چی ئەکەی؟

ئەحمەد: ڕاوێستە!

ڕەمەزان: تۆ ڕاوێستە، بزانم بەتەمای چی بکەی؟!

ئەحمەد: داوای یارمەتی لە سابیر ئەکەم.

ڕەمەزان: قەرار وابوو کەس پێمان نەزانێ!

ئەحمەد: سابیر هەموو کەسێ نییە! یەعنی ئەو ڕەفیقانەی من، لەگەڵ من هەموو کەسێ نین، تەنانەت ئەگەر پێیان بڵێم چی قەوماوە، ئیمان و باوەڕ و ئیعتیمادم پێیانە!

ڕەمەزان: شتی وا نابێ و دەنگی دەرمەهێنە!

ئەحمەد: تۆ خۆفت نەبێ، سابیر بە ئەندازەی چوار کەس قوەتی باڵی هەیە! پێی ئەڵێم ئەو هەڵیگرێ!

ڕەمەزان: وەڵا چی بڵێم! ئەگەر دوایی بۆمان موشکڵ ساز نابێ، من زۆر ماندووم! پێم خۆشە یەکێ بێ بۆ یارمەتیدانم!

ئەحمەد: ڕاوێستە (لە دەروازەکە ئەدا) دوای ساتێ دەنگی سابیر

لەودیو دەروازەکەو دێ.

سابیر: کێیە؟

ئەحمەد: (بەهێواشی) منم سابیر بیکەوە.

دوو پێیەکە لەوسەر کۆڵان خۆی داگرتووە!

سابیر: ئەی ئەحمەد گیان! (دەرگاکە ئەکاتەوە) باوەش بە ئەحمەدا ئەکا و ماچوموچێکی زۆر ئەکەن!

سابیر: ئەوە ئەمشەو مانگەشەو لە کام لاوە هەستاوە وا لەباتی من، تۆ هاتوویتە بەرماڵی من؟! (چاوی بە رەمەزان ئەکەوێ) ئەی مامە رەمەزانیشت لەگەڵە! فەرموون فەرموون بێنە ژوورەوە!

ئەحمەد: زۆر سوپاس، کاتی میوانی و ئەم شتانە نییە، ئەکرێ خۆت گورجەوە بکەی و لەگەڵمان بێیت؟!

سابیر: ئەی بۆ ناکرێ بەقوربانت بم! جا بووە تۆ کارێکت بە من بووبێ و من وتبێتم ناکرێ و نابێ؟! من گیانم ئەکەم بە قوربانی تۆ! کورە دەی وەرنە ماڵەوە!

ئەحمەد: کاتی ئەوە نییە.

یەکێک لە پیاوانی حکوومەت کە دەنگی ئەوانی بیستووە، خەریکە بەرەو خوار دێ. ئەوەکەی تر لە دوورەوە بە دەنگی بەرز بانگی دەکا.

پیاوی یەکەم: ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟

پیاوی دووەم: لەم کۆڵانەوە دەنگێکم بیست، راوێستە بزانم چ خەبەرە!

دەنگەکە ئەگاتە گوێی رەمەزان...

سابیر: دە باشە، ئەوە خۆم گورجەو ئەکەم.

رەمەزان بە جوالەکەوە شان ئەنێ بە ئەحمەدەوە و خۆشی لەگەڵ ئەو فڕک ئەداتە نێو حەوشی ماڵی سابیرەوە و دەرگاکە بە سەر دادەخا و هەراسان ئەڵێ (هیس). سابیر تماشای جوالەکە ئەکا و مەشکووک ئەبێ ئەگەڕێتەوە بەرەو ئەحمەد.

دەنگی پیاوی یەکەم: (لە دەرەوە) لەوێ چ خەبەرە؟

دەنگی پیاوی دووەم: (لە نزیکەوە) باوەڕ ئەکەی نە، بەڵام من دەنگێکم بیست!

پیاوی یەکەم: ئەوە دەنگی نێو ماڵان بووە، وەرە کەس نییە.

پیاوی دووەم: لەوە ئەچێ وابێ!

سابیر تماشایەک ئەحمەد و رەمەزان ئەکا.

ئەحمەد: دەی بڕۆ، ماتڵی چیت؟!

سابیر: ئەو جواڵە چییە تێیدا؟!

ئەحمەد: دوایی پێت ئەڵێم.

رەمەزان: لاشە گۆشتە بەقوربان!

سابیر: لاشە گۆشتی چی؟!

رەمەزان: ئاژەڵی مردارەوە بووگ!

سابیر: دەی منتان بۆ چییە؟!

ئەحمەد: کورە دەی دوایی پێت ئەڵێم، بڕۆ خۆت گورجەوە بکە سا دەی!

سابیر: بەداخەوە میوانم هەیە ئەحمەد گیان! یانی میوانم بۆ دێت! دوایی ئەبێ بزانم من بۆچی خۆم گورجەوە بکەم؟

رەمەزان: هیچ کاکە، من وتم ماندووم، کاک ئەحمەد وتی ئەمە ماڵی سابیرە، رەفیقی منە و پێی ئەڵێم، بێتە یارمەتیمانەوە و نەختێکیش ئەو جواڵەکە بدا بە کۆڵیا!

سابیر: بەداخەوە!

ئەحمەد: باشە سابیر گیان، قەیدی نییە. (روو لە رەمەزان) بڕۆین؟

رەمەزان جواڵەکە ئەدا بە کۆڵیا.

رەمەزان: بزانە لە کام لاوە بڕۆین؟!

ئەحمەد: (سەر ئەکێشێتە دەرەو) راوێستە، سابیر تماشای ئەکا.

ئەحمەد تماشای دوو تەرەفی کۆڵانەکە ئەکا.

ئەحمەد: کەس نییە، بڕۆین.

هەردوو لەژێر چاوی شەکداری سابیردا ئەچنە دەرەو. دوو پێیەکە خۆی ئەخاتە نێو تاریکییەوە، ئەحمەد بەئەسپایی دەرگاکە لە دوای خۆیان دادەخا و بە لەوە تماشایەکی مەعنیداری سابیر ئەکا، جا ئەکەوێتە رێ.

سابیر: هن! لاشە گۆشتی مردارەوەبوو ئەم هەموو ترس و لەرزەی بۆ چییە؟! درۆم نەکردبێ، دەستەگوڵێکیان بە ئاودا داوە! (پشتی درگاکە ئەخا). هن! خۆت گورجەوە بکە و وەرە دەرێ! حەماڵم!

هەردوو لەنێو کۆڵاندا وەرێ کەوتوون. دوو پێیەکە لەنێو تاریکی دەردێ و ئەکەوێتە شوێنیان. رەمەزان کە نەختێ کەمجەستەیە لە دوای چەند کۆڵان، ئەکەوێتە هەناسەبڕکێ و بەسەختی ماندوو ئەبێ و کۆڵەکەی دادەنێ.

ئەحمەد کە لەو دوورترە، رائەوێستێ و بەرەو رەمەزان دێتەوە.

ئەحمەد: ماندوو بووی مامە گیان؟

رەمــەزان: (هانەهــان) کــوڕە ماندوویەتــی چییــە؟! خــۆ باوکــم هاتــە بەرچــاوم! ولّکــم بــڕا!

ئەحمەد: بەخودا تۆ نەمبەخشی، خوداش نامبەخشێ مامە گیان!

رەمــەزان: لەباتــی ئــەم قســانە، نەختــێ یارمەتیــم بــدە و جاروبــار کۆڵەکــەم بــۆ هەڵگــرە کاکــە!

ئەحمــەد: بــەوەڵا تەمبەڵــی ناکــەم مامــە گیــان، بــەڵام دڵ و جورئەتــم نییــە دەس بەو جواڵــەوە بدەم، دەســی پێــوە دەم، رۆحــم قەبــزە ئەبــێ! تــۆ نازانــی چــاوم پێــی ئەکــەوێ، چ حاڵێکــم هەیــە! زۆر بــۆم خۆفناکــە!

رەمــەزان: ئــەی چــۆن کوشــتنی بــۆت خۆفنــاک نەبــوو؟! ئــەی چــۆن کوتــات بــە دیــوارەکا و لێــی نەترســای؟!

پێیەکان لەنێو تاریکی راوێستاون.

رەمەزان: وەڵا ئیدی تەوانم نییە.

چاوی ئەحمەد بە دەروازەی ماڵێ ئەکەوێ و نەختێ خۆشحاڵ ئەبێ.

ئەحمەد: بەوەڵا، لە جێگایەکی باشدا کۆڵەکەت داناوە!

رەمەزان: چۆن؟

ئەحمــەد: ئەگــەر مێشــکم لــە کار نەکەوتبــێ، ئەمــە ماڵــی نەعیمــە! ئەلعان بــە نەعیم ئەڵێــم بێتــە دەرەوە و یارمەتیمــان بدا!

رەمــەزان: ئەگــەر ئەویش وەکوو ســابیر یارمەتیمــان نــەدا، مەیکــە کاکە، پێویســت ناکا!

ئەحمەد: نە پێم وا نییە، ئەم وەکوو ئەو بێ.

رەمەزان: قابیلی ئیعتیماد و بڕوا هەیە یان نە؟

ئەحمەد: زۆر کوڕێکی باشە مامە گیان، بەڵام نەوەک ئەویش، وەکوو من بترسێ، هەر ئەوەی پێ بڵێ وا بە سابیرت وت، بڵێ لاشەی ئاژەڵی مردارەوبووە.

ئەدا لە دەروازەکە و دوای کاتێ دەنگی نەعیم دەردێ.

نەعیم: کێیە؟

ئەحمەد: ئەمنم ئەحمەد.. نەعیم، بیکەوە!

نەعیم: ئەی بەسەرچاو، ئەی بە بان گیان، چۆن بووە نیوەشەو بیر من کەوتووی برای ئازیزم. (دەرگاکە ئەکاتەو) وەرە، وەرە ماڵەوە.

ئەحمەد: ئەمشەو کەلێکم لێت کەوتووە و ئەبێ یارمەتیم بدەی نەعیم.

نەعیم: کورە جا لەدەستم بێت، نۆکەرییت ئەکەم لەباتی کەلێک، دە کەلت بۆ ئەگرم! ها بڵێ کەلەکە چییە؟

رەمەزان کە لە کەنارەوە وێستاوە، بە جواڵەکەو دێتە بەرچاوی.

نەعیم: ئەی ببوورە مامە رەمەزان تۆم نەبینی!

رەمەزان: قەیدی چییە.

نەعیم: وەرن، وەرنە ماڵەوە نەختێ ماندوویی دەرکەن، ئەوە چییە لەنێو ئەو جواڵەدا؟

لە دوورەوە دەنگی دوو سێ کەس لە حاڵی عبووردا نزیکەوە ئەبێ.

ئەحمەد: وەڵا ئەوە شتێ نییە نەعیم گیان! پەزەپیرێکمان لە تەویلەدا...

رەمەزان ئاگاداری نزیکەوەبوونی دەنگەکان ئەبێ و بەر لەوە قسەکانی ئەحمەد تەواو بێ، خێرا بە جواڵەکەوە خۆی ئەخاتە نێو حەوشەکەوە.

رەمەزان: دا لاچۆ، دا لاچۆ! ئەحمەدیش لە حەین قسەکردنا ئەخاتە نێو حەوشەکەوە. خێرا دەرگاکە ئەداتەوە. نەعیم مەشکووک ئەبێ و تماشایەکی جوالەکە و حالەتی ئەوان ئەکا، دەنگی نایب و کوڕی کابرای کوژراو لەگەڵ یەکێکی دیکە، بەراگوزەر دێتە بەر گوێی رەمەزان و ئەحمەد.

دەنگی کوڕ: بەخودا بێت و نەبێ، هەر ها لەو مالەدا نایب، جا بەلام ئێوارە تۆ بەقسەی منت نەکرد! من خۆم بە چاوی خۆم دیم لەو دەرگایەی دا!

دەنگی نایب: خۆ خۆت بیستت چەند جار بانگی باوکتم کرد، ئەگەر ببوای جوابی ئەدامەوە، ئەوە ئێستاش ئەڕۆین و ئەمجا هەموو مالەکە پێکەوە ئەگەڕێین.

دەنگی راگوزەران دوور ئەکەوێتەو. ئەحمەد و رەمەزان تماشایەک یەک ئەکەن.

ئەحمەد: ئەرێ ئەوەم ئەوت یەکێک لە ئاژەڵەکانمان لە گەورا تۆپیوە.

رەمەزان: تۆپین هی حەیواناتی حەرام گۆشتی وەکوو سەگ و رێوی و خوو و ئەو شتانەیە بەرێز! مردارەوە بووە، نەتۆپیوە!

ئەحمەد: بەڵێ وەلا ئەوەندە حالم بەدحالە، هەموو شتێکم لەبیرەوە چووە، ببوورن! وەلحاسڵ ئەوەتە خستوومانەتە نێو ئەو جوالە ببەین دوور لە شار فرکی دەینە چالێ. مامە رەمەزان زۆر ماندووە، منیش کەمەرئێشەیەکی زۆر سەختم پێوەیە، گەیشتینە ئەم بەرە، بە خۆمم گوت، چاکە لە نەعیم کە دۆستێکی چەندین و چەند سالەمە، داوای یارمەتی بکەم کە لەگەڵمان بێت، پێکەوە ببەین فرکی دەین.

نەعیم: دەی بۆ نیوەشەو؟! بتهێشتنا بۆ بەیانی.

ئەحمەد: ئیدی وتمان نەک بۆ بکا.

نەعیم: بەخوا زۆرم پێ خۆش بوو تۆکەریتانم بکردای ئەحمەد گیان، بەڵام بەداخەو دایکم هێلاکە و ناچارم بەلایەو دانیشم، ئەبێ ببوورن.

رەمەزان: ئەمەیش لە کاک نەعیمی بەڕێزا! کۆڵەکەی هەڵدەگرێ.

نەعیم: ماڵی رەفیق کۆلانێ ژوورترە، بە رەفیق بڵێ، گا هەس لەگەڵتان هات.

رەمەزان: وای لێ ئەکەین، بڕۆین کاکە بڕۆین.

ئەحمەد ئەکەوێتە بەر و لەژێر چاوەدێریی نەعیمدا سەر ئەکێشێتە ناو کۆڵان. ئەملاوئەولا تماشا ئەکا.

ئەحمەد: وەرە.

نەعیم: سەرچاو هاتن.

هەردوو بێ خوداهافیزی ئەکەونە رێ. نەعیم نەختێ بە دوایانا ئەڕوانێ و دوای کاتێ دێتە ناو و دەرگاکە دائەخا و پاڵی پێوە ئەدا و ئەچێتە نێو فکرەوە.

پێیەکان لەنێو تاریکی دەردێن و بە شوێن ئەحمەد و رەمەزانا رێ ئەکەون...

نەعیم: (لەبەر خۆیەوە) چی بوو لەنێو ئەو جواڵە؟! پێم وایە دەستەگوڵێکیان بە ئاوا دابێ. ئاژەڵی تۆپیوو! سەر منداڵ کڵاو ئەنێ! بەرەو ناو بەڕێ ئەکەوێ.

رەمەزان زۆر بەسەختی رێگا ئەپێوێ. ئاسەواری شەرمەندەبوون بە ئەحمەدەوە دیارە.

لە نزیک ماڵ رەفیقدا لە پا ئەکەوێ و کۆڵەکەی دادەنێ و ئەکەوێتە کۆکەکردن و دادەنیشێتە سەر چۆک.

رەمەزان: خوا بزانێ ئیدی تەوانم براوە ئەحمەد گیان، بەڵکوو ئەم ترس و خۆفتە لابەی و خۆت لە کۆڵی گری کاکم، ئیدی بە من ناکرێ، بڕوام پێ بکە هانام نەماوە و هەموو گیانم نیشتووەتە لەرز!

ئەحمەد گێژ و مەنگ ئەبێ و نازانێ چی بڵێ، چاوی بە دەرکەکەی ماڵی رەفیق ئەکەوێ و دڵخۆش ئەبێ.

ئەحمەد: راوێستە، ئەمەیش ماڵ رەفیقە، رەفیقی رەفیقم. خراپ نییە داوای یارمەتی لەمیش بکەم.

رەمەزان: کورە ئەوانە رەفیقی دەورانی خۆشی و پارە و پووڵن کاکە! ئەو دووانە چیان بۆت کرد، ئەمیش هەر ئەوەت بۆ ئەکا، وێڵی کە.

ئەحمەد: خۆت هەمیشە ئەڵێی ئەم پێنج قامکە وەکوو یەک نابن!

رەمەزان: بەڵام ئەمانەی من دیم، قامکی یەک دەستن، دەستێک کە خەیر نادا، خەیر ئەقاپێ!

ئەحمەد: قەیدی نییە، توخوا، ئەمەیش ئەزموونێکە، ئەمشەو زۆر شتم لێ حاڵی بوو، ئەو شتانەی کە سەدان جار باوکم پێمی وت، بەڵام گوێم لێ نەدەگرت، وام ئەزانی مووچیارییەکانی هەڵەیە!

رەمەزان: باشە وای لێ کە، بەڵام ئەگەر ئەمیش وەکوو ئەوان بوو ئیدی ئەبێ خۆت قۆڵ و مەچەکی لێ هەڵماڵی، لە تەوانی مندا نەماوە.

ئەحمەد لە دەرگای ماڵی رەفیق ئەدا.

رەفیق: (دوای کاتێ) کێیە؟

ئەحمەد: منم کاک رەفیق، ئەحمەدم.

رەفیق: بەه بەه! کاک ئەحمەدی بەڕێز، عەرەقی بیدمشک! چۆن بووە نیوەشەو کەوتوویتە بیر هەژار و فەقیر؟! (بەدەم قسەکردنەو دەرگا ئەکاتەوە) یا ئەڵا برای دینی، ناشێ هاتبێتی بۆ شەونشینی؟! (چاوی بە رەمەزان ئەکەوێ) با با با! گوڵ و گوڵاو پێکەوە هاتوون!

دەنگی دایکی رەفیق لە ژوورەوە بەرزەو ئەبێ.

دایک: کێیە ئەوە رەفیق؟ کێ لە دەرکەی دا؟

رەفیق: (روو بە ماڵ) کەس نییە دایە.

دایک: دیسانەوە لاتولووت بهێنیتە ماڵەوە، بە تاکەوش چاویان دەردێنم!

رەفیق: وتم کەس نییە.

دایک: منیش وتبێتم!

رەفیق: (لەژێر لچەو) هەی هەی بابا! (هێواش) فەرموون بێنە ژوورێ فەرموون.

رەفیق: زۆر سپاس، چاوی بینایی لەگەڵمان نییە!

ئەحمەد: تۆ هەموو جارێ ئەمەت بە من وتووە کە خۆزگە لەدەستم بهاتایێ یەک رێزە لە خاسییەکانتم جوبران بکردایەتەوە. وایە؟

رەفیق: بەڵێ وەڵا وایە و هەر واش ئەبێ!

ئەحمەد: باشە کاکە خۆت گورجەوە بکە ئا ئەو جواڵەمان تا سەرقەبران لەگەڵ هەڵگرە.

رەفیق: هەر ئەوە؟!

ئەحمەد: بەڵێ وەڵا.

رەفیق: سەرقەبران بۆ؟ ئەو جواڵە چی تێدایە؟

ئەحمەد: ئیدی مەپرسە کاکە وەبزان سەری براوی تێدایە!

رەفیق: سەری براوی کێ؟

رەمەزان: سەری براوی پەزەپیرێکی نەخۆش کە مردارەوە بووە و ئەمانەوێ بیبەین لە سەرقەبران بیکەینە ژێر خۆڵەوە!

رەفیق: زۆر زۆر زۆر شەرمەندەم کاک ئەحمەد، دایکم سوێندی خواردووە شەو نەچمە دەرەوە. یەک دانە پەزەپیریش نیازی بە سێ کەس نییە برای بابم، هەر بە یەک کەسیش هەڵئەگیرێ.

ئەحمەد: گا هەس من و مامە ڕەمەزان لە شەوی قەبرستان خۆفمان بێ کاکە!

رەفێق: بۆ خۆت نازانی من لە ئێوە ترسەنۆکترم؟!

رەمەزان: رێ کەوە کاکە خۆ وتم ئەمانە رەفیقی خۆشین!

دەنگی دایک: ئەوە ورە وری چیتە لەبەردەرگا خوێڕی؟ یان بێرە ماڵەوە یان لەگەڵیان گۆڕت گوم کە و بڕۆ ئیدی!

رەفیق: کورە دەی ئەوە هاتم، (روو لە ئەحمەد) ئەوەتە ناهێڵێ ئەگینا نۆکەرییتم ئەکرد، بەڵام گیانی خۆت بڵێ ئەو جواڵە چی تێدایە؟!

رەمەزان جواڵەکە ئەدا بە کۆڵیا و خێرا روو لە ئەحمەد ئەکا.

رەمەزان: بڕۆین!

ئەحمەد رێ ئەکەوێ.

رەفیق: ببوورن توخوا!

دەرگاکە دادەخا. ئەحمەد و رەمەزان هانە رێوە. پێیەکان لە تاریکی دەردێن و بە شوێن ئەوانا ئەکەونە رێ. رەفیق بەرەو ناو ماڵ ئەچێ کە تێکرا دەنگی جارچی بەرزەو ئەبێ و رەفیق ئەوێستێ و گوێ شل ئەکا.

دەنگی جارچی: ئەهای خەڵکی بەشەرەفی گەڕەکی بەرباخ، لە ئێوارەی ئەمڕۆوە غەریبەپیاوێکی مامناوەندی لەم گەڕەکەدا بێ سەروشوێن بووە، دوایین جار کە بینراوە تەقەی لە دەرگای ماڵی حاجی کەماڵ داوە، جێگای وەرگرتن (مقەڕی نایب).

رەفیق گوێی تیژ ئەکاتەوە.

کوڕی ئەم پیاوە بە هەر کەسێک کە ناوونیشانێکی باوکی، بە مردوویی یان زیندوویی، بداتێ، پەنجا سکەی بە مزگێنی ئەداتێ.

خەبەر، خەبەر، خەبەرم، (دووپاتکردنەوەی جارەکە)

رەفیق ئەچێتە فکرەوە.

ئەحمەد بەدەم رێوە بە دوو دەستی ئەدا بەسەر خۆیا.

پێیەکان بەرەو دوا ئەچن و لەنێو تاریکیا ون ئەبن.

رەفیق خێرا لە ماڵ دێتە دەر.

دایک: ئەوە بۆ کوێ خوێڕی بەم نیوەشەوە؟

بۆ کاسبیکردن سەد دانە سکەی موفت، دوو مانگ هەڵتیقان بە زگ تێرەوە (پێکەنین)

دەرگاکە پێوە ئەدا و خێرا لە تاریکیی کۆڵانەکەدا ون ئەبێ. بە دەرچوون (راکردن) خۆی ئەگەیەنێتە مقەڕی نایب و ئەچێتە ماڵەوە.

**(ناو مقەڕ)**

نایب و پیاوەکانی لەسەر سەکۆ دانیشتوون. سابیر و نەعیم بەرابەریان دانیشتوون.

نایب: بە چاوی خۆت مەیتەکەت بینی؟

سابیر: نە بەو شێوە، بەڵام جواڵەکە غەرقی خوێنی وشک بوو!

نایب: (ڕۆڵە نەعیم) تۆ چیت دی؟

نەعیم: باوکم، خودا عەفووی کات، دایم ئەیگوت: ئەوەی وا مەنێ ئاردی بۆ ئەکرێتە نان و ئەیخوا، ئەبێ یەک چارەگ عەقڵ و شعووری پێ بگرێ!

نایب: باشی وتووە، شامرا بینووسە!

شامرا: سەرچاو! (خەریک نووسین ئەبێ)

نایب: (ڕوو لە سابیر) باوکی تۆ چی، لەمانەی نەوتووە؟

سابیر: لەسەر جایزەکە تەئسیری هەیە؟

نایب: ئەی چۆن؟

نەعیم: جایزەکەم نادەی قوربان!

سابیر: جایزەکەم، جایزەکەم! منیش هاتووم خەبەرم داوە!

نەعیم: بەڵام مـن هـەم بـەر لـە تـۆ هاتـووم، هـەم باوکـم شـتی باشـی وتـووە!

نایب: بەڵام بە هیچکامتان ناگات، چونکە هیچتان نەدیوە.

ڕەفیق: (دێتە ماڵەوە) بەڵام من دیومە قوربان، سەلام.

نەعیم و سابیر خێرا لای لێ دەکەنەو.

نەعیم: ئەمە تۆ لێرە چی دەکەی؟

رەفیق: هەر ئەوەی وا ئێوە ئەیکەن!

سابیر: ئەمە تۆ بۆ هاتووی؟!

رەفیق: هەر بۆ ئەوە وا تۆ بۆی هاتووی!

نایب: وەرە بزانم تۆ چیت دی؟

رەفیق دەست ئەکا بە گریان.

نایب: پرسیم چیت دی، نەمپرسی، چۆن ئەگری؟

رەفیق: ئەوەی من دیم، کافر بە چەستەی نەبێ قوربان! چاکە هەر هیچ نەڵێم، پارەکەم وەرگرم و بڕۆم!

نایب: شامرا بینووسە.

شامرا: بەڵێ بان چاو.

نایب: بڵێ بزانم چیت دی؟

رەفیق: ئەنجن ئەنجن کرابوو! خستبوویانە ناو جواڵێکی خوێناوی، پرسیم ئەمە چییە؟ وتیان پەزەپیرێکی مردارەوبوو کە ئەبێ بیبەین لە سەرقەبران چاڵی کەین! لە دڵمی دا کە راست ناڵێن! چوومە بەرەوە بە حاڵێ دەرگای جواڵەکەم کردەوە! (بە گریان) دوشمەن لە ماڵتان ناهومێ! هەوەڵ شتێ دیم، چاوانی بوو، یەکێکی ئاوا قووچراو، یەکێکی کراوە و ئەتگووت خەریکە لێم ئەپاڕێتەوە و چاوم لێ دادەگرێ کە بەڵکوو کارێکم بۆ بکەی خوێنم گوم نەبێ!

نایب: بینووسە شامرا!

شامرا: سەرچاو. (نووک قەڵەمەکە ئەدا لەسەر زوبانی و ئەنووسێ)

رەفیق: شتێ دیم بە چاوی خۆم دی، سمێڵی بوو، یەک جفت

سمێڵی چەخماخی، وەزەبر خورما قنج و قیت راوێستاو! وەکوو شاخی گا!

نایب: نەینووسی شامرا.

شامرا: بەڵێ بان چاو.

نایب: کوڕەکەی ئەیگوت، باوکم سمێڵی نییە، تۆ چۆن سمێڵت دیوە؟

ڕەفیق: چی بڵێم گەورەم، گاهەس کوڵک و مووی جێگایەکی تری بووبێ، من وام زانیوە سمێڵە!

نایب: شامرا بینووسە!

شامرا: بەڵێ بان چاو (تف لە قەڵەم)

سابیر: ئەمە وا نابێ نایب، تا تۆ بپرسی و ئێمە جواب بدەینەوە، شامرا بینووسێ، حەفت کوناوە ژوور گموگۆڕیان کردووە بەقوربان!

نایب: شامرا بینووسە! بەڵێ وایە، لاخمە بۆ گرتنی ئەو دوو قاتڵە بێ ڕەحمە، ئەویش لەگەڵمان بێ.

نەعیم: نابێ من نەبم؟

نایب: نە.

ڕەفیق: ئەی من؟

نایب: هەرکەس جایزەی پێویستە، ئەبێ لەگەڵ من بێ، چون جایزە لە شوێنێک ئەدرێ کە مەیتەکە دۆزرابێتەوە!

ڕەفیق: بەڵێ وایە.

نایب: هەرکەس جایزەی پێویست نییە لەگەڵ ئێمە نەیەت.

سابیر: سێ نەفەرین و یەک جایزە!

نایب: هەر هیچ نەبێ جایزەکەیان بۆ ئەکەینە سێ کوتەوە، شانزە هەڤدە سکە خۆ کەم نییە! (هەڵئەستێ) بڕۆین.

هەرسێکیان هەڵئەستن و تماشای یەک ئەکەن و بە شوێن نایبدا ئەکەونە ڕێ.

## (نێو کۆڵان، شەو)

ڕەمەزان هەر چەند قەدەم دەڕوا، یەک جار کۆڵەکە دادەنێ، ماندوویەتیی دەردەکا.

پێیەکان، هێواش هێواش لەنێو تاریکیی شەودا، هان بە شوێنیانەوە.

ڕەمەزان: (کۆڵەکەی دادەنێ) ئای باوکم هاتە بەرچاوم ئەمشەو!

ئەحمەد: لەم کۆڵانەوە بۆ ئەڕۆین؟

رمەزان: عەیبی چییە؟

ئەحمەد: سەری ئەو چوارڕێیانەی بەرامبەرمان، مقەڕی نایبە.

رمەزان: دەی با مقەڕی نایب بێ! مەگەر نەتبینی سەرەڕێگەکانی دیکە گیراون؟ تۆ کارت نەبێ، من خۆم لەبەر مقەڕ ڕەدی دەکەم. (کۆڵەکەی هەڵدەگرێ) ڕێ کەوە!

هەردوو ئەکەونە ڕێ. هەر نزیک چوارڕێیان ئەبنەوە ئەحمەد عارەق دەردەکا. پێیەکان هان بە شوێنیانەوە. ئەحمەد هەست ئەکا یەکێ ها بە شوێنیانەوە! لای ئەکاتەو چاو لە تاریکیی پشت سەری ئەبڕێ، هیچ نابینێ.

ڕوو لە ڕەمەزان ئەکات، چاوی لەترسا زاق ئەبێتەوە و بە هەردوو

دەست ئەكوتێ بەسەر خۆیا! نایب و پەنج کەسی دیکە کە دووانیان پیاوی خۆین، لەسەر ڕێگەکەیانەوە ڕاوێستاون.

ڕەمەزان کۆڵەکەی دادەنێ. پێیەکان ئەچنە نێو تاریکییەوە. کوڕی کابرای کوژراو دێت لە لای دەس نایبەوە ئەوەستێ.

نایب: با با با با! مامە ڕەمەزانی بەڕێز! پار و پێرار دۆس، ئیمساڵ ئاشنا، ماندوو نەبی؟!

ڕەمەزان: سپاس سپاس بۆ نایبی بەڕێز.

نایب: ئەمە چییە بە کۆڵتەوە؟

ئەحمەد ئەکوتێ بەسەر خۆیا. دەست ئەکا بە گریان و دادەنیشێ.

ڕەمەزان: شتێ نییە نایب هەسەن، ئێوارە کە تەشریفت هێنا عەرزم کردی، کاری تەویلەم هەیە، کاتێ چووم یەکێ لە ئاژەڵەکان کە پەزەپیرێ بوو مردارەوە بووبوو، ئیدی بۆ ئەوەی بۆ نەکا، کردمە چەند کوتەوە و خستمە نێو ئەم جواڵەوە.

نایب: ئەمە هەر ئەو جواڵەیە سابیر؟

سابیر: بەڵێ، خۆیەتی!

ئەحمەد: ئەی نامەردی ڕەفیق فرۆش!

نایب: ئەمە جواڵە هەر ئەو جواڵەیە کە تۆش بینیت نەعیم؟

نەعیم: بەڵێ وەڵا، خۆیەتی!

ئەحمەد: ئەی بێ شەرەفی نمەک نەناس! حەیف ئەو هەموو پارە خەرجی ئێوەم کرد!

نایب: تۆ چی ڕەفیق، سمێڵ و چاوەکانت هەر لەنێو ئەم جواڵە دی؟

رەفیـق: بەڵـێ گـەورەم! ئەنجن ئەنجن کرابوو، جەرگم بـوو بـە کەبـاب. (ئەگری)

ئەحمـەد: ئـەی بـە پـەن بـی بـۆ درۆت! ئاخـر مـن ئێـوەم بـە رەفیـق و هاوەڵـی خـۆم زانـی نامـەردان! پەنـام پێتـان هێنـا! هیـچ کۆمـەک و یارمەتییەکم پێتانـەوە نـەدی، بـە بۆنـی پەنجا سـکەوە ئـا بـەم شـێوە منتـان خسـتە ژێـر چەپۆکـی قانوونـەوە؟ بـە خۆتـان ئەڵێـن پیـاو؟ خـۆم مـن سـەدان پەنجـا سـکەیی و تـەواو ئیـرس و ماڵـی باوکمـم فیـدای ئێـوە کـرد!

ئەحمەد بەدەم گریانەوە تەواو قسەکانی ئەکا.

نایب: ئەو جواڵە چی تێدایە، خاڵیی کە سەر عەرز رەمەزان!

ئەحمـەد: چـی تێدایـە نایـب، جەسـەدی حاجـی حەمەکەریمـە، مـن خـۆم کوشـتم، مامـە رەمـەزان هیـچ گوناحێکـی نەکـردووە، مـن کوشـتوومە و ئیعتیرافـی پـێ دەکـەم.

نایب: وتم خاڵیی کە رەمەزان!

رەمەزان: باشە. (خەریک ئەبێ)

ئەحمـەد: چـی باشـە؟ چـی خاڵـی ئەکـەی؟ مەگـەر ناڵێـم مەیتـی حاجـی حەمەکەریمـی تاجرە؟ ئیـدی بـۆ جەسـتەکەی ئـازار ئـەدەن؟! مـن کوشـتوومە و تـەواو.

سـابیر: جایزەکـەی ئێمـە بـوو بـە چـی، نایـب؟ ئـەوە کـە خـۆی بـەدەم خـۆی هـاوار ئـەکا مـن کوشـتوومە!

نەعیم: لەبیرتان بێ من ئەوەڵین کەس بووم راپۆرتم دا.

رەفیق: بەڵام من چاو و سمێڵیم بینی، ئێوە نەتاندیوە!

نایب: شامرا بینووسە!

شامرا: بە چی قوربان؟ نێو کۆڵانە!

نایب: ببوورن کاکە گیان لەبیرم چوو، تا جەسەد نەبینرێ و لەلایەن کوڕەکەیەوە نەناسرێتەوە، پارە بە کەس نادەن!

سابیر: دە باشە قوربان، ئەوەتە مەیتەکە ها لەناو ئەو جواڵە دەری بێنن، چاک تماشای کەن، جا پارەکەی من بدەن.

رەفیق: من نە کاک سابیر، ئێمە!

نەعیم: پارەکە هی منە و ئەوان لەسەری شەڕیانە! هن!

نایب: خاڵیی کە رەمەزانەی قەمەزەنە!

رەمەزان: باشە سەرچاو!

ئەحمەد: ئەی هەی بابا! تا گۆشەی بەندیخانەش لێم نەکەن بە ماڵی وەحشەت و ئەرواح، دەسهەڵگیر نابن!

رەمەزان سەری جواڵەکە ئەکاتەوە. ئەحمەد لەترسا دەس بە هەردوو چاوی خۆیەوە ئەگرێ و سەر ئەنێتە سەر ڕانی. هەموو چاو ئەوڕن لە جواڵەکە. رەمەزان دەس ئەخا ژێر جواڵەکە و لەبەر چاوی هەموانەوە خاڵیی ئەکاتە سەر عەرز.

دەنگ و ناڵەی حەیرەت لە هەموانەوهەڵئەستێ و بەحەیرەتەوە چاوی لێ ئەکەن. ئەحمەد سەر خۆی ئەگووشێ و زات ناکا تەماشا بکا. شتەکە نیشان نادرێ و تەنیا لە چاوی شاهێدانەوە تەماشاچی تێ ئەگا چییە!

رەمەزان: فەرموو نایب، ئەمەش مەیتی حاجی! جا ئەوەتە باوەڕ ناکەن من هەر ئەڵێم پەزەپیرە، ئێوە هەر ئەڵێن حاجی حەمەکەریمە.

دەنگی پێکەنینی نایب بەرز ئەبێتەوە. ئەحمەد بە هێواش و ئەسپایی گۆشەی چاوێکی ئەکاتەوە و لە بەینی قامکەکانییەوە تماشا ئەکا و سەر و دەستی پەزەکە ئەکەوێتە بەرچاوی. بەحەیرەتەوە چاو ئەکاتەوە!

ئەحمەد: ئەمە خۆ پەزە؟!

رەمەزان: ئەی لە ئێوارەوە من چی ئەڵێم؟ منیش هەر ئەوەم وتووە.

ئەحمەد: ئەی! ئەی حاجی حەمەکەریم چی لێ هات؟

دەنگی کابرا: (لە تاریکاییەکەوە) حاجی حەمەکەریم هیچی لێ نەهاتووە!

ئەحمەد و ئەوانی تر چاو ئەبڕن لە شوێنی دەنگەکە. پێیەکان بەئارامی لە تاریکایی دێنە دەرێ.

ئەحمەد هەر لە نووکی پاوە تاکوو سەر، چاو ئەخشێنێ تا چاوی بە روومەتی کابرا ئەکەوێ، حەیرەتزەدە ئەبێ.

کابرا: حاجی حەمەکەریم ئەمەتە لێرە!

هەموو حەیرەتزەدەن.

حاجی: ئەمن حاجی ساڵحم، تەنیا رەفیق و ئەمانەتداری باوکت، تەواوی ئەم کارانەمان بۆ ئەوە کرد، بە تۆ پیشان بدەین کە ئەو چەند کەسە وا خەریک بووی هەموو شتێکت فیدایان ئەکرد، رەفیقی پووڵ و پارەی تۆن و لە تەنگانەدا نەک یارمەتیت نادەن، بەڵکوو بە هەرزانترین قیمەت ئەتفرۆشن!

رەنگ لە رووی ئەو سێ کەسەوە نامێنێ و هەر لە کاتی قسەکانی

حاجی سالّح یەکە یەکە خۆیان ئەخەنە تاریک و خۆیان ون ئەکەن.

حاجی: باوکی تۆ نەک تەنیا قەرزاری کەس نییە، بەڵکوو هەموو شتێکی بۆ هەمووتان لە لای من داناوە و هاتم وەزع و حاڵی هەمووتان رۆشنەو بکەم. کاتێ بیستم یەخسیری دەستی ئەو نامەردانەی، بە یارمەتیی مامە رەمەزان و نایب و کورەکەی خۆم، ئەم نمایشەمان بۆ تۆ ساز کرد، تا تۆ لێت حاڵی بێ، چی بە چییە، وامان نەکردایێ، دێر یا زوو، ئەم نمایشەت بەراستی ئەدی و هەموو شتێکت لەدەست ئەدا. ئەرێ رۆڵە پێم وایە ئەمشەو لە هەموو ئەفعالە کۆنەکانت، دەستت کێشابێ.

ئەحمەد بەناباوەرییەوە، چاوانی خۆی بە هەردوو دەست ئەگلۆفێ و تماشای حاجی و یارانی ئەکا.

رەمەزان: هەستە خەون نابینی، هەستە.

ئەحمەد هەڵدەستێ و باوەش بە ملی رەمەزانا ئەکا و ماچی ئەکا.

ئەحمەد: زۆر مەمنوونم مامە رەمەزان، مەمنوونی هەمووتان لە خەوی غەفڵەت خەوەرمتان کردەوە!

نایب: شامرا بینووسە!

شامرا: بە چی قوربان؟ لەنێو کۆڵانین!

هەموو دەست بە پێکەنین ئەکەن.

ئەحمەد دەست لە ملی رەمەزان و حاجی سالّح و کورەکەی، خوداحافیزی لە نایب ئەکەن.

ئەحمەد نەفەسێکی راحەت هەڵدەکێشێ و بەخۆشحاڵییەوە لەگەڵ ئەوان رێ ئەکەوێ و لە جواڵ و لاشەکە دوور ئەبنەوە.

نایب: شامرا؟

شامرا: بەڵێ قوربان، چی بنووسم؟

نایب: هیچ مەنووسە، بڕۆ یەکێ بێنە ئەو لاشە لەنێو ئەو جواڵە کۆ کاتەوە بیبا لە دەرەوەی شار بیکا بەژێر خاکەوە، هادەی!

شامرا پایەک بۆ نایب ئەچەسپێنێ.

شامرا: سەرچاو قوربان، بەڵام!

نایب: ها بەڵام چی؟

شامرا: پارەیان پێ بدەم یان نەدەم؟

نایب: دات، دات، نەیشۆ دا، نەتدا! بەڵام چی؟

شامرا: بینووسم؟

نایب: ئافەرین، تۆ لە کاری خۆتا زۆر کارزانی و ئەم مانگە لە جەریمە (سزا) و بازداشت (دەسبەسەرکردن) مەعافی! باش؟

شامرا: خودا لە گەورەیی کەمت نەکا قوربان، ئینشائەڵا دەرەجەی دنیا و قیامەتت عالی بێ و هەتاهەتایە هەر دەوڵەمەند و دەوڵەتمەرد و غەزەبناک و پیاوچاک و بەنێوبانگی عەرز و ئەفلاک بی، ئامین یارەب ئەلعالەمین!

نایب: ئەمانەت نووسیوە شامرا؟

شامرا: نەوەڵا.

نایب: (تووڕە) نەتنووسیوە؟! تا دوانیوەڕۆی بەیانی بازداشتی!

شامرا: (پا ئەچەسپێنێ) بەڵێ قوربان.

# ئەعجازی قسەزانی*

**پێرسوناژ:**

**- سوڵتان**
**- خان**
**- کوڕی خان**
**- جەماعەتی موستەقبەل**

هەموو چاوەڕێی هاتنی سوڵتانن.

کوڕێکــی چکولــەی دە دوانــزە ســاڵە کــە چەترێکیــان لەبــان ســەری گرتــووە و وا دیــارە کــوڕە خانــە، لەنێــو خەڵکەکــەدا ڕاوەســتاوە.

دەنگی هاتنی سوڵتان هەڵدەستێ.

خەڵک: هاتن، سوڵتان تەشریفیان هێنا.

سوڵتان لەگەڵ خان و چەند هاوڕێی دێنە ناو.

خـان: چـوون ئەزانـم زۆر مانـدوون لـە ناوبردنـی یـەک بەیەکـی ڕەعایـا و نۆکـەران خـوداری ئەکـەم و عـەرز دەکـەم هەمـوو ئـەم کەسـانە لـە ڕەعایای بـاش و نۆکەرانـی وەفـاداری جەنابـی سـوڵتانن.

سـوڵتان سـەریان لـێ دائەتەکێنــێ و دێتــە بــەردەم کــوڕە چکولەکــە و تماشـایان ئـەکا.

کوڕ بەتەعزیمەوە بەخێرهاتنی سوڵتان ئەکا.

کـوڕ: قـەدەم ڕەنجەتـان بەسـەر چاوانـی مـن سـوڵتانی گـەورە، ماڵمـان لـە حـزووری جەنابـت ئابـادەو بـوو!

خان: غولامی حەڵقە بەگوێی خۆتانە.

سـوڵتان: (دەسـت ئەنێتـە سـەر شـانی کوڕەکـە) ئێسـتە پێـم بڵـێ بزانـم تـۆ گـەورەی یـان بابـت؟

کوڕ: ئێستا من گەورەم قوربان!

سولّتان ئەچڵەکێتەوە و حەز لەو جوابە ناکا و دەست لەسەر شانی کوڕ هەڵدەگرێ و لەبەردەم کوڕ ڕەد دەبێ.

کوڕ سەری دادەخا و سولّتان لەگەڵ حازرین خۆشی و بشی ئەکا و خان قسەی بۆ ئەکا.

سولّتان دەورێ ئەداتەوە و بەرلەوەی لە دەرگا دەرچێ لا ئەکاتەوە لای کوڕەکە و تماشایەکی سەنگینی ئەکا.

سولّتان: ئەرێ من باش تێ نەگەییم لەوەی من پرسیم تۆ گەورەی یان بابت؟ چیت جواب دایەوە؟

کوڕ: ئەو کاتە پرسیارتان ئەمە بوو: (ئێستە پێم بڵێ بزانم تۆ گەورەی یان بابت؟) من عەرزم کردی: ئێستا من گەورەم. بەڵام ئێستا ئەگەر لێم بپرسی ئەڵێم: بابم گەورەیە!

سولّتان: (بە تماشایەکی عەمیقەوە) چۆن ئەو کاتە تۆ گەورە بووی، بەڵام ئێستا بابت گەورەیە؟!

کوڕ: ئەو کاتە دەستی جەنابت لەسەر شانی من بوو کە فەرمووتان ئێستا، ئەو کاتە گەورەیی جەنابت بەو دەستەوە لەسەر شانمت دانا تەواو وجودمی داگیر کردبوو، بەڵام ئێستا کە دەستت لەسەر شانم لابردووە، بابم گەورەیە!

دەنگی تەحسین و ئافەرین لە هەمووان بەرزەو ئەبێ.

خان زۆر خۆشحاڵ ئەبێ.

سولّتان بەخوشحاڵییەوە تماشایەکی کوڕ ئەکا.

کوڕ سەر دادەخا.

سـولْتان: (ڕوو لـه خـان) ئـەم کـوڕه زۆر عاقـڵ و دانـا و موتەفەکیـرە، خـان حەیفـە لێـرا عومـری تـەواو بـێ.

بـۆ تەواوکردنـی تەحسـیلات بینێـرە عیمارەتـی سـوڵتان کـه لـەوێ لـه ژیانـی خـۆی بحەسـێتەوە.

خان: شانازییەکی گەورەیە قوربان، بەسەرچاو.

**٭ حیکایەتی کوڕی وەکیلولمڵکی سنەیی و ناسرەدین شای قاجار**

# چەتە*

پرسوناژ:

- قوچێ کەچەڵ.. پەنجا ساڵە
- پیاوی شڕەبار.. مامناوەند
- نایب و دوو ئەمنیەی دیکە
- ژن و شووی ڕێبوار و جەوان
- پیاوی سەید
- کوڕ و کچی منداڵی سەید
- فەرماندە

قوچیّ کەچەڵ خۆی بە پیاوێکی خاس خوا ئەزانی، هەموو حەرامێکی بۆ خۆی بە حەلاڵ ئەبینی و هەموو حەلاڵێ بۆ خەڵک حەرام.

(ناو رێگا کۆنی کوێستان) قوچیّ کەچەڵ، لەنێو شاخ و داخی کێوەکا ئاوری کردووەتەوە و کتریی ڕەشی ناوەتە سەر ئاورەکە و تفەنگەکەی پاڵ داوەتە شاخە بەردێکەوە و خەریکی گۆرانی گوتنە و رێگاکەی لەژێر چاودێریدایە.

بۆ تماشای رێگای دوورتر، دووربینی درێژی یەک چاوی هەیە.

جاروبار بەرزی ئەکاتەو تماشای رێگا دوورەکان ئەکا و جاروبار سەروێنەکەی بە کڵاوەیەوە لەسەر بەرزەو ئەکا و نەختێ سەر کەچەڵی ئەخورێنێ و دیسانەوە ئەینێتەوە سەری.

دووربین بەرزەو ئەکا و تماشای دوور ئەکا و دووربینەکە و بەسەر جادە و رێگا ئەگەرێنێ.

جادە چۆڵە و کەسی تیدا نییە.

قوچیّ: (بە گۆرانی)

هەی دا و هەی بێدا و چی بکەم کەس دیار نییە

رێبوار چەور و نەرم ئەی هاوار بەرەو شار نییە

هیچ کەس وێنەی من خوا چی بکەم بێ قەرار نییە

چاوی چاوەڕێ ئەی هاوار ڕێگەی شار نییە.

دووربیـن ئەگەڕێنـی و لـە چـاوی دووربینـەو ڕێبـوارێ ئەبینـێ کـە بـە سـواری کـەر خەریکـە بـەرەو ئـەو تـێ.

قوچێ: های لە دوور لە دوور لە دوور لە دوور دیارە

بەڵام کەرەکەی چی بکەم ڕووت و بێ بارە.

جا چۆن بەبێ بار ڕێبواری شارە؟

خوا هەڵی نەگری ڕێبوار بێ پارە.

چـای دەم ئـەکا و لەنێـو قرووشـکەدا چاییـک ئەخـوا و تفەنگەکـەی هەڵدەگـرێ تـا کابـرا نەگەیشـتووە. لەنێـو شـاخ و داخ ئەچێتـە سـەر جادە و سیغارێ چاخ ئەکا و ماتڵ ئەبێ.

ئەوەنـدەی پـێ ناچـێ کابرایـەک هـەژار و ڕەشـوڕووت، بـە جلوبەرگی دڕاو و سـوار کەرێکـی پشـت ڕووت لـە دوورەوە دیـاری دەدا و وردە وردە دێـت بـۆ بـەردەم قوچـێ.

قوچـێ هـەر لـە دوورەوە تماشـای ئـەکا، بـە چـاو تـووڕە ئەبـێ و لەژێـر لچـەوە ناسـزا نسـاری دەکا!

قوچـێ: ورد! ... ورد!.... ورد! ئـەی عەمـرت نەمێنـێ بـۆ سـەر و سـواریت! تماشـا کـە، خـوا دڵـی خۆشـە بەنەیەکـی هەیـە، ئەویـش دڵـی خۆشـە کەرێکـی هەیـە، کەریـش دڵـی خۆشـە سـاحبێکی هەیـە!

کابرا: (ئەگاتە بەرەوە) ڕۆژباش برای دینی، ماندوو نەبی!

قوچـێ: کام ڕۆژ بـرای دینـی؟! ئەمـە ڕۆژە تـۆ بـۆ منـت سـاز کـردووە کاکـە؟

کابـرا: ماڵـی هـەژار و نـەداری برمـێ مامـە قوچـێ گیـان، بـەوەڵا خـۆم

قەدقـەد دائەڕزێـم کاتـێ فکـری لـێ ئەکەمـەوە، تـۆ تـا لەسـەر [illegible]

داخـە بـە هـەزار ئومێـد و ئاواتـەوە هاتویتـە خـوارێ، چەند [illegible]

شـاخ و بـەرد گیـری کـردووە، ئـازارت دیـوە، مـن شـەرمەزارا [illegible]

مامـە قوچـێ گیـان، بـەوەڵا پێـم خـۆش بـوو ئەوەنـدەم بایـا [illegible]

وشـترەو بـە ئـەم جـادا و بـە ئـەم ڕێـگا بەهاتـام تـۆ پەنجـا بار [illegible]

و مـن ئـاوا تووشـی خەجاڵـەت و شـەرمەزاریی تـۆ نەبوایـام!

قوچێ: تۆ چۆن ئەزانی من قوچێم؟!

کابـرا: ئـەی بـرای دینـی! ئـەوە بـێ و نەزانـێ ئـەم شـاخ و بـەردە

لـە قونتراتـی تۆدایـە، تەنیـا خواجـە حافـزی شـیرازە و حاتەمـی تایی،

تەنانـەت مشـک و ڕێـوی و قـاڵاو و داڵەکەرخوەراکانـی ئـەم وڵاتـە ئـاگاداری

ئیـش و کاری جەنابـت هـەن!

قوچێ: دەی ئێستا گوایا هیچ بە هیچ؟!

کابـرا: نـەوەڵا بـۆ هیـچ بـە هیـچ؟! ئەمـە خـۆم ئەمـەش کەرەکـەم، بزانـە

کاممـان بـە کارت دێـن، لـە خزمەتدایـن!

قوچێ هەڵئەسێ و سەری ئەلەقێنێ

قوچێ: برۆ برا برۆ.

کابرا: دەی چاییێک، نان و هێلکەیێ، نان و پەنیرێ، شتێ؟!

قوچـێ: بـڕۆ بـرای دینـی، بـڕۆ خـوا لـە جێگایەک تـرەوە ڕۆزیـت بگەیەنێ،

مـن بـە گـورگ و کەمتـار و خـوو و ڕێویـی ئـەم شـاخ و بەردە باجم نـەداوە،

چ بـگا بـە تـۆ! لاچـۆ گـوم بـە لـە بەرچـاوم!

کابـرا: باشـە، بـرای دینـی، باشـە خواحافیـز، (بـەدەم ڕێـوە) کاتـی نوێژ

و عبـادەت دوعـای خەیـرم بـۆ بکـە خـوا گەنـج و ماڵـێ زۆرم پـێ بـدا،

نامـەردم ئەگـەر هەمـوو ڕۆژێ دوو جـار بـە بـار و بنـەوە، لـەم ڕێـگاوە هاتوچـۆ نەکـەم!

قوچێ: هەی هەی، کەرەکە مەمرە بەهارە!

کابرا: (گۆرانی) هاتم هاتم، بە سەربەسی هاتم

ئەمزانی وا سیرە خوەتی بێ دەربەسی هاتم

قوچـێ: (بـە شـوێنیا تماشـا ئـەکا و شـتێ ئەکەفێتـە فکری)دا ڕاوێسـتە، دا ڕاوێسـتە بزانم.

کابرا: هۆش (کەرەکە ئەوێستێ)

قوچێ: ئەچێتە بەرەو.

قوچێ: ئەرێ ئەوە چیت چیت وت؟!

کابرا: وتم هاتم هاتم بە دەربەسی هاتم!

قوچـێ: ئـەوە نـە، ئـەوەی وتـت کـە تەنانـەت نازانـم چـی و چـی و گورگ و ڕێـوی ئەزانـن مـن وام لـەم شـاخ و بەردانـەدا، بۆچی مـن دزم؟!

کابرا: ئەستەغفرڵا! من کەی قسەی وام کردووە؟!

قوچـێ: ئـەی چـۆن ئەڵێـی هەمـوو ئەزانـن مـن وام لـەم کێـوا و ئەم شـاخ و بەردانـە لـە قونتەراتـی مندایە؟!

کابـرا: نـە بەڕێـزا مەبەسـت ئەمەیـە کـە هەمـوو ئەزانـن تـۆ بـە دایـم وای لەنێـو ئـەم شـاخ و بەردانـەدا و خەریکـی ڕیـازەت و عبادەتـی!

قوچێ: کێ ئەمەی بە تۆ وت؟

کابـرا: هەمـوو ئەڵێـن، هەمـوو ئـاگادارن تـۆ لەلایـەن پـەروەردگارەوە ئـەم کـەژ و کێـو و شـاخانەت پـێ قونتـەرات دراوە!

قوچی: ئەوە بەڵێ، هەرچەند حەزم لە خۆنەمایی و فەزڵ نەمایی نییە، بەڵام وا تێگەیشتم کە تۆ منت بە دز زانیوە.

کابرا: نە کاکی خۆم، من جەسارەتی وام نەکردووە. ئەوەیش کە خەڵک پێتی ئەدەن، بە دڵ ئەیدەن وە جۆرێ فدیە و سەرفیترە و حساباتی دنیا و قیامەتە، دزی چی؟! تۆ لەسەر ئەم کێوە و بۆ ئەم خەڵکە ڕیازەت ئەکێشی، هەموان لەم ڕەحمەتە گەورە کە خودا پێیانی داوە، ئاگادارن!

قوچی: حەتم وایە؟!

کابرا: ئەی چۆن؟! دز بەوە ئەڵێن تفەنگ بنێتە سەر دڵ خەڵک و بەزۆر شتیان لێ بسێنێ، دەی کوا تۆ چیت لە من سەندووە؟

قوچی: هەر ئەوە بڵێ! بەخوا نیوەی ئەو خەڵکە وا بە ناحەق من بە دز ئەزانن، گڕی ئاوری سەقەریان هەر لە دنیای ڕۆشندا بۆ خۆیان کڕیوە! من و دزی؟!

کابرا: وایە! جا بەڵام بۆ نیوەیان؟ هەر هەموویان ئەو شتەیان کڕیوە!

قوچی: باشە کاکە، باشە ئیدی بڕۆ و هەر ئەمە بڵێ، ئەگەر عومرێکت بۆ ماوە و جارێ تر لەم ڕێگاوە هاتی، چاییێکت ئەدەمێ.

کابرا: خودا لێت بەزیاد کا مامە گیان، خواحافیز، دوعای خێر لەبیرت نەچێ!

قوچی: خودات لەگەڵ، بڕۆ.

کابرا لە کەرەکەی ئەخوڕێ و ئەچێ.

قوچێ لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشتووە و خەریک چای خواردنەوەیە.

جار بەجار چاییەکەی لائەبا و دووربینەکەکەی ئەنێ بە چاویەوە و تماشای ڕێگاکە ئەکا و دیسان خەریکی خواردنەوەی چای ئەبێ...

**(شەو)**

قوچێ لەنێو مەغار چکۆلەیەکدا نوستووە.

**(بەیانی)**

هەتاو وردە وردە لەپشت کێوان دێتە دەر. جۆبارێکی باریک ئاوی لیوە دێ. قوچێ کتریی بەرداوەتە بەر ئاوەکە.

پڕ ئەکا و بەرەو جێگایەک کە ئاوری تێدا کردووەتەوە ئەکەوێتە ڕێ و بەدەم ڕێوە بۆ خوەی گۆرانی ئەڵێ.

قوچێ: گیان گیان و باوانم، های دەم چینی تازە وە هەرکەس تۆی دیوە... ئای بەدەم قەوری وازە ئەو ئاوە باریکە وەی بەرەو خوار ئەچێ... جا سێوێکی تێ خەم های بۆ لای یار ئەچێ...

کترییەکە ئەنێتە سەر ئاورەکە و بەدەم گۆرانی وتنەوە دووربین ئەخا بۆ سەر ڕێگاکان.

شتێ ئەبینێ و وردە وردە دەنگی نزم ئەبێ و زیاتر دقەت ئەکا.

چوار ئەمنیە بە تفەنگی ئامادەوە بە سواری ئەسپ لەنێو دووربینەکەدا ئەکەونە بەرچاو.

قوچێ: هاتەوە با بێتەوە، یارۆ لەنێو ڕانەوە

جا تەپانچە لە کەمەر، تفەنگ بەسەر شانەوە

زۆر ئارام ناو کترییەکە ئەکا بە مل ئاورەکا. هەرچییەکی هەیە ئەیدا بندەستی و ئەچێ بەرە سەر کێو.

ئەمنییەکان هانە ڕێوە.

قوچێ بنە گیایێ زۆر قەڵەو لە خاک دەردێنێ. ئەچێتە نێو کونایەکی زۆر تەنگی ژێر سەخرەبەردێ کە هەر لەمێژە ئامادەی کردووە.

ئەوەڵ پا ئەکێشێتە نێو کوناکە و دواییش تفەنگ و شتەکانی ئەبا و دوایی خاکی زۆر لەژێر سنگی ئەداتە بان، کونەکە ئەپۆشێ و گیاکە ئەکێشێ بەسەر کوناکە و دیسان خاک لەژێرەوە ئەداتە پای و کون کامڵ ئەپۆشرێ.

ئەمنییەکان بڵاوە ئەکەن و هەرکام لە لایەکەوە دێنە بان.

قوچێ لە کونی زۆر چکۆلەوە تماشای خوار ئەکا و لەژێر لێوەوە گۆرانی ئەچرێ.

قوچێ: جا من ماڵم بۆ چەس گەنجم بە کۆ بێ

گدایی ئەکەم چاوم لە تۆ بێ.

من لەمبەرەوە تۆ لەوبەرەوە

هەردووکمان سووتاین لەبەر خوەرەوە

ئەمنیەکان چوار چاو بە هەموو بارێکا تماشا ئەکەن و بەدەم ڕێوە شوێنی ئەگەڕێن، لە گۆشەیەک ئەسپەکان ئەوەسنەوە لەنێو شاخ و داخەکا شوێنێ ئەگەڕێن.

نەفەرێکیان ئەکەوێتە بەرچاو قوچێ و ساکت ئەبێ.

هەرسێ ئەمنییەکە لە جێگای ئاورەکە یەک ئەگرنەوە.

ئەمنیەی یەکەم: ئاوی کردووە مل ئاورەکەدا ها لەم دەوروبەرا.

ئەمنیـەی دووەم: هەمـوو جارێـک جێـگا ئـاورە تازەکـەی هەیـە، بـەڵام خـوەی لـە کوێیـە؟!

ئەمنیەی سێیەم: ها لە هەر کوێ ئەو ئێمە ئەبینێ.

چاو ورد ئەکەنەو و ئەیگەڕێنن بە هەموو بارێکا.

ئەمنیەی یەکەم: بڕۆینە بان؟

ئەمنیـەی دووەم: کام بـان؟ کوێیـەوە؟! بـەو هەمـوو شـاخ و داخـە تماشـا بـزان بـزن ئەتوانـێ پێیـا بچـێ؟ تـازە خوەمـان گەیانـدە بـان هـا لـە کوێنـەی ئـەم بانـەدا؟ ئـەوە قوچـێ کەچەڵـە سـەرکار نایـب! ئیـلا بـۆ خودا نەبێ بـۆ بەنـدەی خـودا ناگیـرێ!

نایـب: ئێمەیـش پارەیـەک لـە دەوڵـەت وەرئەگریـن و لـە قباڵـی ئـەوەدا وەزیفەیەکمـان هەیـە.

ئەمنیـەی دووەم: وایـە منیـش هـەر وا ئەڵێـم بـەڵام چـۆن؟ لـە کوێیـەوە ئـەو وەزیفـە بـەدی بێنیـن؟!

ئەمنیـەی سـێیەم: ئەفەرمـووی بـا بڕۆینـە بـان و جـوان شـوێنی بگەڕێین نایـب؟ بـەڵام ئێسـتا خـۆ خۆمانیـن و کەسـمان تێـدا غەریبـە نییـە نایـب، ئێسـتا جەنابـی فەرمانـدە لـە مـاڵ خوەیـا خەریـک عەیـش و عەشـرەتی خۆیـە، ئێمەیـش هاتووینـە ئێـرە، چـۆن ئەمـر کـراوە، ئـەوە هاتوویـن، بـەڵام کاکـە گیـان قۆچێـش تفەنگـی هەیـە و تیرەنازییـش ئەزانـێ و خـۆی لـە مەترسـیدا ببینـێ بـرای باوکـی نیـن! بـۆ خۆمـان بەینـە کوشـت؟ تـازە ئەگـەر دوو سـێ کـەس وەکـوو قوچـێ بـە کێـو و هـەردەوە نەبـن، دەوڵـەت ئێمـەی بـۆ چییـە؟ پـارەی مفتـی هەیـە؟

نایب تماشای دەمی ئەکا.

ئەمنیـەی دووەم: وایـە، لـە ڕاسـتیدا نزامـی سروشـتە، ئەبـێ قوچـێ ببێ، تـا ئێمـە ببیـن و ئەبـێ ئێمـە بیـن تـا فەرمانـدە بـێ و ئەبـێ فەرمانـدە بـێ تـا حکوومـەت بـەردەوام بـێ، حەتـا ئەگـەر قوچـێ لەبەیـن بەریـن، هـەر خوەمـان ناچاریـن بـۆ دەوامـی خوەمـان قوچێیەکـی دیکـە بتاشـین، دەی هەمـوو شـتێ هـەر کۆنەکـەی باشـترە.

نایب: باشە کاکە باشە، ئێستا ئەڵێن چی بکەین؟

ئەمنیەی دووەم: هیچ، سوڕناکەت هێناوە؟

ئەمنیەی سێیەم: من هەمە.

دووەم: تـەواوە، خەرجەکەیشـی مـن هەمـە هـەر لێـرە ئـاورێ بکەینـەوە و دوو دووکـەڵ بگریـن و دوایـی بکەوینـەوە ڕێ بـۆ پاسـگا و وەزیفەچـی!؟

هەرسێ: هەی وەزیفە! (کەنین)

قوچـێ: (لەنێـو چاڵەکـەدا) هـای هـای! جـا تریـاک کێـش بیتوانیـای لەم کێفـەوە بێتـە بـان، ئێسـتا خواوەنیشـیان لـەو بانـەوە کێشـبووە خـواری! چاکـە تـا ئـەوان خوەیـان نەشـە ئەکـەن و ئـەڕۆن، منیـش چورتـێ بـەم، هەرچەنـد دوو سـێ سـەعات لـە ئێـش و کار و ئەکـەوم، بـەڵام ڕۆژی بـەدەس خودایـە! چـی ئەکـرێ کاتـێ کـە زاڵـم زۆردار بـێ؟!

ئەمنیـەکان بـەدەور کـۆگای ئـاور دانیشـتوون و سـەریان کردووەتـە یـەک و واقـوور ئـەدەن بـەدەم یەکتـرەوە.

نایـب: بـۆ مـن سـەخت نیـە هـەر ئەلعـان هەسـتم خـۆم بگەینمـە ئـەو نووکـەو پەیـدای کـەم و تیـری خەلاسـی لـێ دەم!

ئەمنیـەی دووەم: هـەر وەکـوو ئـەو سـاڵەی خـۆم! کێـوی چـی؟! بـۆ

ئەمانـە کێـون؟! هـەن! یـەک سـەری لـە عـەرش، ئەوسـەری لـە فـەرش! ئـای چیـم کێـش ئـای چیـم کێشـا تـا چوومـە نـووک و ئـای چیـم کـرد! کاتـێ کار خۆمـم تـەواو کـرد و هاتمـە خـوارێ.

فەرماندە: ئا ئا ئا (باڵ ئەکاتەو) ئا ئەوەندە دەمی ماق!

ئەمنیـەی سـێیەم: ببـوورە کام سـاڵ؟ لـە کـوێ کام کێـو؟ ئەڵبـەت ئەزانـم چیـت کێشـاوە، بـەڵام چیـت کردبـوو کـە فەرمانـدە دەمـی مـاق مابـوو؟!

ئەمنیەی دووەم: یانێ ئەتەوێ بڵێی من درۆ دەکەم؟

ئەمنیـەی سـێیەم: ئەسـتەغفرڵا! تـۆ کام جـار ڕاسـتت وتووە کـە ئەمجارە درۆ بێ!

ئەمنیـەی دووەم: یانـێ تـۆ نەتبیسـتووە مـن ئـەو سـاڵە بـە تـەک و تەنیا سـێ چەتـەم لەسـەر کێو کێشـایە خـوارێ؟!

ئەمنیـەی سـێیەم: بـۆ وەڵا دەیـان جـار بیسـتوومە، بـەڵام هـەر لـە دەمی خـۆت، عەڵبـەت هـەوەڵ جـار دوازدە نەفـەر بـوون، دووەم جـار هەشـت کـەس بـوون، هـەر وا وردە وردە هێناتـە خـوارێ و ئەمجـارە بـوون بـە سـێ نەفـەر! بـەڵام هەرگیـز بۆمانـت ڕوون نەکـردەوە، ئـەو کێـوە وا سـەرێکی لـە عەرشـە و ئەوسـەری لـە بـان فـەرش، وا لـە کوێنـەی دنیـا و ئـەو دوازدە تـا سـێ نەفـەرە کێهـا بـوون؟! (ڕوو لـە نایب) دەتـان فەرمـوو نایب؟

نایـب: هیـچ، مەبەسـتم ئەمەیـە کـە ئەتوانـم، بـەڵام قسـەکانی ئێـوە ڕاسـتە، بـۆ ئـازاری زامـی ڕزق و ڕۆزیـی خۆمـان بـدەم؟ بـا ئـەو لەوسـەرەوە ئیشـی خـۆی بـکا و ئێمەیـش ئیشـی خۆمـان.

ئەمنیەی سێیەم: وایە.

ئەمنیـەی دووەم: گـوێ گـرە هاوقەتـار، ئـەوەی کـە یـەک جـار دوازدە نەفـەر و یـەک جـار هەشـت و یـەک جـار پەنـج و یـەک جـار سـێ نەفـەرم وتـووە، ئـەوە هـەرکام شـەڕی جیـاواز بـووە کـە خـۆم بـە تەنیـا کردوومـە و بۆتـم تاریـف کـردووە!

ئەمنیـە سـێیەم: بەڵـێ وایـە! (بەتونـدی تماشـای پشـت سـەری ئەمنـی دووەم و بەترسـەوە دەسـت ئەباتـە بـان و ئەڵـێ) نەکـەی قوچـێ، نەکـەی قوچێ!

ئەمنیـەی دووەم کـە خەریکـە چـورت لـێ ئـەدا بەبـێ ئـەوەی لا بکاتـە و هـەردوو دەسـتی ئەباتـە بـان و بەبـێ حاڵـی ئەڵـێ: تەسـلیم تەسـلیم.

نایب و ئەمنی سێیەم دەست ئەکەن بە پێکەنین

ئەمنیـەی سـێیەم: (بەقاقـاوە) بەخـوا زۆر شـوجاعی عەسـکەری، بـە فەرمانـدە ئەڵێـم لەقەبـی شـوجاع لەشـکرت بـۆ لـە شـا وەربگـرێ!

ئەمنیـەی دووەم: باشـە باشـە لوتفـی زادە، منیـش وەختـی خـۆی پەتـەی تـۆ ئەخەمـە سـەر ئـاو، نەوبـەی منیش ئـەگات!

ئەمنیـەی سـێیەم: عەڵبـەت جەسـارەت نەبـێ لـە حـزووری نایبـدا، منیش جـار بەجـار دووکـەڵ بـەر چـاوم تەمـاوی ئەکا و شـتهایێ سـەر لـە خەیاڵاتم ئەشـێونێ! بـەڵام نەوەکـوو تـۆ! تـۆ حـەوت حـەوت ئەکـوژی و هـەر دەمـی دەگـری و یەکێکـی پـێ زیـاد دەکـەی کاکـە! وا نابـێ، دەرویـش ئەبـێ سـایزی خـۆی بـێ تـا بـاوەڕی پـێ بکـرێ، وا نییـە نایـب!

نایب: بەڵێ وەڵا وایە.

هەرسـێ سـوار چـاروا، بـە چـورت لێدانـەوە لەنێـو ڕێـگا دوور ئەکەونـە بـەرەو مەحـەل و مەکانـی خۆیـان..

لەسەر کێوانەوە دەنگی کەو دێ.

قوچێ لەنێو شاخ و داخەکاندا بە نەختێ قەیتان و بازێ چڵ و چیو داوی بۆ کەو داخستووە و خۆی لەپشت تلەبەردێ شاردووەتەوە و کەف دەستی خۆی ناوەتە بان دەمییەوە و بە دەست و دەم دەنگی کەو لەخۆیەوە دەردێنێ.

دوای چەند ساتێ یەک دانە کەو ئەخاتە داو.

کەو گیر ئەکا و قوچێ بۆ لای دەچێ.

قوچێ: مەرحەبا کەوە گیان، ببوورە توو خوا زۆر ئەمڕۆ برسیم و بەناچاری پەنام بۆ تۆ هێنا، دوعای خێرم بۆ بکە خودا بە گوناحی دانەنێ بۆم، ئافەرین کەوە گیان.

## (سەر جۆگەی ئاو)

قوچێ کەوی قوشکەن کراو ئەنێتە سەر بەردێ.

ئەچێ بە شوێنێکا لەژێر بەردێ کیسەیەک ئارد دەردێنێ و کاسەیەکی لێ پڕ ئەکا و ئاردەکە ئەکا بە هەویر و دوایی ئەچێ بۆ سەر چاڵێ کە ئاوری تیدا کردووەتەوە.

ئاورەکە بە گڕوگیا لەو جێگە لا ئەبا و ژێری ئاورەکە بەردی سافی ڕۆخانەیە.

هەویرەکە وەکوو کولێرە پان ئەکاتەوە و ئەیخا سەر بەردەکان و بەردە ڕیخێ کە هەر هی ڕۆخانەیە ئەچنێ بەسەر هەویرەکا و ئورەکە ئەکا بە ملیدا و ئەچێ لە شوێنێ ترا ئاور بەرپا ئەکا و کەوەکە بەسەر چێوێکەوە ئەگرێتە بان سکڵی ئاورەکە و مەشغووڵی برژاندن ئەبێ.

تا کەو ئەبرژێ، ئەچێ بە شوێن نانەکەیا ئاورەکە لەسەر ڕیخەکان لا ئەبا، هەویرەنانێکی زەخیم و کوڵفت لەژێر ڕیخەکان دەردێنی و ئەکەوێتە خواردن.

تێر ئەخوا و چایێک بە ملیا ئەڕێژێ، قورقێنەیەک با ئەدا و سەر بۆ ئاسمان بەرزەوە ئەکا: خوایە هەزار جار شوکرت. جا ئیسە دوای سەعاتێ خەوتن نۆبەی ئیش و زەحمەتە، خوایە بۆمی بگەینە!

پیاوێکی جەوان جڵەوداری قاترێکە کە ژنێکی جەوان و تازەبووک لەسەری سوارە.

بەدەم ڕێوە ئەگەن بە سێ ڕێگانێ.

کابرا نەختێ پا کورت ئەکاتەوە و لە نزیک سێ ڕێگانەکەو ئەوێسێ و ڕوو لە ژنەکەی ئەکا.

پیاو: جا ئێستا نازانم، لەملاوە بڕۆین یان هەر وا ڕستەوخۆ؟

ژن: خۆت ئەزانی.

پیاو: لەملاوە بڕۆین زیاتر لە دوو سەعات دیرتر ئەگەینە ئاوایی، چۆن ئەبێ ئەم کێوە دەور بەینەو.

ژن: دەی بۆ هەر لەو ڕێگەو کە هاتین ناچینەوە؟ خۆ هەر لەم ڕێگەو هاتین.

پیاو: هاتن دەوروبەری دە نەفەر ژن و پیاو بووین زاتی ئەوەمان نەبوو بەرمان پێ بگیرێ، بەڵام ئێستا دوو نەفەرین!

ژن: لێی دەترسی؟!

پیاو: لە خۆی نە، ترسم لە چەکەکەیە، ئەویش نە لەوەی بۆ خۆم

بترسم، ترسم لەوەیە تۆ بەر تیری کەوی!

ژن: ئەها، دەی باشە، دەترسی لەملاوە برۆ.

پیاو: نە، ئێستا وازانی بۆ خۆم دەترسم! هەر لێرەوە ئەڕۆین، (ڕێ ئەکەوێ)

ژن: من نەموتووە تۆ ئەترسی!

پیاو: هەم وتت، هەم بە حەرەکات پێمت سەلماند، قەیدی نییە، حەز ناکەم ژنەکەم کە تازە بووکە من بە پیاوی ترسەنۆک بزانێ!

ژن: ئەی چۆن ئەڵێن ژن لەگەڵ ڕێبوار بێ، کەس کاری پێوە نییە؟!

پیاو: نازانم خودا بیکا وابێ، ئەم هەموو پارەمانە بەخت کرد، بزانە توانیم یەک دانە چەک بکڕم بۆ ئاوا ڕۆژانێ!

ژن: مەشیا بەر لەوەی ژن بێنی، چەکت بسەندای بە پارەی یەک چەک ئەکرێ سێ ژن بێنی، بەڵام بە پارەی یەک ژن هەر ئەو یەک ژنە ئەتوانی بێنی.

قوچێ جۆرێ نوستووە کە گوێی لەسەر خاکەکەیە بە تێکڕا چاو ئەکاتەو. نەختێ ژێر سەرەکەی ئەماڵێ و جارێکی تر گوێ ئەنێتە سەر عەرزەکە و هەست بە دەنگی سمی قاترەکە بەسەر عەرزا ئەکا.

هەڵدەستێ و دووربینەکەی ئەبا و ئەچێتە سەر بەرزاییێک و دووربین ئەخا.

لەنێو لێنزی دووربینەکەوە چاوی بە ژن و پیاو و قاتر ئەکەوێ و لە قاپی دووربینەکەوە چاو ئەخشێنێ بە هەموو جێگایکی ئەواندا نەوەکوو چەکیان پێ بێ.

قوچێ دووربینەکە لائەبا.

قوچی: خوایە بە ئومێدی خۆت.

بەپەلە دێتە خوارەوە.

تفەنگەکەی و بەرماڵە شرەکەی هەڵدەگرێ و ڕائەکاتە خوارەوە کە خۆی بگەینێ بە سەر ڕێگاکە.

کابرا، قاتر بە شوێن خۆیا ئەکێشێ و هەر بە ترس و خۆفەوە تماشای دەوروبەری خۆی ئەکا.

ژنەکە چاو بە هەموو بارێکا ئەخشێنێ.

قاتر عەرز ئەکوتێ و پێش ئەچێ.

ژن: ئەی چۆن ئەڵێن قوچێ کەچەڵ موسڵمانێکی زۆر باشە؟

پیاو: ناوی مەبە ژنەکە، ناوی مەبە!

ژن: بۆ؟

پیاو: ئەمەت نەبیستووە وەسە جن هەر ناوی ببەی، دیاری دەدا؟!

ژن: نە.

پیاو: دە باشە ناویشی ئەبەی کەچەڵەکەی مەڵێ، هەر بڵێ مامە قوچێ.

ژن: بۆ؟

پیاو: بۆ ئەوەی ئەو کابرا حازر بە دیتن و بیستنی عەیب و نەقسی خۆی نییە! ببیسێ وتووتە کەچەڵ، ئیدی لە ملەوە نابێ، ئەویش ئەڵێن موسڵمانێکی باشە، بۆ ئەوەیە پێی خۆشە هەموو شتێ بۆ خۆی شەرعییەوە بکات و تەنانەت سەر خودا کڵاو بنێ! ئەمانەم من خۆم لە عالەمی دینی بیستووە، لە مەلا بورهان چۆڵە دێ!

چاوی ژنەکە شتێ لە دوورەوە ئەبینێ.

ژن: ئاوە چییە لەوسەر ڕێگاکە پیاوەکە؟

پیاو: کام؟

ژن: (ئەشارە بۆ دوور) ئەو بەرانبەرە تماشا کە!

پیاو چاو ورد ئەکاتەو بۆ شوێنی ئەشارەی ژنەکە و قوچێ لە حاڵی نوێژ خوێندنا ئەبینێ.

پیاو: ئەی دا و بێدا! خۆیەتی!

نەختێ پێ کۆتا ئەکا.

ژن: ئەگەر ئەوە بگەڕێوە، لەولاوە ئەچین!

پیاو: نە ئیدی ناکرێ، بەڵام چاکە نەختێ تون بڕۆین کە تا نوێژەکەی تەواو نەبووە، لێی دوورەوە کەوین!

ژن: دەی وا بکە.

پیاو ئەکەوێتە پشت سەر قاترەکە و بەتوندی لێ ئەخوڕێ.

پیاو: هێ، هێ.

ژن: نوێژەکەی نابڕێتەوە؟!

پیاو: ئەگەر بە قەولی تۆ موسڵمانی چاک بێ، ئەبێ نەیبڕێتەوە!

قوچێ لە کەناری ڕێگەکەوە خەریکی نوێژ خوێندنە و چەکەکەی ها بەلای دەسیەوە!

پیاو بە شوێنی قاترەکەیدا لێی نزیکەوە ئەبێ.

قوچێ: ئەڵاهوو ئەکبەر، ئەڵاهوو ئەکبەر، ئەڵاهوو ئەکبەر.

## (ئەچێتەوە سوجدە)

قاترەکە لێی نزیک و نزیکترەوە ئەبێ.

قوچێ: (لە سوجدەوە هەڵدەستێ) ئەڵاهـوو ئەکبەر. (قاتر بەلای دەسیدا ڕەد ئەبێ و قوچێ دەنگ بەرزەوە ئەکا): ئەڵاهوووو ئەکبەر!

## (سوجدە هەستان)

کابرا ئەدا بەلای دەستیدا.

قوچێ توورە ئەبێ و بە دەنگی بەرزتر هاوار ئەکا: "ئەڵاهوو ئەکبەر".

کابرا گوێی پێ نادا و خەریکە دوور بکەوێتەوە.

دەستی قوچێ ئەچێ بەسەر تفەنگەکا و تیرێ ئەتەقێنێ.

قاتر و ژن و پیاو دائەچڵەکێن.

قوچێ: (بەدەم نوێژەوە) مەگەر لەگەڵ تۆم نییە سەگباب؟!

وتم: ئەڵاهوو ئەکبەر!

کابرا بە ترس و خۆفەوە بەر قاترەکە ئەگرێ و لەنێو ڕێگاکە ڕائەوەستێ.

ڕەنگ لە ژن و پیاو ئەپەڕێ و خۆف سەروچاوی کابرا دادەپۆشێ.

قوچێ زۆر ئارام و مەتین نوێژەکەی دوایی دێنی و بە سەلام و سەڵەوات بەرماڵەکەی جەم ئەکاتەوە و ئەخا سەر کوڵێ، تفەنگەکەی ئەگرێ بە دەستەوە و لا ئەکاتەوە بەرەو لای ژن و پیاوەکە و زۆر بە محەبەت و میهرەبانی ئەپرسێ؟

قوچێ: کارێکت بە منە کاکە گیان؟

پیاو: بەڵێ؟!

قوچێ: پرسیم ئیشت بە منە؟

پیاو: نەوەڵا!

قوچێ: ئەی بۆ ڕاوەستاوی؟!

پیاو: ببوورە مامە گیان وا تێگەیشتم کە جەنابت کارت بە من بێ!

قوچێ: من؟ من چ کارێکم بە تۆ دەبێ قوربانت بم؟!

پیاو: چەند جار بەتوندی فەرمووت "ئەڵاهوو ئەکبەر" و تیرێکت خالیەوە کرد و دژوێنێکت دا، وا تێگەیشتم لەگەڵ ئێمەت بێ!

قوچێ: ئەی شەرمەندە خۆم، ئەی خەجاڵەت خۆم، ئەی ڕووڕەش خۆم، جا من کە تەواو عومرم ئازارم تەنانەت بە مێروولەیەک نەگەیاندووە، چۆن لەخۆمەوە ئەبێ دژوێن بە خەڵک بدەم؟ ئەها تێگەیشتم! مەگەر نەتبینی؟!

پیاو: چی قوربان؟

قوچێ: دات بەلاما، ئەو مارە قەڵەوتە نەدی لەسەر بەرماڵەکەم؟!

پیاو: نەوەڵڵا! ماری چی؟!

قوچێ : ئەی بەساقەو بم، سوجە مارێکی قەڵەو هاتبووە سەر بەرماڵەکەم، ماتڵ بوو بچمە سوجدە و بدا بە سەر و کاپۆڵمەوە! دەنگم بۆی بەرز کردەوە کە بزانێ لە حاڵی عیبادەتدام! دیم گوێم لێ نادا، خوڕیم بەسەریا و پێمگوت "مەگەر لەگەڵ تۆ نیم سەگباب" تڕێکم بۆی خاڵیەو کرد! دڵم نەهات بیکوژم، بەڵام ترساندم و دەرچوو، تۆ وات زانیوە لەگەڵ تۆمە، ئەی داد و بێداد! وەرە وەرە (ڕوو لە ژن) وەرە کچم پێم وایە تۆشم ترساندبێ! (ڕوو لە پیاو): کێیە کوڕم؟

پیاو: وەڵا ژنمە مامە گیان تازەبووکە و دووگیانە.

قوچێ: کورە نەڵێی؟!

پیاو: بەڵێ وەڵا!

قوچێ: ئەی داد و بێداد چ پەنێکم داوە! من تاکوو ئێستا قەد تازە بووکی دووگیانم نەدیوە، وەرە ڕۆڵە، وەرە کچم.

پیاو: لەغاو قاترەکەی ئەگرێ و ئەیکێشێ بەولای.

قوچێ: درۆم نەکردبێ لە دزەباوانێ هاتوونەتەوە، یان بۆ دزەباوانێ ئەچن؟

ژن: سەلام مامە گیان.

قوچێ: سەلام کچە شیرینەکەم! پیرۆزباییتان پێ ئەڵێم و هیوادارم بە پای یەکتر پیر بن.

کچەکە دەستماڵێ سورمەیی لەسەر لووت و دەمدایە.

قوچێ : ماشەڵڵا، ماشەڵڵا خوا تەختەتاش نییە، بەڵام دەرگا و گێجەنە چاک ئەخاتە یەک، لە خوام تەڵەبە لە چاوی پیس بەدوور بی و هەتاهەتایە پێکەوە وەکوو هەنگ و هەنگوین بژین! (ڕوولە ژن): من دەناسی کچەکەم؟!

ژن: نەوەڵا، بەڵام ئەوەی لەبارەی مامە قوچێوە بیستوومە بە ڕەفتار و کرداردا پێم وایە مامە قوچێ بی، وایە؟

قوچێ: مامە قوچێ؟ چیت لەبارەی مامە قوچێوە بیستووە؟

ژن: ئەوی کە ئەڵێن مامە قوچێ زۆر دیندار و بەئیمانە! ئەوەی کە ئەڵێن هەموو ژیانی بۆ هەژار و فەقیر و داماوە! ئەوەی کە ئەڵێن موسڵمانێکی زۆر باشە و خۆشەویستی خودایە!

قوچێ: (روو لە کابرا) وایە؟

کابرا: بەڵێ وەڵا مامە گیان، ئەگەر جەنابت مامە قوچێ بیت بۆ ئێمە شەرافەتدارە و خەیرمان دێتە ڕێ کە تۆ هاتیە ناو ڕێمان!

قوچێ وردە وردە زیز ئەبێ و بڕۆ ئەکێشێتە نێو یەک.

قوچێ: بۆ مامە قوچێ ڕێویە بێتە ناو ڕێ شەرافەتدارە و خێر و خۆشی ئەبەخشێ؟

ژن: مەبەستی ئەوە نەبوو مامە گیان! مەبەستی ئەوەیە کاتێ خاس خوایی لەسەر ڕێگای خۆتا ببینی، ئەبی بە ساحب شەرەف و گەنج و ماڵ.

قوچێ: ئینشاڵڵا ڕۆڵە، ئینشاڵڵا... من قابلی چیم خاس وایم، خەڵکەکە خۆیان باشن و خاس خوان کە ئاوا منیان قەبووڵە ڕۆڵە.

ژن: وایە مامە گیان، بەڵام مەیلی خودایی پێوەک ئەوەندە قسەی پیاوچاکیت لەنێو خەڵکدا هەیە.

قوچێ: خەڵکەکە خۆیان باشن ڕۆڵە، دەنا من قابیل بە چیم؟ دۆعای خەیری خەڵکەکە بووەتە باعیس خوانتەعالا گۆشە چاوێکی بەم هەژار و داماوە بێت! ئەنێ خۆ بۆ خۆم دەیزانم ئەگەر تەواوی عومرم بەسەر سەجادە و بەرماڵەوە خەریکی نوێژ بم، بەقەد دۆعای خێرێکی خەڵک نە لە دونیا و نە لە قیامەتدا بەکارم نایەت!

پیاو: بەڕاستتە مامە گیان.

قوچێ: بۆ؟

پیاو: کاتی نوێژ خوێندنەکەت، عالەمتە، توخوا لێم ببوورە مامە گیان، بەڵام چۆن بڵێم!

ژنەکە چاوی لێ دادەگرێ کە هۆشی دەمت بێ!

قوچێ: بڵێ ڕۆڵە بڵێ کاتی نوێژ خوێندنەوەکەم چی؟

پیاو: ڕوو بە قیبلە نەبووی!

قوچێ: (بەتووڕەیی) یانی چی؟ یانی دوای چەندین و چەند ساڵ ڕیازەت و عیبادەتی خواوەندتەعالا بەقەد تۆی لێ نازانم؟!

پیاو لاڵ ئەبێ و نازانێ چی بڵێ.

ژن سەری لە شووەکەی دەلەقێنێت!

قوچێ: (بە ئیشارەی قامک) ئا ئەو تەنیا دارە لەو دوورەوە ئەبینی؟

پیاو: ئەو تاقەدارە تەماویە؟

قوچێ: بەڵێ، ئەوە قلێی منە!

پیاو: ببوورە مامە گیان، قلە هی قومارە، ئەبێ بڵێی قیبلە!

ژنەکە بەنهێنی گۆنای خۆی دەڕنێ.

قوچێ نووک تفەنگەکەی تێرێتە بان و مۆڕێ لە کابرا ئەباتەو!

ژن: نە نە پیاوەکە وا نییە، قلە هی قومار نییە! قلە یانی نیشان مەبەستی مامە قوچێ ئەمەیە کە بۆ پەیداکردنی قیبلە ئەو دارەی نیشانە داناوە! بەڕاستە عەلبەت تا من بڵێم جێگە نوێژەکەی بەرەو ئەو دارە کامە! ئا ئەوەیە لەسەر ئەو تەپۆڵکە، مامە لەوێ نوێژ ئەخوێنێ، وایە مامە گیان؟

قوچێ : ئەی ڕەحمەتی خودا لەو باب و دایکە واکوو نانی تۆیان داوە ڕۆڵە! ئەرێ تۆ بەم هەموو عەقڵ و فام و داریەتەوە چۆن مێردت کردووە بەم کافرە بێ لەعینەی خودانەشناسە؟! ئەمە خۆ زۆر نەفامە!

ڕەنگ بە ڕووی کابراوە نامێنێ!

ژن: بۆ خۆت کە پیاوی خوای چاک دەزانی مامە گیان کە فام نیشاندان بە یەک نەفام، سەواوی حەفت جار گەڕان بە دەوری کەعبەی هەیە، بۆیە مێردم پێ کردووە!

قوچێ: (روو لە پیاو) قەدر و حورمەتی ئەو ژنەت بزانە کەرە! تۆ زۆر زۆر کەری! من بەقەد عومری تۆ بەتەنیا لە بەین ئەم شاخ و بەردانە ریازەم کێشاوە، عیبادەتی خوام کردووە، بە من ئەڵێی قلە هی قومارە و قیبلە ناناسی! دەی ئەوە ئەگەر کفر نییە و ئەگەر شەڕ لەگەڵ خودا و بەندەی خودا نییە چی پێ ئەوترێ؟ بە فیتوای دین ئەوا ئێستا خوێنت بە من حەڵاڵە، بەڵام ئەتبەخشم بە گۆشەی ڕووبەند و چاوی جوانی ئەو ژنەت و لە خوێنت گوزەشت ئەکەم.

ژن: خودا لە گەورەیی کەمت نەکا مامە گیان، من کەمێک ناساقم ئەگەر ئیزنی چوونمان بدەی، زۆر مەمنوونت دەبین!

قوچێ: تۆ بڕۆ ڕۆڵە، کەس بەرگیریی تۆی نەکردووە، بەڵام ئەم کابرا ئەبێ بزانێ لەگەڵ کێ چۆن بدوێ و چۆن قسە بکا.

کابرا تماشایەکی ژنەکەی ئەکا و تفی ناو دەمی خۆی بە زۆر قوت ئەدا.

قوچێ: تۆ وا ئەزانی من چۆن بە تەک و تەنیا دە ساڵە لەنێو ئەم کێو وهەرد و بەردانەدا ژیاوم؟! جار وایە چەند لە خودا بێخەبەر پاسگای ئەمنی، وتوویانە من دزم و شکایەتیان لێم کردووە، حکوومەت لەشکەری کێشاوە ئەم کێوە من بگرن! بێ ئەوەی دەرچم و ڕاکەم و خۆم لە چاوی کەس بشارمەوە هەروا لەسەر بەردێک ڕاوەستاوم، بەڵام ئەو ئەمنیانە چی؟ منیان نەدیوە! خاس خوا ئەبێ چۆن بێ؟

کابرا: دەی خۆ من نەموتووە تۆ خاس خوا نیت مامە گیان؟

قوچیّ: نە نە ڕاوەستە قسەم ماوە، تۆ بێ ئیمانی و کافری.

کابرا: نەوەڵڵا وا نییە.

قوچیّ: (تفەنگەکەی لە سەر کابرا نزیکەو ئەکا) وا نییە؟ وا نییە لەعین؟ وا نییە؟

کابرا: وایە بەڵام ...

قوچیّ: بەڵام و بڵە! تۆ وا ئەزانی من لەم کێوانەدا چی ئەخۆم، ها؟ هەموو ڕۆژێک یەک دانە خورما! ئەویش خورمایەک کە خەڵک بۆمی دێنن!

ژن: وایە مامە گیان قەد کەس ناتوانیّ بە ڕۆژێ یەک دانە خورما بژی، مەگەر ئەو کەسە لەژێر چاوەدێریی پەروەردگارا بیّ، چونکوو فەرماییشی پەروەردگارە کە تۆ ئەگەر ئیمانت بە من بیّ لەنێو دوو بەردی وشکدا ڕزق و ڕۆزیت بۆ دەگەینم! ئەوەتە مامە گیان تۆ ئیمانت بە خودا هەیە و خودایش ناهێڵی برسی و تینوو بیت.

قوچیّ: ئەی باب و دایکت بەڕەحمەت بن، ئا تۆ چۆن شووت کردووە بەم کەرەی نەفامە؟! بەم کافرەی لەعینە؟!

کابرا دەم ئەکاتەوە شتێک بڵیّ.

قوچیّ: وس...! وس لەعین!

ژن: قەیدی نییە مامە گیان، بیبەخشە بە من.

قوچیّ: بە یەک شەرت ئەیبەخشم، بەو شەرتەی ڕاستگۆ بێت و درۆم لەگەڵ نەکا! (ڕوو لە کابرا) چی ئەڵێی؟ قەبووڵە؟

کابرا: باشە سەرچاو درۆ ناکەم.

قوچیّ: جا خوامە خوا درۆم لەگەڵ بکەی!

پیاو: نە درۆ ناکەم، یانی درۆ نازانم.

قوچیێ: درۆ نازانی ها؟! ئەڵبەت من ئەتوانم هەر پرسیارێکم کە هەیە لەو کچە بیکەم و ڕاستیم پێ بڵێ، بەڵام لە تۆی ئەکەم کە ئەویش بزانێ بەڵام درۆ نەکەی، هەر درۆ ئەزانی! یەکەم پرسیار: لە کوێ بوون؟

پیاو: عەرزم کردی لە دزەباوانی.

قوچیێ: لە کوێ؟

پیاو: لە ماڵ خزم و کەس و قەوم و کار.

قوچیێ: لە کوێ؟ شار یان دێهات؟

پیاو: شار، لە شار بووین.

قوچیێ: ئێوە خۆتان خەڵکی دێهاتن، چۆن دزەباوانیتان لە شار بووە؟

پیاو: ماڵ باب و برایانی کەیوانۆم لە شاردا دەژین.

قوچیێ: بۆ؟ بۆ ئەبێ خەڵکی لادێ بچێ و لە شاردا بژی؟

پیاو: زەوی و زار چاکیان نەبوو، دێهات بۆیان نەکرا، چوونەتە شار.

قوچیێ: کاتێ کە هەموو خەڵکی لادێ ڕووو کەنە شار و شارۆچکەکان و دێهاتەکان چۆڵ کەن، ئەی ئەوانەی وا لە دەوروبەری دێهاتەکاندان ئەبێ چۆن بژین لەعین؟

پیاو: دەی خۆ من نەیانم هەناردووەتە شار، خۆیان چوونەتە شار!

ژن: ئەمەیە بەڕاستە مامە گیان من شایەت ئەدەم کە لەم کارەدا ئەم بێ خەتایە.

قوچیێ: پرسیارێکی تریشت لێ ئەکەم جا خوامەخوا جوابی ئەمەت

ڕاست نەبێ!

پیاو: باشە

قوچێ: هەدیە و پێشکەشی شار باشە یان دێهات؟ کامی زۆرترە؟

پیاو: دێهات، هی دێهات باشترە.

قوچێ: (لوولەی تفەنگەکەی لەسەر کابرا نزیک ئەکاتەوە) ئەی چۆن ئەڵێی لە دێهات ژیانیان بۆ نەکراوە چوونەتە شار لەعین؟

ژن: نە مامە گیان، ئەوە قەدیم بوو دێهاتەکان باشتر بوو، ئێستا شار باشترە!

قوچێ: ئەرێ من سەرم سووڕ ماوە تۆ چوون شووت کردووەتە ئەم کەرەی درۆزنە؟

ژن: چی بڵێم مامە گیان، وابێ ناچار ئەبم تەڵاقی لێ بسێنم.

قوچێ: ئەی ڕەحمەت لەو شیرەی پێی گۆش کراوی!

پیاو: مامە گیان خۆت بچۆ سەر ئەسڵ مەتڵەب، یانی نووکەکەی و ئەوەندە کێشی مەهێنە، باکوو بڕۆین بە شوێن ئیش و کاری خۆمانا!

قوچێ: باشە، پێم بڵێ بزانم دەستکەوتی ئەم دزەباوانیە بۆ ئێوە چی بووە چەندتان کەوتە دەست؟

ژن و پیاو تماشای یەک ئەکەن.

قوچێ: ماتڵی جوابم!

پیاو: شتێکی وا نەبووە.

قوچێ: کوا؟

پیاو: چی کوا؟

قوچێ: پووڵ و پارەی دەسکەوتەکەتان؟

پیاو: (دوای نەختێ ترس و تماشا) بۆ؟

قوچێ: بۆ؟! بۆ ئەوەی بزانم ئەوەی بەو کچە باشەم دراوە لە شانیدا هەیە یان نە؟ چونکوو خۆی ژنێکی زۆر بەقیمەتە، ئەبێ پارەی بەقیمەتی پێ بدرێ، ئەگەر وا بوو هیچ، ئەگەر وا نەبوو هەرچی پووڵ و پارەم هەیە پێشکەشی ئەکەم، من لەم شاخ و داخا پارەم بۆچییە؟ پارە بۆ من چی دەکا؟ دەی با بۆ ئەو بێ کە لەنێو گەلدا ئەژی و هاتووچۆی شار ئەکا! بیدە بە من بزانم.

پیاو: بەلای منەوە نییە!

قوچێ: (تووڕە) ئەی ها بەلای کێوە؟

پیاو: لە لای لە لای خۆیەتی.

قوچێ: (روو لە ژن بە مەبستەوە) بیدە بە من باوکمەساقەت، بیدە.

ژن ئەکەوێتە ناو ڕوودەربایست و دەست بە باخەڵی کەواکەیدا ئەکا و کیسەیەک دەردێنێ و ئەیدا بە دەست قوچێیەوە.

قوچێ: هەر ئەمەیە؟

ژنەکە سەری بۆ دائەتەکێنێ.

قوچێ: (روو لە پیاو) باقییەکەی؟

پیاو: باقیی چی؟!

قوچێ: باقیی ئەم پێشکەشی و پارەی کە بەو کچە دراوە، ناهێڵم تۆ تەماعی لێ بکەی!

پیاو: هەر ئەوەیە.

قوچێ: هەر ئەوەیە؟! وتت منیش باوەڕم کرد! بێنە بزانم.

پیاو: هەر ئەوەتە دراوە بە خۆی.

قوچێ: ئەوە چییە لەبەر پاتۆڵەکەتەوە قوتەو بووەتەوە؟

پیاو: (نەختێ تماشای بەر پاتۆڵەکەی ئەکا) کوا مامە گیان؟ چی قوتەو بووە!

نووک لوولەی تفەنگەکەی ئەنێ بە بەر پیاوەکەوە.

قوچێ: ژنەکە بەر کە ئەولاوە.

پیاو: عەیبە مامە گیان ئەوە چی ئەکەی؟

قوچێ: دەستت لاوە ئەم تفەنگەی من بە گۆشت حەساسە خۆ لە خۆ ئەتەقێ! دەستت لاوە.

نووک لوولەکە ئەکوتێ بە نێو پای کابرا، نەختێ ئەیگەڕێنێ لەناکا تەق تەقی جیاواز لەنێو پای کابرا بەرزەو ئەبێ.

قوچێ: ئەوە چییە ئەوە دەری بێنە بزانم.

پیاو ناچار ئەبێ پشت هەڵئەکا و کیسەیەک پڕ لە پارە لە نێو شواڵەکەی دەردێنێ و ئەیدا بە دەس قوچێوە.

ژنەکە حەیرەتزەدە ئەبێ!

قوچێ: بسم اللە الرحمن الرحیم (پارەکە وەرئەگرێ) خوایە بە ئومیدی خۆت، (ڕوو لە ژنەکە) تۆ ئەمەت ئەزانی؟

ژن: نەوەڵڵا!

قوچێ: تف لە شەرەفت پیاو! ئاخر پیاوێ پیاو بێ شت لە ژنی خۆی ئەشارێتەوە؟

پیاو: ئەوە هی خۆمە

قوچێ: وس لەعین! بەین ژن و شوو هی خۆمە و هی خۆیە هەیە؟!
(ڕوو لە ژن) ئا تۆ چۆن شووت کردووە بەم خوێڕییە؟

ژن: ئەوە چۆن ئەو پارەتە لە من شاردووەتەوە پیاو باش؟

پیاو: ها ها باوا نۆبەی تۆمە!

قوچێ: وەک بنیادەم جواوی بەرەو خوێڕی!

پیاو: هەر لەمێژە وتوویانە پیاو نابێ هەموو شتێکی بە ژن بڵێ، بەتایبەت هەرگیز ژن لە ڕازی گیرفان و کیسەی مێردەکەی خۆی ئاگادار بێ.

ژن: بۆ؟

پیاو: بۆ ئەوەی ئەگەر ژن بزانێ پیاوەکەی پووڵ و پارەی زۆرە، بەهانەی شت کڕینی لێ ئەگرێ و ئەگەر بزانێ شووەکەی نەدار و هەژارە، خەفەتی پێ ئەخوا، بۆیە ئەبێ نیهانی بێ!

مامە ئەوان لەنێو حاڵی خۆیاندا وێڵ ئەکا و ئەچێ لە گۆشەیەکەوە دادەنیشێ و بە خەیاڵی ڕاحەتەوە ئەکەوێتە ژماردنی سکەکان و هی هەردوو کیسەکە ئەژمێرێ.

ژن: ئەوە لە منت شاردبووەوە؟

پیاو: هەی هەی برا! نە نەمشاردبووەوە هەڵمگرتبوو!

ژن: لەوێ؟ جێگەت لێ بڕابوو!

پیاو: فەرقی چییە لە هەر کوێ بێ؟

ژن: چۆن فەرقی چییە؟ تۆ سوێندت بۆ من خوارد لە هەموو شتێکی ژیاندا پێکەوە شەریک و هاوڕێ بین! ئاوا؟

مامە قوچێ خەریکی ژماردنە.

مامە: ئەڵێ ئەمە سی و یەک، ئەمە سی و دوو، ئەمە سێ و سێ و سی و چوار و. پێنج و...

ژن: تۆ خۆ ئەتوت هیچت نییە بۆ کڕین شت، تەنانەت بۆ خواردەمەنی پارەت لە من ئەسەند!

پیاو: گیانی خۆت دەست هەڵگرە دوایی هەموو شتێکت بۆ ئەڵێم.

قۆچێ: هم هم هم! (سەرێکی لێ ئەلەقێنێ)

ژن: ئەوەتە خوا درۆزن خەجاڵەتبار و ڕووڕەش ئەکا و ڕسوای دونیا و قیامەتی ئەکا! ئاخر و عاقبەتی درۆکردن لەگەڵ ژن و منداڵ لەمە باشتر نابێ!

قوچێ تعدادێک سکە لە کیسەی کابرا هەڵئەگرێ و ئەیخا ناو کیسەی ژنەکە و هەڵدەستێ و تماشایەکی مەعنیداری پیاوەکە ئەکا.

قوچێ: تماشا، تماشا، بەڕاستە ئەڵێن خەتاکار ڕووی ڕەش دەبێ! توو خوا ئەوە تۆ لە من هیچ، لەو ژنەش هەر هیچ، لە خۆت خەجاڵەت ناکێشی؟ داناڕزێی؟ (ڕوو لە ژنەکە) هەشتا سکەی بۆ خۆی هەڵگرتووە، چل سکەی بە تۆ دابوو!

ژن: (ڕوو لە کابرا) خۆ کاتێ لێتم پرسی وتت هیچ شک نابەم تەنانەت پناوایی؟!

قوچێ: قەیدی نییە ڕۆڵە قەیدی نییە، خۆ مامە قوچێت نەمردووە، ها ڕۆڵە ئەوە بیست سکە پارەکەی ئەوم هەڵگرت و نامە بان پارەکەی تۆوە، ئەوە شەست سکە تەواوە.

ژن: دەستت خۆش بێ مامە گیان.

مامە: بەڵام یەک پناوانی بەو خوێڕییە ڕەوا نەبینی!

ژن: سەرچاو مامە گیان (کیسەکە وەرئەگرێ لای ئەبا)

کابرا ملی بۆ لارەوە ئەکا بەڵکوو کیسەکەی ئەویش بداتەوە.

قوچێ: ها؟ چییە؟ تەماشام ئەکەی! یەک پناوا لە دەست منیش نابینی چونکوو خائینی! چونکوو ئەزانم تۆ بە شوو نابی بۆ ئەو کچەم، ئەگەر بووی بە شوو بۆی ژیانتان پێکەوە دەوامی هێنا. بۆی بووی بە پیاوێکی چاک، ئەوسا من ئەم کیسەتە پێ ئەدەمەوە، ئێستا بەلای منەوە ئەمانەتە.

پیاو: لەڕێی خوا مامە گیان، من ئیدی شایەد تا ئاخری عومرم بەم ڕێگەدا نەهاتمەوە، کەی پێمی ئەدەیەوە؟

قوچێ: نازانم، هەر کاتێ تماشام کرد و بینیم بووگیتە پیاو و لەگەڵ ئەو کچەم دەوامت هێناوە، سا ئێستا سا دە ساڵی تر بێ. بیست ساڵ تر بێ، سی ساڵ تر بێ نازانم، بەڵام ئەم کیسە ئەمانەتی تۆیە بەلای منەوە و من پێتی ئەدەمەوە حەتا ئەگەر بکەفینە ڕۆژی قیامەت!

پیاو: بەخوا وابزانم هەر وای لێ ئەکەی مامە گیان.

قوچێ: با فێر بی بۆ جارێکی دیکە شت لە حەڵاڵ و هاوسەری خۆت نەشاریتەوە! جا ئێستا بڕۆ گۆڕت گوم کە لەبەرچاو. بەڵام، (ڕوو لە ژن) ڕۆڵە کچم تۆ شاهد بووی من لێرە ئەم پارەمە بە ئەمانەت لێ سەندووە، نەچێ شکایەتم باتە دەس حکوومەت و بڵێ مامە قوچێ چەتەیە و ناو ڕێی لێ گرتوومە و ڕووتمانی کردووەتەوە، من پیاوی خودام و پیاوی خودا بە دز نابێ، ئەگەر مامە قوچێ دز بایە پارەکەی تۆشی لێ ئەستاند، بەڵام بە چاوی خۆت شاهید بووی بیست سکەم نایە بان پارەکەتەوە و پێشتم دا وا نییە؟

ژن: وەڵڵا وایە مامە گیان دەستت نەیشێ.

قوچیّ: مامە قوچیّ چۆن پیاوێکە؟

ژن: مامـە قوچـیّ خاسـە خوایـە! مامـە قوچـیّ دز نییـە، مامـە قوچـیّ چڵـە کێـش و ڕیـازەت کێشـە، هەمـوو ڕۆژێـک یـەک دانـە خورمـا ئەخـوا و لەبـەر چـاو دوژمـن و خێڵـی حکوومـەت مەحـو ئەبێتـەوە! چونکـوو خۆشەویسـتی خودایـە!

لەنـا کـەری کابـرای هـەژار کـە حاڵـی هانەوەدایـە و ئەیـکا بـە سـەرە سـەرِ و مامـە ڕائەچەڵەکـیّ!

کەرسوار: ماندوو نەبی برای دینی.

قوچیّ: گۆڕت گوم کە لاچۆ!

کابـرا تەقـە تـەق ئـەدا بەلایانـا و هـەروا کـە کەرەکـەی ئەسـەڕێنیّ دوور ئەبێتەوە!

کەرسوار: ئەمڕۆیش هەر هیچ برای دینی؟ چاییەکمان پیّ نادەی؟

قوچـیّ: (بـیّ ئیعتنـا بـە کەرسـوار ڕوو لـە پیـاو ئـەکا) تـۆ ئیدی ماتڵـی چیـت؟ گوللـەی وێـڵ؟ نـووک چەکەکـەی نزیـک سـەر پیاوەکـە ئەکاتـەوە.

پیـاو: هیـچ، مـن ماتڵـی هیـچ نیـم (لەغـاو قاترەکـەی ئەگریّ و ئەکەوێتە ڕیّ)

قوچیّ: ڕاوەستە.

کابرا: ها چی چی؟

قوچـیّ: ئـەوە لەبـەر چـاو ژنەکەتـەوە پێـت بڵێـم، تەلاقـم چـل مـەزەوە کەوتبـیّ بـڕۆی بـەلای خەڵکـەوە بڵێـی مامـە قوچـیّ دزیـی لێـم کـردووە، یـان شـکایەت بکـەی، بڕۆیتـە ژێـر بـەرد پەیـدات ئەکـەم و گوللەیەکـت

پێوە ئەنێم.

ژن: نە مامە گیان غەڵەت ئەکا شتی وا ئەڵێ!

قوچێ: ئەبێ خۆی بڵێ!

پیاو: نە مامە گیان، من ئەو پارەمە بە ئەمانەت داوەتە دەستی تۆ.

قوچێ: (ڕوو لە ژن) ئەوەتە بووەتە پیاو، خەریکە ببێ بە پیاو! خواتان لەگەڵ.

ژن: ببوورە مامە گیان تۆ ژنت هەیە؟

قوچێ: نە رۆڵە، لەم بەڕ و بیاوانەدا ژنی چی؟ بەڵام لەو دونیا چل حۆری و مەلایەکەیان بۆ داناوە، مەبستم لە تەڵاق ئەوەیە! وە دیسان ئەڵێمەوە چل تەڵاقەم کەوتبێ وێرانت دەکەم! دە بڕۆ گۆڕت گوم کە لەبەرچاو درۆزنەی خوێڕییە! هادەی!

کابرا لەغاو قاترەکەی ئەکاتە کێش بە شوێن خۆیا.

قوچێ: بەسلامەت کچم هۆش خۆتت بێ.

ژن: سەرچاوم مامە گیان دۆعای خەیرمان بۆ بکەی.

قوچێ: بۆ تۆ سەرچاوم بەڵام بۆ ئەو خوێڕییە ناشێ.

ژن و شوو دوور ئەکەونەوە.

قوچێ: (سەر بەرەو ئاسمان بەرز ئەکاتەوە) خوایە خۆت ئەڕحەم و ڕاحمینی، خوایە خۆت زامنی ڕزق و ڕۆزیت، خوایە هەزار جار شکورت کە ئەمڕۆیشم ڕابوارد و ئالوودەی گوناح نەکرام.

دەستی ئەکوتێ بەسەر کیسە پارەکەدا و لە کێوەکەوە ئەچێتە بان.

پیاو: (بەدەم ڕێوە توورە و عاجز) بۆگەنکەی کەچەڵەی مەغز

گەنیوە! خوا سەری لێ شێواوە چل پەری و مەلایکە مارە کا بۆ تۆی گەنیو! باسی ئەوە ناکەم چل مار و ئەفعا و ئەژدیهای بۆت دانابێ، بەڵام، بە خەونیش نابینی کە حۆری و پەری تەنانەت گووی خۆیانیش بەو سمێڵانەت ساون! ئەرێ ئەوە تۆ چیت لێ قۆماوە ژنەکە؟ بەڕاستت بوو کە ئەو دۆعای خەیرت بۆ بکا؟

ژن: چیم بکردایە پیاوەکە؟ لە هەیبەتا کە پارەکەی منیش نەبا گرتبوومە زوبان! چیم بکردایە؟ دوو کەلام بەرز و نزم پارەکەی منیشی ئەبرد، بەڵام سەرم سووڕ ماوە چۆن زانی تۆ پارەکەت لە کوێ قایم کردووە؟!

پیاو: چوزانم، نەینێیتە موعجزاتی خاس خوا بوون! خوا قەد خاسی وای نەبووە و نابێ! ڕەوشی بۆ ڕووتەوکردن هەر ئەوەیە، ئەی خۆت بە چاوی خۆت دیت کە نە قیبلەی ئەزانی لە کوێیە و نە ناوی قیبلەی ئەزانی! بە قیبلەی ئەگوت قلە، نەگبەت!

ژن: خۆزگا هەر بەولا بڕوایەین.

پیاو: تازە ئیدی کار لە خۆزگە و ئاوات دەرچووە، بەڵام ئێستا بەڵایەکی بەسەردا بێنم کە تا ماوە لە بیری نەچێتەوە!

ژن: هەر ئێستا؟!

پیاو: ئەرێ هەر ئێستا لەبەر چاو تۆوە!

ژن: چیت لە مێشکدایە پیاوەکە، ئەتەوێ چی بکەی؟

پیاو: بڕۆینە سەر ئەو پێچە پێت ئەڵێم.

ژن ئەکەوێتە ناو فیکرەوە.

پیاو ڕێگە ڕۆیین توند ئەکاتەوە.

قوچێ ئەچێتە بان و لەسەر بەردێک دادەنیشێ.

ژنەکە زۆر نیگەران ئەبێ.

ئەگەنە سەر پێچ.

کابرا: هۆۆۆۆۆش (ئەوێستن)

ژن: ئەتەوێ چی بکەی؟

کابرا: پێم خۆش نییە وا تێ فکری کە مێردێکی ترسنۆک و بێغیرەتت هەیە! ڕاوەستە ئەیبینی باوکی ئەهێنمە بەر چاوی!

کابرا دەرئەچێتە سەر بەرزاییەک.

ژنەکە زۆر بە ترس و خۆفەوە تماشا ئەکا.

پیاوەکە دەست ئەنێ بە لای دەمیەوە و بانگی بەرز ئەکاتەوە.

کابرا: هۆ هۆ هۆ مام قوچێ؟

ژنەکە لا ئەکاتەو قوچێ بەقەد قالاوێ بەسەر بەردێکەوە دیارە.

ژن: دەنگت بەوێ ناگا زۆر دوورە!

پیاو: هۆ هۆ هۆ قوچێ کەچەڵ هۆ؟

ژنەکە بەسەیرەوە تەماشای پیاوەکە ئەکا.

قوچێ لا ئەکاتەوە بەلام نابیسێ و چاو ورد ئەکاتەوە و کابرا لەسەر بەردێ ئەبینێ و دەستێکی بۆ بەرز ئەکاتەوە.

پیاو: ئەوەتە ئەبیسێ چۆن نابیسێ! جا ئێستا تماشا کە.

ژن بەدیقەتەوە تەماشای ئەکا!

کابرا دەسماڵێ لەبن شاڵەکەی دەردێنێ و ئامادەی هەڵپەڕین ئەبێ.

پیاو: هۆ هۆ هۆ قوچێ کەچەڵ تماشام کە.

قوچیٚ بەبێدەنگیٚ حەرەکاتی کابرا ئەبینیٚ و بەتەعەجوبەوە تماشای ئەکا.

پیاو: (بە گۆرانی و هەڵپەڕکیٚ)

کەچەڵ کەچەڵ کەلچە

رۆغەنەکە لە پاچە!

کەچەڵ کەچەڵ کەلچە،

رۆغەنەکە لە پاچە!

ژنەکە بەتەنزەوە تماشایەکی کابرا ئەکا.

ژن: هم هم هم هم! وتم داخوا گەرەکیە چی بکا؟! هەی هەی حەقی بۆم سەندەوە!

کابرا هەر هەڵدەپەڕیٚ و تیکرار دەکاتەوە.

ژن: لاوە بەسیە، خۆت لەوە زیاتر ماندوو مەکە، وەرە خواریٚ با برۆین وەرە!

قوچیٚ: درۆ نەکەم خۆرەکە لەسەری داوە تێکەڵ بووە! ئەوە بۆ وا دەکا؟!

قوچیٚ هەڵئەسیٚ..

کابرا هەوڵ ئەبیٚ و دێتە خوارەوە...

ژن: ماندوو نەبی!

پیاو: بیستی بیستی! (لەغاو قاترەکەی ئەگریٚ و بە دەرچوون ئەڕوا)

ژن: هم هم!

پیاو: ئۆخەی فێنکایی دڵم هات!

ژن: بەخوا برا باشت لێ کردا حەا تاکوو ئێستا حەق سەندنەوەی وام نەدیبوو و نایبینم! بەخوا برا بەغیرەتی حە!

هەر بەو دەرچوونەوە لە پێچەکەوە دەردەچن و لەبەر چاو ون ئەبن.

قوچێ: (دوای نەختێ خۆکێشانەوە و باویشکدانی درێژ) ئەمڕۆ حیسابی ماندوو بووم چاکە بڕۆم چورتێ لەژێر بەردەکەم با بدەم، خوایا بە نۆکەرت بم.

ئەکەوێتە ڕێ بۆ ناو شاخ و داخان.

## (ڕۆژ دەم ئێوارە)

کابرای شرکەپۆسی کەرسوار هەر لەبان کەرەکەیوە لەبەر دەرگای پاسگای ئەمنی ڕاوەستاوە و لەگەڵ نایب خەریک قسەکردنە.

دوای نەختێ قسە و باس، نایب تماشایەکی ئەمسەر و ئەوسەری جێگاکە دەکا و شتێ لەنیو دەستماڵێکی سوورا ئەدا بە دەست کابرای کەرسوارەوە.

کابرا شتەکە زوو ئەخاتە ژێر کەوا شڕەکەی و لە کەر دەخوڕێ و دوور دەکەوێتەوە.

ئەمنی دووەم دێت بۆ لای نایب.

ئەمنی دووەم: مەعامله تەواو بوو؟

نایب: چیم بکردایە، فەرماندە زۆرێکی خراپی بۆ هێناوم، ناچار بووم.

ئەمنی دووەم: بڵێی بتوانێ؟

نایب: هیچ کارێک بۆ ئەم جۆرە کەسانە سەخت نییە، چونکوو بە سەختی ژیاون و عادەتیان پێ کردووە، هەرچی هەژارتر و دەرماندەتر، سەخت کۆشتر و تواناترە!

ئەمنی دووەم: وایە!

نایب: بڕۆین، بەڵام خۆشمان ئامادەباشین.

ئەمنی دووەم: ئامادەباشی چی؟

نایب: ئامادەباشی سووری، لە بەیانییەوە ڕۆژێک چوار پێنج ساعەت خۆمانی بۆ گوم دەکەین و پارەی مەعمورییەتەکەیشی بۆ وەرئەگرین، چۆنە؟!

ئەمنی دووەم: دەستت خۆش بێت نایب گیان!

## (دیمەنی شەوی پاسگا)

ڕۆژ ناو ڕێگا.

کابرایەک بە سوار کەر کوڕ و کچێکی چکۆلەی لە پشتی خۆیەوە داناوە و لەنێو ڕێگای شاردایە.

پیاوەکە سەیدە و شاڵێ سەوی لە کەمەردایە و کچەکەی لەچکی سەوزی لەسەردایە.

قوچێ لەپشت بەردێکەوە دەردێ و زۆر بەموحیبەتەوە ئەچێ بەرەو پیریان.

قوچێ: با با با ماندوو نەبی مامە سەید ئۆغرت خەیر.

سەید: دیارت بەخەیر مامە گیان.

قوچێ: چۆنی سەیزادە چکۆلە؟ باشی (ماچی سەری ئەکاتەوە)

ئەمەش ئەبێ کوڕی خۆت بێ؟

سەید: بەڵێ وەڵڵا.

قوچێ: ئەی بەخەیر بێن ئەی بەخەیر بێن، ناشێ ناشتات دابێ بە منداڵەکانت؟

سەید: دامانناوبوو بۆ بەین ڕێگا.

قوچێ: کارێکی زۆر باشت کردووە، ئەمەش بەین ڕێگا، من چاییم لەو سەرە دەم کردووە، چیت هێناوە بیهێنە و منداڵەکان بێرە بان تاکوو پێکەوە چاشتایەک بخۆین.

سەید: ئەگەر ئیزنمان بدەی بڕۆین چاکترە مامە گیان، ئیشمان زۆرە و ئەبێ ئەگەر بکرێ بۆ شەو بێینەوە!

قوچێ: بۆ کوێ ئەچن؟

سەید: وەڵا ئەگەر بکرێ بۆ شار.

قوچێ: نە دەی خۆفت نەبێ ئەکرێ.

منداڵەکان ئەهێنێتە خوارەوە.

قوچێ: خۆشت وەرە خوارەوە سفرە و تووشەکەت بێنە، من چۆن ئەهێڵم لەگەڵ ئەو منداڵانە بە سک برسی ڕێ بکەوی بەرەو شارا من سەر و ماڵم هی ئەولادی پەیامبەرە (منداڵەکان دەست ئەگرێ و ئەیانبا بەرەو بان) کەرەکەت لە گۆشەیەک داوەسە و وەرە بان.

سەید سەری ئەلەقێنێ و لە کەرەکە دێتە خواوە و سفرە و تووشەکەی دادەگرێ.

سەید: (لەژێر لچەوە) خوا بە خەیری بگەڕێنی!

کەرەکە ئەوەسێ بە بنە گیایەکەوە و ئەکەوێتە ڕێ بەرەو بان.

مامه سەید سفرەکەی باز ئەکا.

چەند دانە نان و کولێرە و هێلکەی کولاوی تێدایە.

قوچێ: هێلکە بۆ منداڵ باش نییە، ڕاوەستە تا چای شیرین بۆیان ساز کەم.

چەند کڵۆ قەند ئەخاتە ناو دوو قرووشکە و چای ئەکا بە ملیا و ئەیدا بە منداڵەکان.

سەید: بسمیلا.

قوچێ: تۆ فەرموو دەی منیش ئەخۆم.

کابرا مەشغوڵ ئەبێ.

منداڵەکان خەریک خواردنی نان و چای شیرین ئەبن.

قوچێ قۆڵی بۆ هەڵئەکا و دوو دەستی ئەنیشێتە گیان هێلکە و نانەوە تا سەید یەک تیکە ئەخوا ئەو چوار تیکە لەکار ئەخا و تەنانەت ڕێزەی نێو سفرەکە ناهێڵێ.

سەید و منداڵەکانی تماشای یەکتری ئەکەن.

قوچێ دوایی بە خواردن دێنێ و بە قورقێنەیەکی زلەوە (خواشکوری)ی زلی بۆ ئەکا.

قوچێ: کەس ناتوانێ ڕۆزی کەس بخوا، گەورەیی خوا هەر لەوەدا بزانە.

سەید: بەڵێ وایە!

قوچێ: تۆ دوێ شەو نەتزانی ئەو نانەی ئەیکەی بە تووشە ڕزق و ڕۆزی کێی پێوەیە؟

سەید: نەوەڵا!

قوچێ: جا عەزەمەتی خوا ئەبێ هەر لەوا ببینی!

سەید: وایە.

قوچێ: دەی مامە سەید گیان بۆ کوێ ئەچی؟

سەید: عەرزم کردی، بۆ شار ئەچین و ئەبێ بۆ شەو بێینەوە.

قوچێ: بۆچی لە شاردا خزم و کەسوکارتان نییە بۆ شەو بچنە ماڵی؟

سەید: بەرێ وەڵڵا هەمانە، بەڵام زەحمەت بە کەس نادەین و دێینەوە.

قوچێ: دایکی منداڵەکانت بۆ لەگەڵ نییە؟

سەید: وەڵڵا مامە گیان دایکیان نییە، فەوتی کردووە.

قوچێ: ئەی داد و بێداد، ئەی داد و بێداد، بەوەڵڵا قرچە لە دڵمەوە هات! بەڵام قەیدی نییە خوداوەند خۆی بۆ منداڵی بێ باوک و دایک، هەم باوکە و هەم دایک!

سەید: وایە.

قوچێ: بەتایبەت ئەگەر ئەو منداڵانە ئەولادی پێغەمبەر بن! ئەوە ئیدی نووری عەلا نوورە!

سەید: وایە.، جا ئەگەر ئیزنی ڕۆیشتن بدەی زۆر مەمنوون دەبین، با نەکەوینە دێرەوە.

قوچێ: نەتوت شار بۆ ئەچی؟

سەید: وەڵا هیچمان لە ماڵدا نەماوە، ئەڕۆین هەم نەختێ کەلوپەل بۆ منداڵەکان بکرم لەم ڕەشی و ڕووتیە دەربێن و هەم نەختێ قەند و چایی و ئیحتیاجاتی دیکە.

قوچێ: زۆر چاکە، بۆت نەکرا منداڵەکانت نەبەی تا ماندوو نەبن؟

سەید: نەوەڵـڵا کەسمان نییـە مامـە گیـان، بـۆ هـەر کـوێ بـڕۆم هـەر سێ پێکەوەیـن و ناچـارم لەگـەڵ خـۆم بیانبـەم.

قوچـێ: بەخـوا سـەختە، بەوەڵـڵا زۆر سـەختە! بـەڵام هیـچ کارێ ناکـرێ خـوا تۆیـان بـۆ خـۆش کا.

سەید: خوا تۆش خۆش کا ئیشاڵڵا.

قوچـێ: پـارە و مـارە چـی؟ ئەوەنـدەت هەیـە بەشـی کڕینـی ئـەو هەمـوو شـتانە بکا؟

سەید: زۆرم نییە مامە گیان، بەڵام باشە.

قوچـێ: ئاخـر نەکـوو نەتبـێ کاکـە گیـان، ئەگـەر نەتبـێ مـن هەمـە و ناهێڵـم بـە دەسـت خاڵـی بـەڕێ کـەون، چەنـدت پـارە پێیـە؟

سەید: کەم تا زیاد هەمە مامە گیان ڕازی بە زەحمەت تۆ نیم.

قوچێ: کامە بزانم، نیشانم بدە.

سەید: نیاومەتە جێگایەک بۆ دەرهاوردنی سەختە مامە گیان.

قوچێ نووک تفەنگەکەی لە سەر کچەکەوە نزیک ئەکاتەوە.

قوچێ: وتم بیدە بزانم خۆ بۆتی ناخۆم.

سەید: باشە کاکە باشە سەرچاو.

بـە دڵـی نـاڕازی ئاسـتەری کەواکـەی دادەڕێ و کیسـە چکوولەیـەک لەنێو کەواکەیـەوە دەردێنـێ.

قوچێ: ئەوە بۆ وات لێ کردووە؟

سەید: لە حەیبەت دز و درۆزنا! چیم پێ لێ بکردایە؟

قوچـێ: دز و درۆزن؟ دز و درۆزن هـا کـوێ کاکـە؟ شــوکر بـۆ خـوا ئـەم ڕێگاوبانـە لـە هەمـوو ڕێگاوبانێکـی تـر ئەمنتـرە و گـورگ و مێش بـە خۆشـی و سـوڵح و سـەفا پێکـەوە ئەژیـن، دز و درۆزن لـە کوێیـە؟

سـەید: بەڵـێ وایـە (کیسـەکەی پـێ ئـەدا) ئەوەتـە نەتیجـەی یـەک ساڵ ڕەنـج و زەحمەتـی مـن و تـەواو دارایـی ئـەو دوو هەتیـوە!

قوچێ: باشە باشە، کەم نییە، جا پێم بڵێ بزانم چی ئەکڕی؟

سـەید: کـەوش و کـراس و کەوایـەک بـۆ ئـەو کچـە و کـەوش و پاتـۆڵ و کەوایـەک بـۆ کوڕەکـە و نەختـێ کەلوپەلـی دیکـە.

قوچێ: ناشێ تازەیان بۆ بکڕی.

سەید: بۆ؟ وەڵڵا تازەیان بۆ ئەکڕم.

قوچـێ: جـا منداڵـی دێهـات شـەو و ڕۆژ لەنێـو خـاک و خۆڵـدا ئەتلێنـەوە تـازەی بـۆ چییـە؟ هـا (دوو سـکە لـە کیسـەکە دەردێنـێ پێـی ئـەدا) ئـەوە بێعەقڵییـە، کەلوپەلـی نەمیداشـت هەیـە زۆر جوانتـرە لـە تـازە، ئەوە بەشـی کڕینـی کەلوپـەل ئیـدی؟

سەید: قەندم ئەوێ، چاییم ئەوێ، برنج و نۆک و نەخۆشەرم ئەوێ.

قوچـێ: جـا ئەمـە سـێ سـکەش بـۆ ئـەو شـتانە، بەسـتانە بـۆ سـێ نەفـەر هەمـوو شـتێک دەکا ئیـدی!

سەید: خۆشم کەوش و کراسم نییە.

قوچـێ: ئەمـەش یـەک سـکە بـۆ کـەوش و کـراس و نەمیداشـتی، خـۆت ئیـدی؟

سەید: شتی زۆرم دەوێ مامە گیان جا ئێستا ناکەوێتە بیرم.

قوچێ: هانێ ئەمەش یەک سکە بۆ ئەو شتانە ئیدی چیت ئەوێ؟

سەید: ئەی باقییەکەی؟

قوچێ: پێنج سکەی ماوە!

سەید: دەی باشە مامە گیان ئەی ئەو پێنج سکە چی لێ دێت؟

قوچێ: هیچ بەلای مامە قوچێوە ئەمانەتە تا کاتی خۆی! سوێندت بۆ ئەخۆم لە قیامەتیشا بووبێ پێتی ئەدەمەوە!

سەید: ئەو منداڵانەم هەتیو و بێ دایکن مامە گیان، خۆشم سەیدی ئەولادی پێغەمبەرم!

قوچێ: منداڵی بێ دایک هەتیو نییە، هەتیوی لە باوکەوە دێ، لەوەبەدوا تۆ سەیدی ئەولادی پێغەمبەری، منیش بەندە و عابد و خزمەتگوزاری خودا، منیش لەم کەژوکێوا ڕیازەت ئەکێشم و دۆعای خەیر بۆ پادشای ئیسلام دەکەم و بەنیازم، خۆ دز نیم، دز بایەم هەموو پارەم وەرئەگرت، بەڵام ئەبینی بە ڕەحم و بەزل و بەخششەوە زیاتر لە نیوەیم پێت داوە، وا نەبوو؟ من ئەم پێنج سکەمە بە ئەمانەت و بە قەرز لە تۆ وەرگرتووە و پێتی ئەدەمەوە!

زلە ئەکەوێتە چاوی کابرا.

نەختێ تماشای ناو چاو قوچێ ئەکا و هەلدەستێ، دەستی منداڵەکانی ئەگرێ و بەر لە چوون ئەڵێ:

سەید: دانەوەی ئەم جۆرە قەرزانە زۆر سەختە مامە قوچێ! زۆر.

قوچێ: سەخت بێ و سەخت نەبێ من هەر ئەیدەمەوە بەو شەرتەی بەلای خەڵکەوە نەڵێی مامە قوچێ دزە و مامە قوچێ لێمی بەزۆر سەند، چونکوو خەڵکەکە ئەزانن مامە قوچێ خاس خوایە و زوڵم لە کەس ناکا، سەرچاوەکانم هاتن، بان گیان، هۆشی منداڵەکانت بێ.

سەید بەبێ جوابدانەوە دەست منداڵەکان ئەگرێ و ڕێ ئەکەوێ.

قوچێ: خوایە هەزار جار شوکرت بۆ ئەمرۆ ئەوەندەی ترم پێ بگەینی بەسمە.

سەید منداڵەکانی ناوەتە کۆڵ کەرەکەوە و خۆی لە دوای کەرەکەوە کەوتووەتە ڕێگا و دوور ئەکەوێتەوە.

چەند سڵە کەرخۆرە بە ئاسماندا ئەگەڕین.

کابرای شڕکەپۆشی کەرسوار بەرەو لای شاخ و داخەکە دێت و بۆ خۆی گۆرانی ئەڵێ.

کابرا: هاتم هاتم بە دەربەسی هاتم.

نەزانی وا مل بە پەتی بە سەربەسی هاتم.

قوچێ خەریکی نان دروستکردنە. تماشای کابرا ئەکا لە ڕێگا لای داوە و بەرەو ئەوێ دێ. تفەنگەکەی هەڵ دەگرێ.

کابرا: مەرحەبا برای دینی؟

قوچێ: ئەمڕۆ بۆ لە جادە لاتداوە برای دینی؟!

کابرا: ئەگەر کارێکی خراپم کردووە بفەرموو با بچمەوە سەر ڕێگا و شوێنی خۆم.

قوچێ: ئاخری بۆ من ڕوون نەبووەتەوە تۆ بەم کەرە پشت ڕووتەوە و ئەم داسە چکۆلەوە چی ئەکەی لەم کەژوکێوانەدا چی بەدەس دێنی؟

کابرا: وەڵڵا بە وەختە مامە گیان، جاروبار کەتیرەی گەون و جاروبار چلۆچێوی کوێستان، جاروبار هەر لەنێو ڕێگا بۆم ئەفرۆشرێ، جاروبار ئەیانبەم بۆ شار، بەشی نانەکە دەردێنێ لەخودا بەزیادی کا. (چاو

بەسەر ئەرزدا ئەگەڕێنێ)

قوچێ: شوێنی چی دەگەڕێی؟

کابرا: هیچ برای دینی، شوکر بۆ خوا ئەم بانە چڵوچێو و دڕک و گەونی زۆرە! وا نییە؟

قوچێ: وایە بەڵام ساحیبی هەیە ئەبن بە ئاوری من.

کابرا: بەڵێ وەڵڵا وایە.

قوچێ: دەی ئیدی خۆت بخەوە سەر ڕێگاکە و بڕۆ بە شوێن ئیش و کاری خۆتا، هادەی!

کابرا: سەرچاو مامە گیان، ئەڵبەت نانم خواردووە، بەڵام دڵم گڕەی دێ بۆ یەک دانە چایی مامە!

قوچێ: باجم لێ وەرئەگری؟!

کابرا: ئەی چۆن خەڵک ئەڵێن مامە قوچێ خاس خودا و ئەهلی خەیر و خەیراتە!

قوچێ: یانی نیم؟!

کابرا: ئەگەر هەی بۆ یەک دانە چایی لە من دریغ ئەکەی؟

قوچێ: ئەگەر بە یەک دانە چایی خەیر و خەیراتی منت بۆ ڕوون ئەبێتەوە باشە سەرچاو، ڕاوەستە ئەم هەویرەم بخەمە سەر ئەو بەردانە، قوریشکەکەت بۆ پڕ دەکەم، بەڵام بە یەک شەرت؟

کابرا: چە شەرتێ؟

قوچێ: بەو شەرتەی ئیدی تیکرارەو نەبێ، ئەڵبەت قەندیش تەنیا بەشی خۆمم هەیە و ئەبێ چاییەکەت بەبێ قەند بخۆی.

کابرا: باشە برای دینی هەرچی تۆ بڵێی.

قوچێ پشت لە کابرا ئەکا و هەویرەکە ئەخاتە سەر بەردەکان و ڕێخ ئەچنێ بانی بپۆشێت.

کابرا بەئەسپایی دەسماڵە سوورەکە لەنێو سینگی دەردێنێ.

دەمانچەیەک لە توێی دەسماڵەکە دەرئەهێنێ و لە پشتەوە ئەینێ بە دڵ قوچێییەوە.

قوچێ ناباوەڕانە لا ئەکاتەوە بۆ لای کابرا و خوێن بەلای دەمیەوە دێتە خوارێ.

دەست بۆ تفەنگەکەی ئەبا بەڵام ناتوانێ.

قوچێ: ئەی خوا خراوی حاڵت بۆ بکا برای دینی!

ئەکەوێ و ئەمرێ.

داڵەکان بە ئاسمانەوە ئەخولێنەوە.

## (بەردەرگای پاسگا ... ڕۆژ)

نایب و دوو ئەمنی دیکە لەسەر مەیتەکەی قوچێ ڕاوەستاون و هەر کام یەک تفەنگیان بەدەستەوە.

کابرای وێنەگر سەر بە کیسەی دووربینەکەی (کامێراکەی)دا ئەکا و ئەڵێ: ئامادە؟

نایب پێ ئەنێتە سەر سینگی قوچێ و زۆر پیرۆزمەندانە ئەوەستێ.

کابرای شڕکەپۆش وەستاوە و تماشا ئەکا.

وێنەگر وێنەیان ئەگرێ.

نایب دێ بۆ لای کابرای شڕکەپۆش.

شـرکەپۆش: فەرمـوو قوربـان (دەسـماڵە سـوورەکەی بـە کوڵتەکـەوە پــێ ئەداتــەوە)

نایـب: (دەم لەبـان گوێـی کابـرا) بـڕۆ مـن خـۆم ئێـوارە دێـم بـۆ لات پێـت ئەڵێـم چـی بکـەی.

شرکەپۆش: بەڵـێ بەسەرچاو.

دەستی فەرماندە دێت و میدالێک ئەلکێنێ بە سینگی نایبەوە.

## (کوێستان)

کابـرای شـرکەپۆش جلوبەرگـی گـۆڕاوە. تفەنگەکـەی قوچێـی گرتووەتـە دەسـتەوە، دووربینەکـەی قوچـێ ناوەتـە سـەر چـاوی و لەنێـو شـاخ و بـەردەکان ماتڵـی ڕێبـوارە و لـە جێـگای قوچـێ بووەتـە چەتـە و گۆرانـی ئەڵـێ: هـات لـە دوور لـە دوور لـە دوور هـات لـە دوور دیـارە ...

* لەسـەر ژیانـی دزی بەناوبانگـی دەوروبـەری سـنەی دەورانـی قاجـار (قوچـێ کەچـەڵ)

(دزە باوانـێ): ئەوەیـە کـە دوای یـەک حەفتـە تـازە بـووک بـۆ سـەردان لەگـەڵ مێردەکـەی ئەچێتـەوە بـۆ مـاڵ (بـاوان)، ماڵـی بـاوک و دایـک و خۆشـک و بـرا و خـزم و کەسـوکار و پێشکەشـی پـێ ئـەدرێ.

بەڕێز کاک بەرهەم عەلی خۆشەویست

ڕێز و سڵاوم هەیە بۆ خۆت و بنەماڵەی بەڕێزت
وە هیوادارم لە سەلامەت و سەعادەتدا بژین.

برای بەڕێزم ٤٢ حەکایەتی کۆنی کوردیم لە هەر
لە مێژەوە کۆ کردووەتەوە، وە هەر بە کوردی
نوسیومە، بۆت دەنێرم. قالبی نوسینەکەی
فیلمنامەیە. جا ئەگەر پێت خۆش بوو خۆت
قالبی دیکەی بۆ بەدی بێنە و چاپیکە بیانبڵاوکەرەوە.
گەنجێکی بەقیمەتە کە تاکو ئێستا باشی لە نێو خەڵکدا
ماوە.

بە هیوای دیدار، عەباسی لەمەندی



